## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: دیموکراسی بۆ هەمووان

نووسەر: دوکتۆر حسەین بەشیریە

وەرگێڕ: حسەین موحەممەدزادە

پێداچوونەوە: ئاسۆ کەریم

نەخشەسازی ناوەوە:: گۆران جەمال رواندزی

بەرگ: هۆگر سدیق

پیتچنین: سنە، ڤیان کۆمپیوتەر 2254663

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: ١٠٥

نرخ: ٢٠٠٠ دینار

چاپخانە: وەزارەتی پەروەردە — هەولێر

زنجیرەی کتێب = ١= (١٠٤)



ناونیشان

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی

هەولێر: پشت رۆژنامەی خەبات

پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@maktoob.com

ژمارەی تەلەفۆن 2260311

# ناوەڕۆک

# بنەما فیکرییەکانی دیـموکراسی

دیـــموکراسی وەك شــێوازێکی ژیــانی سیاســی لــە دنیــای نوێژەنــدا لــە ســەر ژێرخــان و پرەنســـیپگەلێك دامـــەزراوە کـــە لـــە پرۆســـەی درێژخایـــەنی تێکۆشـــان بـــۆ دامـــەزرانی حکوومەتی دیـموکراتیك هاتووەتە ئاراوە.

دەتوانیـــن جەوهـــەری ئـــەم ژێرخـــان و بنەمایـــە لـــە بنـــەمای وەکیـــەکی مرۆڤـــ، پرەنســـیپی تاکگـــەرایی، پرەنســـیپی یاســـا، پرەنســـیپی حاکمیـــەتی خـــەڵك و پێـــداگرتن لـــە ســـەر مافـــی سروشـــتی، مـــەدەنی و سیاســـیی مرۆڤەکانـــدا بدۆزینـــەوە. مەبەســـت لـــە پرەنســـیپی بەرابـــەری ئەوەیە کـە لـە دیـــموکراسیدا، تاکـەکان، تـاقم و چـینی خـەڵکان سـەبارەت بـە یەکتـری لـە سەر ئەوەی کـێ حکوومـەتی بـە دەسـتەوە بـێ، سـەروەری و ئیمتیازێکیـان بـە دەسـتەوە نییـە. مـافـی حکوومەت کـردن بـۆ هەمیشـە بـە هـیچ تـاك و تاقمێـك نەسـپێردراوە و هـیچ تاقمێـك ناتوانێ بە نـاوی بالادەسـتی وسـەروەری هـزری و خودییـەوە بـە سـەر ئـەوانی تـردا حکوومـەت بکــات. رەوا بـــوونی دەســـەلات تـــەنیا لـــە ســـەر رەزای خـــەڵکی بـــۆ پێرەوکـــردن لـــە حکوومـــەت دامەزراوە.

گریـمانەی دیـموکراسی ئەوەیـە کـە خـەڵکی نـە لـە ترسـان و نـە لەبـەر زۆرداری، بـەڵکو لـــە دڵـــەوە و بـــە رەزای خۆیـــان مـــل بـــۆ حکوومـــەت دادەنـــەوێنن و میکانیزمگـــەلێك بـــۆ دەستەبەرکردنی ئەم رازیبوونە لە ئارا دان.

پرەنسیپی تاك بـەم مانایەیـە کـە مرۆڤـــ لـە بنەڕەتـەوە بەگیانلەبـەرێکی ژیـر لـە قەڵـەم دەدرێ، بۆیـــە دەبێـــت لـــە ناســـینی بەرژەوەنـــدی تـــاکی خۆیـــدا، لـــە چوارچـــێوەی سیســـتەمی کۆمەڵـــدا ئـــازاد و خودموختـــار بێـــت. ئـــازادی هـــەم بـــە مانـــا خـــراپ و نگاتیڤەکەیـــدا «واتـــە رزگار بوون لە ئیـرادەی زۆرەملـی ئـەوانی دیکـە» و هـەم بـە مانـا چـاکەکەی «یـانێ توانـایی بژاردن و کارو بەشداریکردن» لە سروشتی دیـموکراسیدا ئاشکرایە.

پرەنســـیپی یاســـا لـــە دیـــموکراسیدا بـــەم واتایەیـــە کـــە تاکـــەکان تـــەنیا لـــەو یاســـایانە پـــەیرەوی دەکـــەن کـــە خۆیـــان چـــێیان کـــردووە و هیچـــی تـــر. بۆیـــە لـــەم رووەوە ئـــازادی و پـــەیڕەو کردنی قانوون لە دیـموکراسیدا لە یەکتـری جیا ناکرێنەوە.

بە هۆی بنەمای حاکمیەتی خەڵکییەوە، تەنیا سەرچاوەی ڕەوابوونی دەسەڵاتی حکوومەت، ئیرادەی خەڵکە کە دەتوانن ڕازیبوون و نەبوونی خۆیان لە کردەوەی حکوومەت دەر ببڕن و لەم بابەتەوە کانالّی تایبەت بۆ دەربڕینی بۆچوونی خەڵکی دامەزراوە. لە دیموکراسیدا هەموو خەڵکی بە جیاواز لە ناسنامەی نەتەوەیی، ئایینی، چینایەتی, یا بۆچوونی سیاسی، لە مافی سروشتی، مەدەنی و سیاسی بە تایبەت مافی ڕادەربڕین، بۆچوونی جیاواز و بیری جیاوازیان هەیە. لەم بەشەدا، هەندێ بنەما فیکری و پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی دیموکراسی شی دەکەینەوە.

## ١-١. لیبرالیزم

ئایدیۆلۆژیای لیبرالیزم بە مانای ئازادیی هاووڵاتیان لە سێبەری حکوومەتی بەسراوە بە یاسا، بە ئەساسی دیموکراسی لە قەڵەم دەدرێ. ئامانجی سەرەکی ئایدیۆلۆژیای لیبرالیزم لە سەرەتای جوقانیەوە، خەبات لەگەڵ دەسەڵاتی ڕەها و زۆرەملێ و سەرەرۆ بووە.

لیبرالیزم سەرەتا بە دژی حکوومەتی ڕەهای کلێسا لە ڕۆژئاوا و دواتر لە هەمبەر حکوومەتی ڕەهای شاهان ڕابوو. لە جیاتی دەسەڵاتی ڕەها, دەسەڵاتی تەسك و بەربەسکراو، لە جیاتی دەسەڵاتی زۆرەملێ و سەرەڕۆیانە، دەسەڵاتی قانوونی ئارمانی سەرەکی لیبرالیزم بووە. لەم ڕووەوە یاساگەرایی، لە یەك جیا کردنەوەی دەسەڵاتەکان، مافی مرۆڤ و حکوومەتی هەڵبژاردەی نوێنەران لە سەر بنەماکانی لیبرالیزم دێنە حساب.

برێك لە نووسەران، لیبرالیزم وەکو تیوری, حکوومەتی سنووردارو ئازادیی تاك، بە سیستەمی بازاڕی ئازاد و ئابووری سەرمایەداریی بازاڕەوە دەبەستنەوە. ئەم پێکەوە بوونە گەرچی لە باری مێژووییەوە ڕاستییێکە، لە باری ژیربێژییەوە زەرووڕەتی نییە. داخوازیی لیبرالیزم, وەدیهێنان و بەڕێوەبردنی مافی وەکیەکییە بۆ هەموو هاووڵاتیان بە بێ جیاوازی ئایین, نەتەوە, ڕەگەز، چین و ڕەگەزو هی دیکە.

هەمووان لە بەرانبەر قانووندا یەکسانن. مافی بنەڕەتی هاوولاتیان لە بۆچوونی لیبرالیزمدا بریتیە لە: ئازادیی هزر و بیرورا، ئازادیی رادەربڕین، ئازادیی کۆبوونەوە، ئازادیی یا مافی ملکایەتی، ئازادیی بەشداریکردن لە ژیانی سیاسی بە دەنگ دان و پۆست وەرگرتن و شتی تریشەوە.

توخمە سەرەکییەکانی ئایدیۆلۆژیای لیبرالیزم دەتوانین بەم جۆرە کورت بکەینەوە:

## ١-١-١. جیا کردنەوەی هێزەکان

حکوومەت تەسك و بەربەست دەکرێ لە رێگای داشکان و جیاکردنەوەی هێزەکان لە یەکتری. مونتسیکۆ «١٦٨٩-١٧٥٥» فەیلەسووفی گەورەی فەرەنسی، یەکەم کەس بوو کە جیاکردنەوەی هێزەکان و یاسای بنەڕەتی حکوومەتی تیۆریزە کرد، بە بۆچوونی مونتسکیو دامەزراوە١ی جیاجیای حکوومەت لە دیموکراسی هەندێ جۆری تری حکوومەت، یانێ دامەزراوەکانی وەك یاسادانان، بەڕێوبەری و دادگەری بە مەبەستی لێك جیا کردنەوەی دەسەلاتی سیاسی و لە بەر چاوەدێری و کونترۆلکردنیان, دامەزراون.

لەم رووەوە راگرتنی هاوسەنگیی لە نێوان هێزەکانی دەولەتدا، نیشاندەری دۆخی دلخوازە. بە رای مۆنتسکیۆ بۆ پاراستنی ئازادی ناتوانین بە بیر و کەسایەتی حوکمڕانان و ئازادیخوازی ئەوان دلخۆش بین، بەلکو تەنیا لە رێگای بەرچاو، یانی دروست کردنی هاوسەنگی لە نێوان بەرژەوەندی و هێزەکاندا، دەتوانین ئەم شتە گرنگە ئەنجام بدەین.

## ١-١-٢. کۆمەلی مەدەنی

حکوومەتی بەمەرج و بەربەستکراو و ئازادیی هاوولاتیان, پێویستی بە کۆمەلگایەکی مەدەنی رەنگاوڕەنگ هەیە کە پڕ بێت لە ئەنجومەن و تاقمی فکری،

١- Instituation

فەلسەفی، ئایینی، فەرهەنگی و سیاسی. هەبوون و دەسەڵاتی کۆمەڵی مەدەنی دەبێتە هۆی دابەشکردنی سەرچاوەکانی دەسەڵات لە نێوان کۆمەڵدا. ئەنجومەنەکانی کۆمەڵگای مەدەنی، بە کایەی بەرەنگاری لە بەرانبەر دەسەڵاتی بێ ئەملا و ئەولا و زۆرەملیی رەها لە قەڵەم دەردرێن. ئامادەیی تاقمەکانی کۆمەڵی مەدەنی لە مەیدانی سیاسەت و دەسەڵاتدا بە هۆی رکەبەری نێوانیانەوە پێشگیری لە حکومەتی یەکدەست و زۆرەمل لە لایەن هەر کام لەم تاقمانە بە دژی ئەوانی تر دەکات. رەنگاورەنگی تاقمەکانی کۆمەڵی مەدەنی بەم جۆرە دەبێتە پێویستێکی حکومەتی بەر تەسك و دەست بەسراوە کە وەك بەردی بناغەی لیبرالیزم دێتە ئەژمار.

## ١-١-٣. چاوەدێریی خەڵك

دڵپیسی سەبارەت بە حکومەت وەك سەرچاوەی خراپەکاری، بناغەیەکی ترە لە بناغەکانی ئایدیۆلۆژیای لیبرالیزم. جۆن لۆك فەیلەسووفی بەریتانی دەیگوت سیاسیکاران لە ناخی خۆیاندا حەیوانێکی دڕندەی کێوین کە لە بەکارهێنانی ملهوڕانەی دەسەڵات بۆ قازانجی تاکەکەسی خۆیان دڵەراوکەیان بۆ نییە. بۆیە دەبێ ئەم سیاسیکارانە لە رێگای دانانی دامەزراو و لەمپەری بەرچاو و چاوەدێریی بەردەوامەوە لە چوارچێوە بخرێن و دەستەمۆ بکرێن. بۆیە سیاسیکاران دەبێت هەمیشە لە ژێر چاوی تیژ و رەخنەی خەڵکدا بن، ئەگینا بۆ لای گەندەڵی و خراپکاری دەئاژوێن. چاوەدێریی خەڵك لەسەر حوکمڕانان و کردەوە و کارە سیاسییەکانیان لە بابەتەکانی بناغەیی «لیبرالیزم»ن.

## ١-١-٤. پێش خستنی ئازادیی تاکەکەس بە سەر عەدالەتی کۆمەڵایەتیدا

بە پێچەوانەی بۆچوونی باو، لیبرالیزم لە دەوڵەتی گچکە و لاواز و ناچالاك دیفاعی نەکردووە، ئارەزووی دەوڵەتی گچکە زیاتر دڵخوازی ئازادیخوازە تۆندڕەوەکان و ئانارشیستە راستڕەوەکان بووە. لیبرالیزم لە نێو نیگای پاراستن و دابین کردنی

ئازادییەکانی تاکەکەسەدا بۆ دۆزی عەدالەتی کۆمەڵایەتی و دەست تێوەردانی حکوومەت لە ئابووری روانیوە و سەرنجی داوە.

کەڵك وەرگرتنی هەموو هاوولاتیان لە ماف و ئازادییەکانی خۆیان بە شێوەی یەکسان، رەنگە پێویستی بە دابەش کردنی عادلانەی سەرچاوەکان و دابین کردنی هەلی یەکسان بۆ هەمووان بووبێت. دیارە لیبرالە جیاجیاکان سەبارەت بە چۆنیەتی یەکسانیی پیویست بۆ پاراستنی ئازادیی هاوولاتیان و رادەی دەست تێوەردانی دەوڵەت، بۆچوونی چوون یەکیان نییە. بەم حاڵەیشەوە لیبرالیزم بە گشتی پێ لە سەر ئەوە دادەگرێ کە گرینگی ئازادی لە پێش یەکسانی و عەدالەتی کۆمەڵایەتییەوەیە. بە واتایەکی دی ئازادی بە ئامانجی بنەڕەتی دادەنێ و یەکسانی و عەدالەت بە ئامێری گەیشتن بەم ئامانجە دەزانێ. بە جۆرێك ناتوانین بە بیانووی دروست کردنی یەکسانی و عەدالەتەوە ئازادییە بنەڕەتیەکان لە ناو بەرین یان بەربەست و تەسکیان کەینەوە.

## ١-١-٥. جیاکردنەوەی سنووری گشتی و سنووری تایبەتی

لیبرالیزم بەردەوام هێڵێك لە نێوان کایەی تایبەتی و کایەی گشتیی ژیاندا دەکێشێ و کایەی تایبەتی بە شوێنێکی خاوەن رێز، پیرۆز و پارێزراو لە دەست تێوەردانی دەسەلاتی سیاسی دەزانێ. جان ئیستوارت میل, فەیلەسوفی بەریتانی, لەم بارەوە کردەوەی سەبارەت بە خۆ و کردەوەی سەبارەت بە ئەوانی تری لە یەك جوێ دەکردەوە.

دەستەی یەکەمی بە سنووری تایبەتی و دەستەی دووەمی بە بەشێك لە سنووری گشتی دەزانی کە کاربەدەستانی دەوڵەت دەتوانن تەنیا دەست لەم بەشی دووەمە وەر بدەن. بەم حاڵەیشەوە هێڵی نێوان سنووری تایبەتی و گشتی بگۆڕ بووە. بۆ وێنە پلەوپایەی یاسایی، کار و چالاکی ئابووریی ژنان و رەفتاری بنەماڵە لەگەڵ ئەواندا، سەر بەکایەی تایبەتی بووە، کەچی ئەمڕۆکە یاسادانەر سەبارەت بە عەدالەتی نێو خێزان و بنەماڵە و مافی ئەندامان سەبارەت بە یەکتری دەستەوسان ناوەستێ.

### ١-١-٦. ساناگیری سەبارەت بە بیروباوەڕی خەڵکانی تر

پرۆسەی سەرهەڵدانی لیبرالیزم لە ئەورووپا لە قۆناغی دوای چاکسازیی ئایینی، واتە لە سەدەی هەڤدەوە دەستی پێکرد. شەڕگەل و کوشت و بڕی ئایینی ئەو چاخە، یەکێك لەو بنەما سەرەتاییانە بوو کە رێگەی بۆ بەربەست کردنی دەسەڵاتی حکوومەت خۆش کرد. بۆیە کاربەدەستان لە داسەپانی بیر و باوەڕی ئایینی بە سەر خەڵکدا و دەست تێوەردان لە کاروباری ئۆلی و بیروباوەڕی خەڵك قەدەغە دەکران.

ساناگیری و لێبوردەیی سەبارەت بە باوەڕی ئایینی، یەکێك لە لەمپەرە سەرەتایی و بنەڕەتییەکانی خوازیارانی هێزی حکوومەتان بە حیساب دەهات و لێبوردەیی و ساناگیری سەبارەت بە بیروباوەڕی ئایینی، دەستپێکی ساناگیری بوو سەبارەت بە بیروباوەڕی سیاسیی جیاواز.

### ١-١-٧. بەرەنگاری لە هەمبەر دەسەڵاتدا

لیبرالیزم لە سەرەتاوە ئایدیۆلۆژیای بەرەنگاری لە هەمبەر هێزی رەها و زۆرەملێ دا بوو. بە بڕوای لۆك گەورەترین پارێزەری لیبرالیزم، کاتێك حوکمڕانان بەبێ ئەوەی مافی ئەوان بێ،کە دەسەڵاتیان جێبەجێ دەکەن وەکو حاڵەتی شەڕ رووبەڕووی خەڵك دەبنەوە. بۆیە کاتێك خەڵك رووبەڕووی ژێر پێ کەوتنی ماف و ئازادیان دەبنەوە، مافی ئەوەیان هەیە بەرەنگاری و رووبەڕووی دەسەڵاتداران ببنەوە و لە بەرانبەریان راوەستن. فەیلەسووفی بەناوبانگی فەڕەنسی لە سەردەمی رۆشنگەریدا، مارکی دوکندورسێ (١٧٩٤-١٧٤٣) پێی وابوو لیبرالیزم دامرکێنەری هەر جۆرە هێز و دەسەڵاتێکە، جا ئەگەر ئەو دەسەڵاتە هی دەوڵەت, یان هی کڵێسا و نەریتیش بێ.

## ١–١–٨. مافی ملْکایەتی تایبەتی

ملْکایەتی تایبەتی لە روانگەی لیبرالیزمەوە یەکێکە لە کەرسە بنەڕەتییەکانی پاراستن و درێژەدەری ئازادیی سیاسی. ملْکایەتی تایبەتی بەیەکێك لە سەرچاوە رەسەنەکانی خودموختاری تاك و بەرەنگاری ئەو لە بەرانبەر دەسەلاتی حکومەت دادەنرێ. بە بڕوای دەیڤید هیوّم فەیلەسوفی بەریتانی (١٧٧٦-١٧١١) ملْکایەتی تایبەتی، بە بناغەی دامەزراوە دیموکراتیکەکان حیساب دەکرێ. بە بڕوای ناوبراو، کردە و نەریتی تایبەت بە ملْکایەتی، بەستنی پەیمان، تجارەت و حساب کردن و... هۆگەلی لە بارن بۆ جێبەجێ کردنی یاسا.

مۆنتسکیۆش بەلْگەی بۆ ئەوە دەهێنایەوە کە کڕین و فرۆشتن، هەستی ساناگیری و بەتەنگەوە هاتن بە هێز دەکات، چونکە لە کڕین و فرۆشتندا پێویست دەکات، رەفتار ناشەخسی و سەرنج نەدان بە تایبەتمەندی فکری و فەرهەنگی و ئایینی ئەو کەسەی مامەلّە لەگەلدا دەکرێ دەخوازێ.

چەند کەسانێك لە خاوەنڕایان لە نێوان لیبرالیزم و دیموکراسیدا جیاوازی بنەڕەتی بەر چاو دەخەن. بە بڕوای ئەوان پرسیاری بنەڕەتی لە دیموکراسیدا ئەمەیە کە «چ کەسانێك حکومەت دەکەن؟)) لە کاتێکدا پرسیاری بنەڕەتی لە لیبرالیزمدا ئەمەیە کە ((دەسەلات چۆن پەرژین دەکرێ))؟ لەم رووەوە لیبرالیزم لە سەر حکومەتی راستەوخۆی خەلّك و هاوکاریی بەردەوامی ئەوان لە سیاسەتدا پێ داگر نییە، هەر چەند ناتەباییشی لەگەلّدا نییە».

زۆر کەس لە لیبرالەکان هاوکات بە ناوی دیموکراسییەوە رەخنە لە ئیستبدادی زۆرینە دەگرن کە سەرکوتی کەمینەکان دەکات. هەر چۆنێك بێ ئەوەی ئەمڕۆکە وەکو چەمکی دیموکراسی لە ئارادایە زارۆی لیبرالیزم و تەواوکەری لیبرالیزمە. دیارە لیبرالیزم حکومەتی بەربلاو و نایاسایی زۆرینە بە حکومەتی بە ئەگەر و کۆت و پەرژین کراو و رێخۆشکەری ئازادییەکانی تاك نازانێ. ئاوا حکومەتێك لەوانەیە تەنیا

ناوی «دیموکراسیی خۆپەرەستان»ی لێ بنرێ. لەم بارەیەوە لیبراڵەکان، دیموکراسیی رۆسۆیی یان ژاکوبونی یان زۆرینەیەك کە دەڵێن نوێنەری «ئیرادەی گشتی» و خێری هەموانن، بە دیموکراسیی راستەقینە نازانن.

بە واتایەکی تر کاتێك «ئیرادەی گشتی»، «خێروبێری کۆمەڵگا» «عەدالەت» و «کامەرانی» جێگە بە ئازادی لەق بکات کە کۆڵەکەی هەرە بالاّو زێرینی لیبرالیزمە، سیاسەت و حکوومەت بە رێگای نادیموکراتیانە ئاراستە دەکات و دەئاژوێ. هەر لەم بارەیەوە بوو کە ئالکسی دۆتۆکڤێل، نووسەری فەرەنسی، باسی لە مەترسی دیکتاتۆریی زۆرینەتی، وەك دوژمنی تاکایەتی و خودموختاری و ئازادی تاك دەکرد.

هەر چۆنیك بێ، ئەمڕۆکە لیبرالیزم، حکوومەتی دامەزراو لە سەر بناغەی نوێنەرایەتی وەك ئەساسی دیموکراسی بە پێویست دەزانێ. لیبرالیزم ئەم حکوومەتی نوێنەرانە بە تەنیا رێگای کۆنترۆڵی دەسەڵاتی سیاسی و بەدیهێنەری بەشداریی کۆمەڵایەتی و دەستەبەری هەستی بەرپرسایەتیی کاربەدەستان لە بەرانبەر خەڵکدا، دەزانێ.

بەم مانایە دیموکراسیی لیبراڵ پێ لە سەر جۆراوجۆری و جیاوازیی قازانج و تاقمە کۆمەڵایەتییەکان دادەگرێ و نایەوێ لە ژێر چەمکی ئاڵۆزی، وەك ئیرادەی گشتی و بەرژەوەندی هەموان، تێکەڵ و یەکپارچەیان کاتەوە. ئەم دیموکراسییە پێی وایە کە دەکرێ لە چوارچێوەیەکی شکڵیانەی جێی پەسەندی هەموان، وتووێژێ لەسەر ناکۆکیی بەرژەوەندییەکان بکرێ و رێگاچارەیان بۆ دابنرێ، تاکو ئەژمارێکی زیاتر قازانج بکەن و هەر وەها تاقمەکانی کۆمەڵ لە سەری پێك بێن.

## ١-٢. پراگماتیزم

پراگماتیزم وەك بنەمای فەلسەفیی دیموکراسی چاوی لێ دەکرێ. لە کاتێکدا دیتمان لیبرالیزم فەلسەفەی سیاسیی دیموکراسییە. پراگماتیزم بزاڤێکی فەلسەفییە کە بڕوای وایە، مانا و راستی هزر و رووداوەکان دەبێت لە قازانج و ئامانجی ئەواندا بدوزرێتەوە.

کەواتە ناتوانیین و ناکرێ بە شوێن دوا راستیدا بگەڕێین. قازانجی بە کردەوەی تیۆری و ئەندێشەکان باشترین پێوانەی راستیی ئەوانن.

بەناوبانگترین بیرمەندانی پراگماتیست چارلز پیرس (١٩١٤-١٨٣٩) ویلیام جیمز (١٩١٠-١٨٤٢) و جۆن دیویی (١٩٥٢-١٨٥٩) بوون. سەرەڕای جیاوازیی بیروڕا لە نێوان ئەو نووسەرانەدا چەمکی گشتی و هاوبەشی نێوانیان ئەمە بوو کە، ئەندێشە و هونەر کاتێك راستن کە قازانج بە خەڵکی بگەیێنن و شادمانیان بکەن. راستیی ئەندێشە و هونەر لە پێشدا روون و دیاریکراو نییە، بەڵکو پێیان دەبەخشرێ.

ئەندێشەکان کاتێك وەراست دەگەڕێن کە ژیانی خەڵك ئاراستە بکەن و ئامانجیان پێ نیشان دەن، یانێ هۆی خێروبێر و خۆشی و رەزامەندیی خەڵك بن. بۆیە پێوانەی حەقیقەت دەبێ لە ژیانی بە کردەوەدا بدۆزینەوە نەك لە چوارچێوەی بیری روون و خەیاڵاویدا.

هەندێ نووسەرانی پراگماتیزم وەك «شێوە بیری ئەمریکی» دەناسێنن. بەردی بناغەی پراگماتیزم ئەوەیە کە مرۆڤ لە ئاڵ و گۆڕی داهاتوو لە شێوازی ژیان و بیر و ئاکاردا، چاو بەخۆیان دابخشێننەوە.

گرنگی پراگماتیزم لە دیموکراسیدا لەمە دایە کە خەڵکی لە پێبەند بوون بە بیرونەریتی داڕێژراو، وەك سەرچاوەی راستییەکان رزگار دەکات و بەکارهێنانی هەر جۆرە گۆڕانکاری و داهێنانێك کە بە قازانجی ژیانی مرۆڤ بێت، پاساو دەدات.

بەم مانایە پراگماتیزم فەلسەفەی ئەزموون، تازەکاریی بەردەوام، رزگاری لە رابردوو نەریتی دەست و پێ گرو لەم رووەوە رووبەرووی «موتڵەق گرایی» و «موتڵەق بیرکردنەوە» دەبێتەوە. وەك ئاماژەی بۆ کرا، برێك لە خاوەنرایان پراگماتیزم بە فەلسەفەی دیموکراسی ئەمریکی لە قەڵەم دەدەن. لە جۆری دیموکراسیی ئەورووپایشدا، قوتابخانەی رەسەنی سودگەرایی جێرمی بنتهام و جان ئستوارت میل شوێنی تایبەتی خۆیان هەیە. بنتهام داکۆکی لە پرەنسیپی «زۆرترین شادی گونجاو بۆ زۆرترین ئەژماری خەڵك» دەکرد.

## ١-٣. ڕێژەگەری

ڕێژەخوازی, مەکتەبێکە کە بایەخەکان بە شتێکی زەینی و نسیی دەزانێ و بڕوای بە هیچ بایەخێکی ئەبەدی و عەینی و گشتی کە بە حوکمی زانست و ئاوەز شیاوی سەلماندن بێ، نییە. ئەگەرچی دیموکراسی تا رادەییێك لە سەر ڕێژەگەریی بەهایی بەندە، بەڵام دیموکراسی بەم مانایە بەو ئاکامە دەگات کە دیموکراسی وەکو کۆمەڵێك بەها و بایەخی سیاسی لە جۆرەکانی تری حکوومەت باشتر نییە.

ئاساییە فەیلەسووف و بیرمەندانی پارێزەری لیبرالیزم و دیموکراسی بڕوایان بە بەهاکان، مافی سروشتی و عەینی کە شیاوی ناسینن هەیە. چونکە لە سەر ساناگیری سەبارەت بە جیاوازی و جۆراوجۆری سەبارەت بە بڕوا و بایەخەکان پێ دادەگرێ. ڕێژەخوازیی بەهایی لەم ڕەهەندەوە دابینکەری وەدی هێنانی مافی کەمایەتییەکانە لە دیموکراسیدا هاوکات لەگەڵ پرەنسیپی زۆرینەتی، یەك لە بنچینەکانی دیموکراسی بە ئەژمار دێت.

بە بڕوای ڕێژەخوازان هەموو بایەخ و جۆرەکانی ژیان لە حوجرەی ئاوەزدا لەرزۆکن. لەم سۆرخەوە هەموو لە یەك ئاستدا مافی ژیانیان هەیە. گەرچی ناتوانین بڵێین کە دیموکراسی لە سەر نسبیخوازی دامەزراوە. بەڵام دیموکراسی سیستەمێکە کە زۆرترین بوارو ئیمکان بۆ چەسپاندنی ڕێژەیی لە بایەخەکاندا دەڕەخسێنێ و نزیکترین سیستەمی سیاسییە لە بناغەکانی نسبیخوازیی.

هەر وەها نسبیخوازی هەر جۆرە باسێکی حاشاهەڵنەگر لە چەمکگەلی ڕەوشتی، وەك دوورەپەرێزی و دۆدەیی لە ژیانی سیاسیدا وەلا دەنێ و لەم چەمکگەلە پارێزگاری دەکا کە داڕێژراون و لە باری بایەخدا ڤالاّن. لەم ڕوانگەیەوە هەر جۆرە جیاوازی دانانێك لە نێوان مرۆڤدا نائاساییە. هیچ کەس بە سەر کەسێکی تردا بالاّ دەستی جەوهەری نییە و هەموو زنجیرەکانی پلە و پایە و سیستمگەلی ئیمتیاز، ڕەمەکی و ساختەیین.

وەك ئاماژەمان پێ کرد، هەندێ جار لە نێوان بەشە جیاجیاکانی نسبیخوازی و دیموکراسیدا ناتەباییش هەیە. بۆ وێنە ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە کە ئایا پرەنسیپی

«لێبوردەیی و ساناگیری, بۆ دوژمنانی ساناگیری ڕەوایە یان نا؟ ساناگیری سەبارەت بە دوژمنانی ساناگیری بە پێچەوانەی ئەسڵی ساناگیریە: کارل پوپر فەیلەسووفی هاوچەرخ وتوویەتی: تەنیا شتی دەگمەنی جێ متمانە لە ئەسڵی ساناگیریدا، ناساناگیرییە سەبارەت بە دوژمنانی ساناگیری.

هەر وەك باسمان کرد ناکرێ هەموو ژیان و بەها دیموکراتییەکان بە پرەنسیپی نسبیخوازی وەڵام بدەینەوە یان پارێزگاری لێ بکەین، چونکە ئاساییە لە مەکتیی نسبیخوازیدا ناتوانین لە شتێك بە ناوی ڕاستی یان دوابایەخی ڕەها پارێزگاری بکەین.

بەڵام وەك ئاماژەی پێ کرا نسبیخوازی بۆ پاساودانی بڕێك لە وردەخاڵی بچووکی ناوەوەی دیموکراسی کارامەیی هەیە.

## ٤-١. پرەنسیپی پەیمان (گرێبەندە)

بیری پەیمانی کۆمەڵایەتی وەك بناغەی سیستەمی سیاسی، چەمکێکی ترە لە چەمکە بنەڕەتیەکانی دیموکراسیی کە رابردووی بۆ تۆماس هابز، بێندێکت دو سپینۆزا، جۆن لۆك، ژان ژاك ڕۆسۆ, ئیمانۆیل کانت دەگەڕێتەوە. لە تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتیدا بە شێوەی گشتی سەرەتا «دۆخی سروشتی»، واتا دۆخی پێش دروست بوونی حکوومەت لە بەرچاو دەگیرێ.

ئیدی ڕەت بوون لە دۆخی سروشتییەوە بۆ «دۆخی مەدەنی» لە ڕێگای پەیمان و پێکهاتنی گشتییەوە ڕاڤە دەکرێ.

لەم تیۆریەدا، پەیمان بناغەی خۆ بەستنەوە و پەیڕەوکردنی دەسەڵاتی سیاسییە. چونکە تاك بە پێی ئەو شتەی کە لە پەیماندا مۆری کردووە، دەبێ بجوولێتەوە. هەر وەها ئەگەر پەیمانی ناوبراو بشکێت، مافی شۆڕش و سەرهەڵدان بە دژی حکوومەت شتێکی چاوەڕوان کراوە. گەرچی زۆر جار تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی بە دیموکراسی دەبەسترێتەوە وەلێ، دەتوانین ئەوەش هزر بکەین کە خەڵك لە ڕێگای پەیمانێکی کۆمەڵایەتی سەرەتاییەوە بۆ دامەزرانی حکوومەتێکی نادیموکراتیك پێك بێن.

لە روانگەی هابزەوە مادامەکێ خەڵك هێزیان کەم تا کورتێ وەك یەکە, هیچ بناغەیەکی سروشتی بۆ نەزمی سیاسی بەدی ناکرێ. بۆیە سیستەم ئەبێ بە شێوەی دەسکرد و لە سەر بناغەی پەیمان دابمەزرێ. لە پەیمانی کۆمەڵایەتیدا هەموان هاودەنگ دەبن کە لە مافی ژیان بەپشت بەستن بە توانای کەسایەتی خۆیان یان لە مافی پاراستنی زاتی خۆیان، بە هۆی هێزی خۆوە چاوپۆشی بکەن و ئەم مافە بە کەسی سێیەم کە حوکمڕان بێ، بسپێرن. بۆیە حوکمڕان دەتوانێ بۆ راپەڕاندنی ئەم کارە گرینگە دەسەڵاتی خۆی بە هەر جۆر کە بیەوەێ بەڕێوە ببات. دیارە حوکمڕان لەوانەیە یەك کەس یان تاقم و کۆمەڵێك خەڵك بێت. بە بڕوای هابز پەیمانی کۆمەڵایەتی یەکجار زیاتر نابەسترێ و هەمیشەش بەڕێوەبردنی پێویستە. بە بڕوای جۆن لۆك, مرۆڤەکان لە دۆخی سروشتیدا لە باری دەسەڵات و تواناییەوە یەکسانن و هیچ کەسێك لە یەکێکی دیکە فەرمان نابات. بەم حاڵەش لە دۆخی سروشتیدا خەڵك لە کۆمەڵێك رێساو بنەمای سروشتی لە ئاکاری خۆیاندا پەیڕەوی دەکەن، رێزی یەکتری دەگرن و پارێزگاری لە گیان وماڵی یەکتری دەکەن. بەڵام بەڕێوەبردنی شەخسی و تایبەتیی یاسای سروشتی, دابینکەری ئاشتییەکی بەردەوام و چەسپاو نییە. لە دۆخی سروشتیدا دەزگایەکی دیاریکراو بۆ بەڕێوەبردنی یاسای سروشتی لە ئارادا نییە.

ئیدی خەڵك لە رێگای پەیمانەوە, دەسەڵات و مافی بەڕێوەبردنی یاسای سروشتی بە کەسێك یان تاقمێك دەسپێرن و بەم جۆرە حکوومەت دائەمەزرێت. بە بڕوای لۆك و بە پێچەوانەی هابز، حکوومەت پێویستە بەردەوام زۆربەی خەڵکی لە پشت بێت و هەر چۆنێکی بێ خەڵکی مافی ئەوەیان هەیە پەیمانی کۆمەڵایەتی هەڵوەشێننەوە.

بۆچوونی هابز و لۆك لە بارەی چەمکی پەیمانی کۆمەڵایەتییەوە، سەرەڕای برێك جیاوازی، لە بنەڕەتدا لێك دەچن. بەڵام بۆچوونی ژان ژاك رۆسۆ راست بە پێچەوانەیە. لە بۆچوونی هابز و لۆك دا پەیمانی کۆمەڵایەتی بە شێوەیەکی گشتی سەرچاوەی حکوومەت دیاری دەکات لە کاتێکدا رۆسۆ چەمکی پەیمان بۆ رەخنە لە حکوومەتی ئێستا و دامەزرانی حکوومەتێك بەکار دەهێنێ کە لە سەر ئیرادەی گشتی دامەزرابێ. بە بڕوای رۆسۆ پەیمانێك کە بناغەی حکوومەت و کۆمەڵگای ئێستایە، پەیمانێکی

فریودەرانــە, دەغەلاّویــە کــە تیایــدا دەولّەمەنــدان، هــەژارو نــەدارانی پــیّ گــەوج دەکــەن تــاکو دۆخی نابەرابەری دەوام بکات.

لــە دۆخــی سروشــتیدا، دەولّەمەنــدان دەلیــل دێننــەوە کــە باشتــــر وایــە پەیــــمانێك بــۆ دامــەزرانی یاســا و حکوومــەت ببەســترێ تــا هــەمووان لــە دۆخــی ترســان لــە مــالّ و گیــانی خۆیان رزگاریان بێت.

پەیــــمانێکی ئــاوا, نابەرابــەری درێــژە پــیّ دەدا، بــەلاّم بۆچــوونی رۆســۆ لەمــەڕ چــەمکی پەیــمانی کۆمەلاّیــەتی، بۆچــونێکی خــوازراو و بــۆ چــیّ کردنــی نــەزمێکی کۆمەلاّیەتییــە. ئــەم پەیــمانە نابێتــە هــۆی ئــەوەی کــە فــەرمانڕەوایی لــە خەلّکــەوە بــە حــوکمڕان بــدرێت. هــەمووان مافــی خۆیــان بــە کۆمــەلّگا دەســپێرن بــەو شــەرتەی کــە کۆمــەلّگا پرەنســیپی وەکیــەکی مــاف بپــارێزێ و هــەموو یاســاکان لــە ســەر ئەساســی «خواســتی گشــتی» کــە چــاوی لــە بەرژەوەنــدی هــەموو کۆمەلّگاوەیــە, وەســتا بــیّ. بــە بــڕوای ڕەخنــەگران, تیــۆری پەیــمانی کۆمەلاّیــەتیی رۆســۆ بە بەراورد لەگەلّ بۆچــونی هــابز و لــۆك دا, جــیّ خۆشــکەری مــەیلی دروســت کردنــی ((ملــهوڕی زۆرینەیە)) کە بە ناوی خێر و خواستی گشتییەوە جێبەجیّ دەکریّ.

گرینگتــــرین تیۆریســیەنی پەیــمانی کۆمەلاّیــەتی لــە شــیوەی نــویّ لــە ســەدەی بیســتدا، جان رالــزە، جــان رالــز لــە کتێبیّ «تیــۆریی عەدالــەت (١٩٧١) دۆخێکــی لــە بەرچــاو گیــرا وەك «دۆخــی ســەرەتایی» دەبینێتــەوە کــە تیایــدا خــەلّك ســەبارەت بــە کۆمــەلّێك پرەنســیپی بنەڕەتی بۆ کۆمەلّگا پێك دێــن، بــەلاّم هــیچ کامیــان نــازانن خۆیــان لــە کۆمەلّــدا لــە چ دۆخ و پلەیــەك دان، بۆیــە دەتوانیــــن بلّــێین ئــەوان لــە پشــتی «پــەردەی نەزانیــــن»وەن. بــە بــڕوای رالز, ئێمە لەو دۆخە سەرەتاییەدا پیّ لە سەر سیّ ئەساس دادەگرین:

١- یەکــەم دەمانــەویّ ســەرەڕای ئــەوەی کــە لــە کۆمەلّــدا چ پلەیــەکمان هەیــە، لــە برێــك ماف و ئازادیی ئەساسی بەشدار بیــن.

٢- دەمانــەویّ ســەرەڕای ئــەوەی کــە لــە کۆمەلّــدا چ کارامــەیی و توانایــەکمان هەیــە، هەلی لەبار بۆ جێبەجیّ کردنیان لە بەر دەستماندا بێت.

٣- ســەبارەت بــەو کەســانەی کــە لــەناو کۆمەلّــدا نیگەرانیــــن، چــونکە لەوانەیــە خۆمــان لەو دۆخەدا بیــن.

ئیـدی دەمانــەوێ تــەنیا ئەوەنــدە نابەرابــەری لــە کۆمەڵــدا هــەبێت کــە دابینکــەری پێشــکەوتنی حــاڵی بێبەشــان بێــت. لــە بــەر ئــەوەی رادەیــەك نابەرابــەری دەبێتــە هــۆی دڵەڕاوکەی کار و تێکۆشان کە ئەویش بە قازانـجی گشتی تەواو دەبێ.

تیۆری رالز، گـرێ پووچـکەی کـۆنی هـابز و لـۆك دەکاتـەوە. بـەو مانایـە کـە پەیــمان نـە بــە راســتییەکی مێــژوویی، بــەڵکو وەك چــەمکێکی زەیــنی لــە بــەر چــاو دەگــرێ. گــەر لــە دیـــموکراسیدا ئــەم گریـــمانە کــە رێکخــراوە سیاســییەکانی کۆمــەڵ دەبــێ بــۆ هــەموان جێگــای قبــووڵ کــردن بــن، بــە جــێ و رەوا بــن، لــەو حاڵــەدا چــەمکی پێکهــاتنی گریـــمانەی رالز ئەو خاڵەمان بە دەستەوە ئەدات کە هەموان لە هەموو دۆخێکدا وەری دەگرن.

## ١–٥. پرەنسیپی رەزا بوون و پەسندکردنی گشتی

چــەمکێکی تــر لــە چــەمکە بنەڕەتیــەکانی فەلســەفەی سیاســیی دیموکراســی، چــەمکی رەزابــوونی هاوولاتیانــە نــە لــە پــەیڕەوکردن لــە حکوومــەت دا. لــەم تــێ روانینــەوە رەوا بــوونی دیـموکراسی لە سەر کـردەوەی حکوومــەت بەنـدە، کـە دەبـێ لـە سـەر خواسـت و رەزامەنـدیی هاوولاتیان بەند کرابێ.

دیـــموکراسی بــێ رازی بــوونی گشــتی بــێ مانایــە. رەوا بــوونی حکوومــەت بــە هــۆی رەزامەندییەوە، بناغەی دیـموکراسیە.

لـە روانگـەی لایـەنگرانی دیـــموکراسییەوە، مرۆڤــەکان گیانلەبــەرانی عاقــڵ و بــژارخوازن و لــەم رێگایــەوە دەکــرێ ناونیشــانی رەزابــوون یــا نــەبوونی ئــەوان لــە حکوومــەتی خۆیــان بدۆزرێتەوە. رەزا بـوون بـەم مانایـە، ئـازادی بـە شـێوەیێکی بـاوەرپێکراو پەرچیـــن دەکـا و بـە بەرفــەرمان بــوون و ئیلتزامــی دەگــۆڕێ. ئــاوا ئیلتــزام و بەرفــەرمانبوونێك خــۆی یەکێکــە لــە رواڵەتــەکانی پرەنســیپی ئــازادیی سیاســیی تــاك کــە چوارچــێوەی بــۆ روون و دیــاری دەکــات. رەزابــوون و قاییــل بــوون، ئەساســی ملکەچــی و گوێڕایــەڵی و جێبــەجێ کردنــی فــەرمانی حکوومەتــە بــە شــێوەیەکی ئازادانــە. وەکالــەت و نوێنەرایــەتی یەکێکــە لــە رەهەنــدە بــە هەڕمێنــەکانی دیـــموکراسیی لەســەر رەزامەنــدی دامــەزراوە. بۆیــە رەزامەنــدی لــە چــەمکی

کاراو بزۆز و پۆزەتیڤیدا، ڕێخۆشکەری بەڵێن و ئیلتزامات و نیشاندەری ماف و ئازادییەکانی تاکە. یەکێك لە تیۆرییە سەرەکییەکانی لە فەلسەفەی سیاسیی ئەمڕۆدا لە بواری زەمینەی ئیلتزام و دەسەڵاتی سیاسیدا، هەر ئەم تیۆرییەی پێکهاتن, یان قاییل بوونەیە. لەم تیوریەدا قایل بوون و ڕەزا بوونی تاك بەتەنیا سەرچاوەی وەفاداری و بەڵێنی سەبارەت بە پەیڕەو کردنی یاسا و دەسەڵاتی حکوومەت. بە پێی بۆچوونی جیاوازی ئەم تیۆریە، ڕەزا بوون ڕەنگە ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ (نوێنەرایەتی) و لەوانەیشە گریمانەیی بێ بەو مانایە کە لە بەستنی پەیماندا لە بەرچاو گیراوە.

سەبارەت بە ڕەزامەندی نا ڕاستەوخۆ زۆر پێ داگیراوە. چونکە ناتوانین نیشانەگەلی بەرچاو لەمەڕ ڕەزامەندیی ڕاستەوخۆ بۆ گوێڕایەڵی حکوومەت دەست نیشان بکەین. بیری ڕەزا بوونی گریمانەیی بۆ ڕوانگەی کانت دەگەڕێتەوە و ئاماژە بەو شتانە دەکات کە بە پێی ئوسوڵ، تاکەکان دەبێ دەربارەیان هەست بە قاییل بوون و وەرگرتن بکەن.

لەم ڕوانگەیەوە ڕێکخراوە سیاسییەکان, پەسندکردن بێ ئەوەی خەڵکی ڕەزامەندیی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆیان سەبارەت بەپێڕەو کردن لەو دەزگایانە دەردەبڕییێ، بێ قایل بوون وەرگیراوە و دەبێ هاوولاتیان گوێڕایەڵی بن.

جۆن لۆك فەیلەسووفی بەریتانی پێی وابوو کە جەوهەری ئەم باسە لەوەدا خۆ دەنوێنێ کەسێك لە وڵاتێکدا دەمێنێتەوە و ئازادییشە کە جێی بێڵی، لە ڕاستیدا بەو مانایەیە کە گوێڕایەڵی بۆ دەسەڵاتی حکوومەت و یاساکانی دەربڕیوە؟

ڕەخنەگران قاییل بوونێکی ئاوایان، لام سەرلایی لە قەڵەم داوە و بەشداریی هەموو لایەنە و ڕاستەوخۆ لە ژیانی سیاسییان بە دیاردەی حاشاهەڵنەگری ڕەزابوون و قاییل بوونی مرۆڤ لە دیموکراسیدا زانیوە. دەیڤید هیوم لە هەڵسەنگاندنی بۆچوونی لۆك دا دەڵێ، ناتوانین مانەوەی بەردەوامی مرۆڤ لە وڵاتی دایکدا، وەك هەڵبژاردنێکی ئازاد وەر بگرین، لە بەر ئەوەی کۆچبەری خەرجێکی زۆری مادی و مەعنەوی لە ئەستۆی ئەو دەخات. بە سەرنج بەو ڕەخنانە کە چەمکی قاییل بوونی پەنامەکی بۆ پەیڕەوی لە

دەسەڵاتی حکوومەت کراوە. لایەنگرانی ئەم دواییانەی تیوری پێك هاتن و وەرگرتن، سەنگینیی زیاتریان لە سەر چەمکی ڕەزایەتی گرێمانەیی هاویشتووە.

## ١-٦. پرەنسیپی بەرابەری «وەکیەکی مەدەنی»

پرەنسیپی بەرابەری بەم مانایە کە هەموو مرۆڤەکان هاوبایەخن و دەبێ لەگەڵ هەمووانـدا بە شێوازێکی یەکسان بجووڵێنەوە، پرەنسیپێکی دیکەیە لە پرەنسیپە ئەساسیەکانی دیموکراسی. بەم بۆنەوە دیموکراسی لەگەڵ نابەرابەری یاسایی و سیاسیدا ناسازێ!. پرەنسیپی بەرابەری لە مانا بنچینەییەکەی خۆیدا بەم مانایەیە کە هەموو مرۆڤەکان بە حوکمی مرۆڤ بوونیان بەرابەرن و یەکێکیان لەوانی تر زیاتر نییە. لە باری سیاسییەوە پرەنسیپی بەرابەری بەم مانایە هاتووە کە هاووڵاتیان لە بەرانبەر یاسا و لە باری ماف و ئازادییەوە بەرابەرن. ئەگەرچی بەرابەری لە باری کۆمەڵایەتی و ئابووریەوە شتێکی دڵگرە بەڵام نامومکینە، لە سیستەمی فیودالیدا, کارە جۆراوجۆرەکانی خەڵك لە باری یاساوە لە ماف و ئیمتیازاتی جیاواز بەهرەمەند بوون. بۆیە لە باری یاساوە یەکسان نەبوون. لە خەباتی سەرەتاییدا بۆ دامەزرانی دیموکراسی، بەهرەمەندی لە مافی مەدەنی بە ملکایەتییەوە بەسترایەوە، تا دواتر وای لێهات تەنیا ئەندامەتی یا هاووڵاتی بوون لە کۆمەڵگای سیاسیدا بۆ بەهرەمەندی لە مافی بەرابەر وەرگیرا. بۆیە خەڵك سەرەڕای ملکایەتی، کار، خوێندەواری، نەتەوە، ئایین، زمان و... لە باری یاساوە یەکسان لە بەرچاو گیران. ئەوەی کە وەکو یەکێك لە ستوونەکانی دیموکراسی گرینگی هەیە، بەهرەمەندی بەرابەری لە مافی مەدەنی وەك ئازادیی بلاوکردنەوەو دەربڕینی بیروڕا و مافی سیاسی وەك دەنگ دان و مافی وەدەست هێنانی پلە و پایەیە.

بەرابەری لە باری ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە بەشێ لە بنەمای دیموکراسی نییە. بەڵام ئەم شتە لە کەماڵ و پێ گەیشتنی دیموکراسیدا، شتێکی چاوەڕوان کراوە. بە جۆرێکی تر وەکیەکی ئەسڵی لە دیموکراسیدا، بەرابەری هەلەکانە، نەك دەسکەوتەکان.

ئەو کەسانەی کە بە شێوەی بەرابەر لە پەنای یاسادان، دەتوانن لەو هەلانەی کە سیستەمی کۆمەڵایەتی و سیاسی دەستەبەریان دەکات، کەڵك وەرگرن و لە ژیانی سیاسیدا بەشدار بن و رکەبەری بۆ بکەن.

بە واتاییێکی دیکە بەرابەری, دابینکەری لابردنی هەر جۆرێك جیاوازییەکە لە نێوان خەڵکدا بە تایبەت لە باری رەگەز، قەوم، جنسیەت، ئایین، بیروبڕوای سیاسی و هتد.

تێکەڵ و پێکەڵکردنی چەمکی بەرابەریی هاووڵاتیان لە باری یاسا و سیاسییەوە لەگەڵ چەمکی بەرابەریی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا، گرفتی نەزەری و بە کردەوەی زۆری بۆ دیموکراسی دروست کردووە، بە جۆرێك کە زۆر جار بە بیانووی دابین کردنی بەرابەریی کۆمەڵایەتییەوە، ئازادییە مەدەنی و سیاسییەکان بەر هەڕەشە و گوڕەشە کەوتوون. دیموکراسی بە لانی کەمەوە کە بە مانای ئازادی و بەرابەریی یاسایی و سیاسی خەڵك دێ، لە دیموکراسی بە لانی زۆرەوە کە تیایدا جگە لە ئازادی، بەرابەریی کۆمەڵایەتی و سیاسی بە پێی توانا دابین دەکرێ، جیا بکرێتەوە.

بێ دیموکراسیی لانی کەم (یانی بەشداری و رکەبەری نێوان هێز و تاقمە گەورەکانی سیاسی و ئاڵ و گۆڕی دەسەڵات لە نێوانیاندا) دیموکراسیی لانی زۆر (بەشداری گشتی لە سیاسەتدا لە هەل و مەرجی بەرابەریی نسبی کۆمەڵایەتی و ئابووری) جێبەجێ نابێت. لە لایەکی ترەوە هەوڵدان بۆ دامەزرانی دیموکراسیی لانی زۆر (دابین کردنی بەرابەریی ئابووری و کۆمەڵایەتی بە مەبەستی جێ خۆش کردن بۆ بەشداری گشتی) بە شێوەی ئاسایی، ئەسڵە بنەڕەتییەکانی دیموکراسی رەخساندووە. زۆرترین مانایەك کە دەتوانین بۆ بەرابەریی کۆمەڵایەتی لە دیموکراسیی سیاسیدا لە بەرچاوی بگرین، بەرابەریی رێژەییە لە دابەش کردنی سەرچاوەکانی دەسەڵات لە نیوان هێز و یاریکەرانی تێکۆشەری سیاسیدا، تا ئەم هێز و تاقمە جیاوازە سیاسیانە بتوانن لە سەرچاوەی جۆراوجۆری دەسەڵات «سەرچاوەی مادی، پەیوەندی، پەروەردەو...» کەڵك وەرگرن.

### ١-٧. خودموختاریی تاك

خودموختـــاریی تـــاك بۆچـــوونێكی تایبـــەتی لـــە ئازادییـــە كـــە بـــە بـــڕوای هەنـــدێك لـــە لایـــەنگرانی دیـــموكراسی تـــەنیا لـــەم جـــۆرە حكوومەتـــەدا دەســـتەبەر دەكـــرێ. مرۆڤـــی خودموختار كەسێكە كـە بڕیـاری سـەبارەت بـە ژیـانی خـۆی، خـۆی دیـاری دەكـات و بـەڕێوەی دەبـات. رۆسـۆ یەكـەم فەیلەسووفـــی مـــەزن بـــوو كـــە لـــە نێـــوان خودموختـــاریی تـــاك و دیـــموكراسیدا پەیوەنـدییێكی قـوولّی دەدیـت. بـە بۆچـوونی رۆسـۆ لـە كتـێبی پەیـمانی كۆمەلاّیەتی (١٧٦٢)دا، ئازادی بریتیە لـە پـەیڕەوی كـردن لـە یاسـایەك كـە تـاك بـە خۆشـی خـۆی وەریگرتـووە. بۆیـە دۆزی بنـەڕەتی دروسـت كردنـی ئاشـتی لـە نێـوان ئـازادیی تـاك و دەوڵەتدا وەك سەرچـاوەی یاسـا بـەم شـێوەیە چـارە دەبێـت، بـەم مانایـە كـە، هـەمووان ئـەبێت لـە نووسیـــن و دانـانی ئـەو یاسـایەدا كـە هـەمووان پـەیڕەوی دەكـەن بەشـداری بكـەن. بـەم شێوەیە لـە رێگـای دیـموكراسیی راسـتەوخۆی بـە بەشـدارییەوە، خودموختـاریی تـاك لەگـەڵ دەسەلاّتی حكوومەتـدا رێـك دەكـەون. دیـارە گـرێ پووچـكەی رێگەچـارەی رۆسـۆ لێرەدایـە كـە بـۆ دابینكردنـی خودموختـاریی راسـتەقینەی تـاك، هـەموو یاسـاكان ئـەبێت بـە تێكـڕای دەنگی هەمووان پەسەند بكـرێن و لـە بـەر ئـەوەی ئـەم كـارە هەمیشـە ئیمكـانی نییـە، بۆیـە خودموختاریی تاك لە بەر تیشـكی یاسـادا دابیـن نابێـت. لـەم بـارەوە هەنـدێك لـە نووسـەران پێیان وایە تـەنیا لـە ئانارشـیزم دایـە كـە خودموختـاریی راسـتەقێنە و هـەموو لایەنـەی تـاك دابیـن دەكرێت.

بەلاّم لێكدانـەوەی وا لـە لایـەك وێنـەیێكی چـاخانئاوی لـە خودموختـاریی تـاك وە بەرچـاو دەخـات و لـە لایـەكی تـرەوە ئـەو خالّـە پشـت گـوێ دەخـات كـە دەوڵـەت خـۆی دابینكـەری بایەخگـەلی وەك نـەزم و ئاسـایش و یاسـایەو بـە قـەدەر ئـازادیی تـاك گرینگـی هەیـە و تەنانـەت ئەگـەر خودموختـاری تـەواوی تـاك لـە دیـموكراسیی ئاسـاییدا دابیـن نـەكرێ هێشتا دەبێ بلّێین كـە دیـموكراسی دلّنیـاترین رێگایـە بـۆ خودموختـاریی تـەواوی تـاك لـە دۆخێكدا كە حكوومەت هەیە.

### ١-٨ یاسا و یاساخوازی

یاسـای بنـەڕەتی (دەسـتوور) وەك كۆمـەڵێك پرەنسـیپ و بنـەمای گشـتی و سـتراكتۆری، چوارچـێوەیێك بـۆ ڕێكخسـتنی پەیوەندییـەكانی هێـزی حكومـەت دروسـت دەكـات. یاسـای ئەساسـی پێویسـتییەكی حكومـەتی بەرتەسـك و سـنووردارە و ئـاوا حكومـەتێك پێویسـتی بە دیـموكراسییە، گەرچی ڕێك وەك دیـموكراسیش نییە.

بـەم حاڵەیشـەوە لەوانەیـە لـە نێـوان ملكەچـی بـۆ یاسـای ئەساسـی و دیـموكراسیدا ناتەبایی دروست بێ. بـەم مانایـە كـە كاربەدەسـتان نـاتوانن لـە عـەینی كاتـدا لـە بەرانبـەر راوبیـری گشتییەوە بـە بـەرپرس بناسـرێن، لـە هـەمان كاتـدا ملكەچـی ئـەو یاسـایە بـن كـە پێشینیان دایاننـاوە.

لەم روانگەیەوە پێویسـتیی دیـموكراسی ئەوەیـە كـە یاسـای ئەساسـی بـەردەوام لـە لایـەن خەڵكـەوە بگـۆڕێ. گـەر یاسـای گشـتی بـە یاسـایەكی تـەواو پـیرۆز بشـوبهێنرێ، تایبەتـمەندیی نادیـموكراتیك بە خۆوە دەگرێ.

لە بەرانبـەر ئـەم تێڕوانینـەدا ئەوانـەی كـە لـە چـاوی یاسـای گشـتییەوە دەڕوانـن دەڵـێن: ئێمە لە خەمی توندڕەوی زۆربنـەیی لـە دیـموكراسی دایـن. ئەمانـە دەڵـێن یاسـای گشـتی بـۆ پاراستنی ماف و ئازادییەكانی تاك لە بەرانبەر سەرەڕۆیی زۆربایەتیدا پێویستە.

هـەر چـۆنێكی بـێ لـە هـەر دوو روانگـەدا یاسـای گشـتی ئـامێرێكی «دژی زۆربنـەیی»ە، یەعنی لـە لایـەك بـەرگری لـە دەربـڕینی خواسـتی راسـتەقینەی زۆربایـەتی دەكـات و لایـەكی تـرەوە بـەرەنگاری سـەرەڕۆیی ئـەوان دەبێتـەوە. بـەم حاڵەیشـەوە لـە دیـموكراسییەكانی ئەمڕۆدا، یاسـای ئەساسـی نووسـراو «جگـە لـە بـەریتانیا و نیوزلانـدی» یـەكێك لـە كۆڵەكـە ئەسـڵیەكانی دیـموكراسییە، سـەرەڕای ئەمـە لـە دیـموكراسییەكاندا یاسـای ئەساسـی لـە دەست تێوەردان و گۆڕین پارێزراو نییە.

ئـەو پشـتیوانیگەلە كـە یاسـای ئەساسـی لـە مـاف و ئـازادیی تـاكی دەكـات بنـەڕەتی دیـموكراسی قورس و قایـمتر دەكات گەرچـی نـابێ لـەم خاڵـە بـەو ئاكامـە بگـەین كـە دەرگـا لە سەر بیـركردنەوە و رامـان سـەبارەت بـە بنـەماو یاسـاكانی ئەساسـی دائـەخرێ، مەبەسـتی

سەرەکی لە دانانی یاسای ئەساسی، کۆنترۆڵی حوکمڕانی هەڵبژاردنەکان و نوێنەرانی خەڵك و پێشگیری لە کردەوەی نابەجێیە کە ئەوان بە ناوی خەڵکەوە جێبەجێی دەکەن.

ئیدی یاسای ئەساسی لە بارێکی ترەوە پەیوەندی و نێوانی هەڵبژێرگەل و هەڵبژێراوان رێك دەخا و کۆنترۆڵی دەکات.

جگە لە مانە هیچ رێگاییێکی دڵنیاکەر بۆ دەستەبەر کردنی وەفاداریی حوکمڕانە هەڵبژاردەکان سەبارەت بە داخوازی خەڵکی نییە.

تەنیا سیستەمی هەڵبژاردن بۆ ئەم مەبەستە بەس نییە. بۆیە یاسای ئەساسی پردی نێوان خەڵك و کاربەدەستانە لە دیموکراسیدا.

دابەش کردنی دەسەڵاتی دەوڵەت بەپێی یاسای ئەساسی ئەو رێگایە بۆ خەڵك یان زۆربەی ئەوان دەکاتەوە تا لە نێوان کاربەدەستان یانی نوێنەرانی خۆیاندا «دابەش کەن و حکوومەتایەتی کەن».

دابەش کردنی هێز لە نێوان دەسەڵاتی یاسادانان و دەسەڵاتی بەڕێوە بردن، نێوان شۆرای یاسادانان و لە نێوان ئاستەکانی حکوومەت لە دەوڵەتانی فیدراڵدا، ئیمکانی چاوەدێریی خەڵك بە سەر حکوومەتدا، زیاد دەکات. ئەندامانی دەسەڵاتێکیان لانی کەم لە باری بەرژەوەندییەکانی توێژ و رێکخراوەی خۆیانەوە چاودێریان بە سەر کردەوەی هێزەکانی ترەوە هەیە. بۆیە یاسای ئەساسی ئامێری کاریگەری چاوەدێریی خەڵکە بە سەر حوکمرانی بژاردەی خۆیانەوە. بۆیە جیاکردنەوەی دەسەڵات و چاوەدێریی ئەوان بە سەر یەکتریدا لە پێویستییەکانی حکوومەتی دیموکراسیە. هەر بەم پێیە گۆڕینی سووك و ئاسانی یاسای ئەساسی, کۆڵەگەکانی حکوومەتی دیموکراسی لەق دەکات.

بە گشتی کاریگەریی ئەسڵی یاساگەلی گشتی، یەکێکی: ناچارکردن و زۆر کردنە لە کاربەدەستانی سیاسی هەڵبژێردراو، بۆ ئەوەی پەیمانی خۆیان لە هەڵبژاردندا بۆ خەڵك دووپات بکەنەوە، دووەم کردەوەی چاوەدێریی ناڕاستەوخۆی خەڵکە بە سەر کاربەدەستانەوە لە مەودای نێوان هەڵبژاردنەکان و سێیەم: دروست کردنی کەلێنە لە نێوان کاربەدەستاندا لە رێگای پرەنسیپی دابەش کردنی دەسەڵاتەوە، تا حوکمی خەڵك بە ئاسانی دەستەبەر بێت. بۆیە بە پێچەوانەی بیری باوەوە، تایبەتکاریی یاسای ئەساسی تەنیا

پێشگیـــری لـه دیکتـاتۆری و زۆرەملـێ نییـه. بـه واتایـه‌کی تـر یاسـای ئەساسـی هـەم کـاری تایبـەتی پێشگیـــری لـه دیکتـاتۆری و هـەم کـاری تایبـەتی ڕێخۆشـکەری دیـــموکراسی هەیـه و بـەم پێیـه ئیمکـانی حکوومـەتی خـەڵك بـه سـەر خۆیانـدا سـانا دەکاتـەوە. بـەم پێیـه ناتوانیـــن دیـموکراسی تەنیا بەم هۆیە کە حکوومەتی زۆرینەیە، بە چەمکی ڕۆسۆیی داشکێنیـن.

حکوومـــەتی زۆرینـــه، ڕەوایـــی بڕیارەکـــانی تـــەنیا لـــه سەرچـــاوە یـــان بیچـــمی ئـــەودا دەدۆزێتەوە، بـه مانـای دیکـه «ئـەژمار» پێوانـەی ڕەواییـه. لـەم ڕووەوە هـەر بڕیارێـك زۆرینـه دەری بکات کە عادلانە بـێ یـان ناعادلانـە یاسـایی بـێ یـان نایاسـایی، پێوانەیـە و کـاری بـه سەر نـاوەرۆکی بڕیارەکانـەوە نییـه. بـەڵام ناتوانیـــن دیـــموکراسی تـەنیا بـه خواسـت و هـەوا و هەوەســـی خێـــرای زۆرینـــه داشکێنیـــن. لـــەم ڕووەوە یاســـا و یاســـاخوازی پشـــتیوانی دیـموکراسییە، لـەم حاڵـەدا زۆرینـه نـاتوانێ بـه حـەزی خـۆی و بـه هێـزی ئـەژمار، کەمینـه لە مافی ڕادەربـڕین و دامـەزرانـدنی ئەنـــجومەن بێبـەش بکـات، لـه بـەر ئـەوەی یاسـا مافـــی ئاوای بۆ هـەمووان دابیـــن کـردووە. بۆیـه حکوومـــەتی زۆرینـه بـێ یاسـای ئەساسـی ئیمکـانی هەیـه. بـەڵام دیـــموکراسی بـــه مانـــا قووڵەکـــەی، بـــێ دەســـتوور نامومکینـــه. بـــه گشـــتی ڕێککـــەوتنی بنـــەڕەتی تـــری خـــەڵك لـــه دیـــــموکراسیدا دەربـــارەی مـــاف و ئازادییـــه بنەڕەتیـــەکانی تاکـــەکان هـــەمان یاســـای ئەساســـییە، گەرچـــی ئـــەم ڕێککەوتنـــە ئەشـــێ بگـۆڕدرێ و لێـك بدرێتـەوە. هـەر چـۆنێکی بـێ ئیمکـانی پێداچـوونەوە و هاوسـەنگیی یاسـای ئەساسـی بـه مەبەسـتی لـه بەرچـاو گـرتنی بـەرەکانی داهـاتوو کـەم تـا کـورتێ لـه بەرچـاو گیـــراوە. لـه هەنـدێك لـه وڵاتانـدا ئـەم کـارە لـه ڕێگـای لێکدانـەوە و ڕاڤـه کردنـی دادەوە جێبەجێ دەکرێت. بـەم پێیـه و بـه پێچـەوانەی بۆچـوونی هەنـدێك لـه نووسـەران بـەردەوامیی یاسـای ئەساسـی کـۆن کـه لـه لایـان بـەرەی پێشـووەوە دیـاری کـراوە، لـه ڕاسـتیدا بـه مانـای حکوومەتی مردووان بە سەر زیندووانەوە نییە.

### ١-٩. هاوولاتی بوون

پلـەی هـاوولاتی و مـاف و ئەرکـەکانی بەچـەمکە ئەساسـییەکانی ژیـانی دیـموکراتیك حیسـاب دەکـرێ. هاوولاتیـان لـە بـاری مـاف و ئەرکـەوە لەگـەڵ یەکـدا بەرابـەرن. لـە دیـموکراسیی کەوناریشـدا لـە یۆنـان و رۆم پلـەی هاوولاتیـەتی بـە مانـای هـەبوونی مـاف و ئـەرکی چـوون یـەك لای یاسـا و هـەروەها بەشـداری لـە کاروبـاری سیاسـی و گشـتی کۆمەڵگادا بوو. مافـی حـوکمڕانی و هـەر وەهـا ئـەرکی پـەیڕەوی کـردن لـە حکوومـەت، هـەر دوو بەشێك لە پلـەی هـاوولاتی بوونـە. بـەم حاڵەیشـەوە لـە«ئـەتینا»دا هـاوولاتی بـوون تـەنیا بـۆ پیـاوانی ئـازاد لـە بەرچـاو گیـرا بـوو و کۆیلـەکان بـە هـاوولاتی حیسـاب نـەدەکران. لـە ئیمپراتـۆری «رۆم»دا، پلـەی هـاوولاتی بـۆ هـەموو خـەڵکی و هـەر وەهـا خـەڵکی ولاتـانی داگیـرکراو بـوو. بـەم حاڵەیشـەوە پلـەی هـاوولاتی بـوون لـە رۆمـدا زیـاتر بەلایـە نگاتیڤەکەیدا دەشکایەوە کە پـارێزراوی لـە ئاسایشـی یاسـایی بـوو, تـا بـە مانـا پۆزتیڤەکـەی کە مانای بەشداریی چالاکانەیە لە بواری سیاسیدا.

دواتـر چـەمکی هـاوولاتی لـە ئیتالیـای چـاخی رێنسانسـدا زینـدوو کرایـەوە. بـە بـڕوای بیـرمەندانی چـاخی رێنسـانس مرۆڤایـەتیی تـاك, تـەنیا وەك هـاوولاتیی کۆمـەڵگای ئـازاد و خودموختـاردا دابـین دەبێـت. چـەمکی هـاوولاتی لـە شۆڕشـی فەرەنسـە بـە چـڵەپۆپەی گەشـاوەیی خـۆی گەیشـت و لـە بەیاننامـەی مافـی مرۆڤ و هـاوولاتی سـاڵی ١٧٨٩دا بـە تەواوی رەنگی دایەوە.

ژان ژاك رۆسـۆ چـەمکی وردی هـاوولاتی بـە شـێوەیەکی ئایدیالیسـتانە بـە خسـتنە پێشـی خێـر و بەرژەوەنـدیی گشـتی بـە سـەر قازانـجی تایبەتیـدا مانـا دەکـردەوە. هـاوولاتی راستەقینە لە راستیدا کەسێکە کـە دەتـوانێ مەسـڵەحەتی گشـتی بپـارێزێ.بـەو مانایـە کـە خـاوەنی «ئیـرادەی گشـتی» و «چـاکەی مـەدەنی» بـێ. بـەلام لـە سـەدەی ١٩دا نێـوانی چەمکی هـاوولاتی و خێـری گشـتی بـەم جـۆرە نەمایـەوە و هـاوولاتی وەك بەرژەونـدو کەسـانێك لـە بەرچـاو گیـران کـە لـە بنەڕەتـدا لـە سـەر قـازانج و گەیشتـن بـە خێـر و بێـری خۆیـان

لەگەڵ یەکدیدا جیاوازین. بۆیە پلەی هاووڵاتی لە چاخی نۆژەندا لەگەڵ دابینبوونی ئاسایشی تاك لە بەرچاو گیرا، نە وەك خێری گشتی و کۆمەڵایەتی.

پلەی هاووڵاتی بە مانای بەهرەمەند بوون لە مافگەلی وەك ئازادیی رادەربڕین، بەرابەری لە یاسا، مافی کۆبوونەوە و... هتد بێ سەرنج دان بە دۆخی چینایەتی، جنسی، رەگەزی و... هتد، مانای بەهەرمێنی هاووڵاتی لە سەدەی ۱۹دا بوو، بەڵام لە سەدەی بیستدا سەرهەڵدانی چەمکی «مافی کۆمەڵایەتی» مانای هاووڵاتی زیاتر گەورە کردەوە. مەبەست لە مافی کۆمەڵایەتی بەهرەمەندی لە خزمەتی کۆمەڵایەتی، لەشساخی، فێرکاری، دابین کردنی کۆمەڵایەتی و... هتد. بوو بەم شێوە چەمکی هاووڵاتی تەنیا تایبەتمەندیی مافی و سیاسی ناگرێتە خۆ، بەڵکو مانای کۆمەڵایەتی و ئابووریش دەگرێتە خۆ و بەم جۆرە کێشەی سەرەکی نێوان سەرمایەداری و پلەی هاووڵاتی کە زۆر مایەی پەژارەی لایەنگرانی دیموکراسی بوو، تا رادەیەك کاڵ بووەوە.

هەندێك نووسەری دواتر کە «لایەنگری رەسەن بوونی کۆمەڵ» یان پێ دەوترێ، رەخنەیان لە سەر تایبەتمەندیی تاکخۆازی و قازانج ویستی چەمکی نۆژەنی هاووڵاتی گرتووە. لە بەر ئەوەی ئاوا چەمکێك بە مانای وەلا نانی بیری خێری گشتی و چاکەی مەدەنی کە مانای بەربلاّو لە بیری سەرەتایی دیموکراسی کەسانێکی وەك «رۆسۆ»دا بوو. لە روانگەی لیبراڵەکانەوە، هاووڵاتی بریتییە لە توانایی تاك لە دروست کردن و شوێن کەوتنی تێگەیشتنی خۆی لە چەمکی خێر و مەسڵەحەت لەگەڵ رێز بۆ تێگەیشتنی خەڵکانی تر لەو چەمکە، بۆیە چەمکی خێری گشتی بە مانا کلاسیکەکەی نایێتە باسەوە. بەڵام لە چاوی لایەنگرانی رەسەنی کۆمەڵەوە چەمکی خێری گشتی لە تێگەیشتنی تاك لە ئامانج و قازانجی خۆی پێشترە. هاووڵاتی لە ئەساسدا بە مانای توانایی بۆ ناسین و بەڕێوەبردنی خێری گشتییە. لە لایەکی ترەوە لیبراڵەکان پێیان وایە لە بەرچاو گرتنی خێروبێری گشتی، مانا و لێکدانەوەی توتالیتاری تێدا شاراوەیە و لەگەڵ دیموکراسی کە بە مانای فرەخوازیە، یەك ناگرنەوە.

لە راستیدا کۆمەڵگای سوننەتی و بەر لە دیموکراتیك، لە سەر بیری خێری گشتی دامەزرا بوون, بەلاَم لەوێدا لە بەر بیچمی چەمکی ئایینی بەکار دەهاتن. بۆیە پێ داگرتن لە سەر سەرنجی هاوولاَتیان بۆ خێروبێری گشتی لەگەڵ بیری ئازادیدا هاوجووتن.

ناکرێت کۆمەڵگای دیموکراتیکی نوێژەن لە سەر یەك بۆچوون سەبارەت بە خێر و بیری گشتی، بونیاد بنرێت. ئاوا بۆچوونێك لەگەڵ بیری «تاك» لە چوارچێوەی ئەندێشەی دیموکراتیك لە بنجەوە ناتەبایی هەیە. بەم پێیە چەمکی هاوولاَتی بە واتا کلاسیکەکەی لەگەڵ چەمکی تاك بوون، لە لیبرالیزمدا دژ یەك دەبنەوە.

ئەمڕۆکە چەمکی تازەی هاوولاَتی لە چەند لایەنی تریشەوە تووشی تەنگەبەری هاتووە. گەشانەوەی ناسنامەی قەومی و گەلی لە چوارچێوەی دەوڵەتی نەتەوەییدا Nation - state، ناسنامەی تاکی وەك هاوولاَتی کۆمەڵگای دیموکراتیك خستۆتە ژێر باڵی خۆیەوە, هەروەها قوت بوونەوەی لایەنی نیولیبراڵی، کە توخمەکانی کۆمەلاَیەتی و ئابووریی چەمکی هاوولاَتی وەلا دەنێن و جارێکی تر چەمکی هاوولاَتیەتی تەنیا بۆ ماف دادەشکێن. سەرەڕای ئەمانە جیهانگیریی پێوەندی ئابووری و کۆمەلاَیەتی و چکۆلە بوونەوەی بەردەوامی دەوڵەتی نەتەوەیی لە بواری جیاجیادا، پێویستی پێداچوونەوە بە چەمکی باوی هاوولاَتی بە تایبەت لە باری مافی مرۆڤەوە بە گشتی هێناوەتە ئاراوە.

### ١-١٠. سەروەریی خەڵك

حاکمیەتی خەڵك یەکێك لە پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی دیموکراسییە. مانای راستەقینەی سەروەریی خەڵکی ئەمەیە کە حکوومەتگەل هێز و دەسەلاَتی خۆیان لە سەرچاوەیەك، جگە لە خواست و هاوبیری و رەزامەندی خەڵکی، وەدەست ناهێنن و خەڵکی دەتوانن حکوومەت بگۆڕن یان لە سەر کار لایان بەرن. بۆیە دەسەلاَتی کۆتایی لە لای خەڵکە، گەرچی لە سەر ئەوەی کە ئەم دەسەلاَتە چۆن بە کار بێت لە نێوان قوتابخانەکانی دیموکراسی جیاوازی بیروڕا هەیە. دۆزێکی سەرەتایی لەم بارەوە ئەمە

بووە کە ئایا سەروەریی خەڵکی بە شێوەی راستەوخۆ بەڕێوە دەچێ, یان لە رێگای نوێنەرانی ئەوان لە پارلەمان و دەوڵەتدا بەرجەستە دەبێت. شتێکی دیکە ئەوەیە کە بە راستی خەڵك بۆ ئەوە دەبن سەروەر بن, یان لە راستیدا گرینگترین تایبەتمەندیی دیموکراسی, داوەری خەڵك دەربارەی سیاسەتەکانی حکومەت و پەسندکردن, یان نەکردنی ئەم سیاسەتانەیە. هەر وەها خەڵکی دەبێ تەنیا شێوەی سەرەکی حکوومەت لە یاسای ئەساسی جێگیر بکەن, یان دەکرێت رەزامەندیی خۆیان دەربارەی سیاسەت و بڕیارەکان دەر ببڕن.

لە پلەی خوارتر پرسیاری تر دێتە ئاراوە: ئایا لە سیستەمی سەرۆکایەتیی سەروەریی خەڵك باشتر بەڕێوە دەچێ, یان لە سیستەمی پارلەمانیدا؟ ئایا لە سیستەمی دوو حزبیدا چاکتر سەروەریی خەڵکی دەچەسپێ, یان لە سیستەمی فرەحزبیدا؟ هەر وەها ئایا دامەزراوەی وەك حزبی سیاسی، تاقمی دەسترۆیشتوو، راگەیەنە گشتیەکان کە رێکخراو و دامەزراوەی پێوەندیی نێوان خەڵك و حکوومەتن، ئایا جێبەجێ کردنی سەروەریی خەڵك سانا دەکەنەوە یان دژواری دەکەن؟ لە وەڵام بەم پرسیارانەدا دەبێ بوترێ کە پرەنسیپی سەروەریی خەڵك لە دیموکراسیدا لە رەنگ و شێوەی جیاجیا خۆی نواندووە و جێگیر بووە و هۆگەلی مێژوویی و کەلتووری لە دامەزرانی سیمایدا دەوریان هەبووە. کەوا بوو پرەنسیپی سەروەریی خەڵك بە شێوەیەك لە شێوەکان پرەنسیپی فەرمانڕەواو وەرگیراوی هەموو دیموکراسییەکانە، تا رادەیەك کە دەتوانین بڵێین ئەم پرەنسیپە لە دیموکراسییە رەسەن و کۆنەکاندا بووەتە بەشێك لە « نائاگاییی»ی سیستەمی سیاسی لە خەباتی هەڵبژاردن و گوت و بێژی پارلەمانیدا دەربارەی هەبوون و گرینگی بۆ دیموکراسی، نایێتە باس کردن.

بە واتایەکی دیکە تێکۆشان بۆ سەروەریی خەڵکی، دەمێك پێشتر لە رۆژئاوا دەرکەوتووە. هەبوونی یاسای ئەساسی لە دیموکراسیدا خۆی گرینگترین دیاردەی پرەنسیپی سەروەریی خەڵکیە. بۆیە لەم بارەوە جیاوازیی بیروڕا نییە کە خەڵك مافی خۆیانە:

یەکەم: یاسای ئەساسی وڵاتی خۆیان بە شێوەی خۆیان بنووسن.

دووەم: لــە پەیوەنــدی لەگــەڵ گــۆڕین و دەســکاری یاســای ئەساســیدا پرســیان پــێ بکــرێ و بیــروڕای خۆیان دەر ببــڕن.

پرەنســیپی ســەروەریی خــەڵك پرەنســیپی دایکــە لــە دیــموکراسیدا کــە لــەو چــەمك و ئوسولگەلە کە پێشتــر باســمان لیــوە کــرد، کــاڵ دەرکــەوتووە. بــە پێچــەوانەی ئــەو شــتەی کــە ســەبارەت بــە دیــموکراسیی رەســەن و کــۆن باســمان کــرد، چــەمکی ســەروەریی خــەڵك لــە دۆخــی گــۆڕین لــە سیستــەمی پــێش دیــموکراتیك و بــۆ دیــموکراسی بەرجەســتە دەبێتــەوە و بــە زانیارییــەوە دەخرێتــە بــەر بــاس. یــەکێك لــە ســتوونەکانی هــرزی سیاســی لــەم چــاخانەدا ئەوەیە کە خــەڵك لــە بەرانبــەر خواوەنــد، داب و نــەریت، حــاکمی ســوننەتی، یاســای ئــایینی و هتــد تــا چ رادە لــە ســەروەری بــوون بەهرەمەنــدن. لــە ئــەورووپا لــە چــاخی بهــورین لــە سەدەکانی ناوەڕاست بۆ چــاخی تــازە، پادشــاکان کــە ســەرەتا رەوا بــوونی خۆیــان لــە کڵێســە وەر دەگــرت، ســەرەتا بــە مەبەســتی جــێ خســتنی ســەربەخۆیی خۆیــان لــە کڵێســە، رەوا بــوونی یاســای خۆیــان راســتەوخۆ بــە خــواوە بەســتەوە و دواتــر و هێــدی هێــدی ئەســڵی ئیــرادە و سەروەریی بوونی خەڵکیان وەك بنەمای رەوابوونی خۆیان قبوول کرد.

## ١-١١. مافــەکانی مرۆڤــ

چــەمکی مافــەکانی مرۆڤــ وەکــو کۆمــەڵێك مــاف کــە مرۆڤــ بــە حــوکمی مرۆڤــ بــوونی خــۆی هەیــەتی، لــە ســەدەی هەڤدەهەمــەوە ســەری هەڵــدا و جێنشــینی چــەمکی کۆنتــری «مافــی سروشــتی» بــوو کــە مرۆڤــ بــە حــوکمی «یاســای سروشــتی» لێــی بەهرەمەند بــوو. چــەمکی مافــی مرۆڤــ بــە مانایــەکی بڵاوتــر لــە مافــی سروشــتی بــەکار دەهات تا بە ئاســانی ئــەم مافانــەش بگرێتــەوە کــە بــە سروشــتی نابێنــە ئــەژمار و تــەنیا لــە کۆمــەڵگا و دەوڵەتــدا دیــاری دەدەن. بــە بــڕوای زۆر کــەس لــە لایــەنگرانی دیــموکراسی، مافەکانــی مرۆڤــ بــەم مانــا دواییــە جەوهــەری دیــموکراسی دروســت دەکــەن. بنــەماکانی دیکەی دیــموکراسی وەك بەشــداریی گشــتی و حکوومــەتی زۆرینــە ریشــەیان بــۆ پــێش چــاخی نــۆژەن دەگەڕێتــەوە. ئەگەرچــی چــەمکی مــاڤی مرۆڤــ شــتێکی تازەیــە و لــە چــاخی نوێــدا

سەری هەڵداوە. لە چاخی پێش مۆدێرندا ناوەڕۆکی وانەکانی سیاسی و ئەخلاقی لە سەر ئەرك و رەفتاری تاك پێ داگر بوون, دیارە مێژووی چەمکی کۆنی مافی سروشتی بۆ فەیلەسووفانی رەواقی یۆنان دەگەڕێتەوە کە بڕوایان بە مافی یەکسان و چۆنییەکی هەموو مرۆڤەکان بوو. بە بڕوای ئەوان مافی سروشتی سەرچاوە لە یاسای نەگۆڕی سروشتەوە دەگرێت.

مافی «رۆمی»ش هەر وەها لە سەر بڕێك مافی گشتی و جیهانی سەرەڕای مافی هاووڵاتیانی هەر وڵاتێك پێ داگر بوو.

سەرەڕای هەموو ئەمانە لە دنیای قەدیمدا، فەیلەسووفگەلێکی وەك ئەرەستوو و تۆماس ئەکوینی دژی مافی یەکسان بۆ هەمووان بوون و بڕێك لە خەڵکیان بە شێوەیەکی سروشتی بە کۆیلە دەزانی. دوای رێنسانس و لە سەدەکانی نوێدا فەیلەسووفانی سیاسی لیبراڵ بۆچوونێکی تازەیان لەمەڕ مافی سروشتی پەرە پێدا و دەلیلیان دەهێنایەوە کە مرۆڤ لە راستیدا لە مافی ژیان، ملکایەتی و ئازادی لە ئیرادەی زۆرەملی خەڵکانی دیکە، بەهرەمەندە و دوای بەستنی پەیمانی کۆمەڵایەتی و چوونە ناو کۆمەڵگای مەدەنییەوە، تەنیا مافی بەڕێوەبردن مافی سروشتی دامەزراو لە سەر یاسای سروشتی لە دەست دەبێتەوە. بۆچوونی تازە لەمەڕ چەمکی مافی سروشتی لە سەدەی ١٨دا بۆ وڵاتە داگیرکراوەکانی ئامریکایی تەشەنەی سەند و لە بەیاننامەی سەربەخۆیی ١٧٧٦ی ئەمریکادا رەنگی دایەوە. بە پێی ئەم بەیاننامەیە «هەموو خەڵکی بە شێوەی هاوسان خولقاون و خواوەند مافێکی روونی پێداون کە لێیان داگیر ناکرێت. گرینگترینی ئەو مافانە ئەمانەن: مافی ژیان، ئازادی و پەیجۆری کامەرانی و سەربەرزی کەوتن. بەم حاڵەیشەوە بڕێك لە لایەنگرانی چەمکی مافی مرۆڤ هەڵهێنجانی مافی مرۆڤ لە یاسای سروشتی، وەبەر رەخنە دەگرن. لەو کەسانە جان ئیستوارت میلە کە دەلیل دەهێنێتەوە کە مافی مرۆڤ

له سەر خێر راوەستاوە. یەعنی کەرەسەی پێش خستنی شادی و کامەرانی مرۆڤە، ئەگینا هیچ جۆرە یاسایەکی سروشتی دەسگر و زاتی هەبوونی نییە. بەم حاڵەیشەوە تیۆری یاسای سروشتی گرینگترین تیۆری بۆ بەیانی سەرچاوەی مافی مرۆڤ بووە، ئەگەرچی لێکدانەوەی جیاواز لە چەمکی یاسای سروشتی هۆی پێگەشتنی ئەم چەمکەیش بووە.

ساناترین و کۆنترین لێکدانەوە لە یاسای سروشتی، لێکدانەوەی رەواقییەکان بوو کە بەو پێیە، هەموو جیهان پەیڕەوی یاسای سروشتین و گیانلەبەران لە رووی زەروورەت, یان بە پێی غەریزە لەم یاسایانە پەیڕەوی دەکەن. هەر چەند مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی خاوەن ئاوەز دەتوانێ لەم یاسایانە پەیڕەوی بکات, یان نەیکات.

بەڵام عەقڵی خودی مرۆڤ بەشێك لە یاسای سروشتیە. بەم پێیە ئەگەر مرۆڤ پەیڕەوی لە یاسای سروشتی بکات لە راستیدا پەیڕەوی لە عەقڵی خۆی کردووە، ئەم لێکدانەوەیە بە روونی دوو مانای یاسا لەگەڵ یەکتریدا تێکەڵ دەکات. بە مانایەك یاسا بە واتای چەند خاڵێکی زەرووریی سروشتی لە بەرچاو دەگیرا و بە مانایەکی تر وەك چەند خاڵێك بە حیساب دەهات کە مرۆڤ دەیتوانی بە مەیلی خۆی پەیڕەوی لێ بکات. بە مانایەکی دیکە چەمکی یاسا لەم لێکدانەوەدا، هەم بونیادی سروشت و هەم بەندی ئەخلاقی لە ئامێز دەگرێ. بەم پێیە تیۆری دووەم لە ژێر ناوی تیۆری سروشتی تایبەتی مرۆڤ هاتە ئاراوە کە بەو پێیە یاساگەلی سەبارەت بە سروشتی مرۆڤ لە یاساگەلی سروشتی شت و مەك و بوونەوەران جیا دەکردەوە.

بەم پێیە مرۆڤ خاوەنی سروشتێکی تایبەتە و خاڵەگشتییەکانی یاسای سروشتی بە یەك مانا عەقڵی مرۆڤ وەری دەگرێ. دۆزی سەرەکی لەم لێکدانەوەیەدا بە سەرنج دان بە گۆڕانکاریی مێژووی دۆخی مرۆڤ ئەوەیە کە ناتوانین لە تەبعی وەستاو و نەگۆڕی مرۆڤ و بەم پێیە لە یاسای سروشتی و

بەردەوامی مرۆڤ قسان بکەین. لەم روانگەیەوە تێگەیشتنی سێیەم لە چەمکی یاسای سروشتی هاتە ئاراوە کە بەم پێیە، سروشتی مرۆڤ هەمان عەقڵی مرۆڤە و یاسای سروشتی هەمان عەقڵی راست و دروستی مرۆڤە. دیارە دۆزی ئەم لێکدانەوەیە ئەمە بوو کە ئایا ئەو شتە عەقڵ دەیدۆزێتەوە، بەرچاو و دەرەوەییە یان دروست کراوی عەقڵە کە لەم حاڵەدا ئیتر ناتوانین لە چەمکی سروشت بە مانا گشتییەکەی سوود وەرگرین. لە کۆتاییدا بە سەرنج دان بە ناتەواوی لێکدانەوەی جیاواز، یاسای گشتی وەك راستییەکی مێژوویی و بگۆڕ لێکدرایەوە.

له لێکدانەوەی یاسای سروشتی بە ناوەرۆکی بگۆڕەوە، لەگەڵ گۆڕانی کۆمەڵ و پێداویستی مرۆڤ, بەندەکانی یاسای سروشتی دەگۆڕێن. بەم شێوەیە دەتوانین مانای یاسای سروشتی بۆ مافی مرۆڤ بە مانای بگۆڕ وەربگرین. لە راستیدا سروشت لەم لێکدانەوەیەدا هەمان فەرهەنگە. سروشتی مرۆڤ لە کۆمەڵگا سەردەکەوێ و بەردەوام لەگەڵ ئەوەدا پانایی مافی مرۆڤ پەرە دەسێنێ. گەورە بوون و سەرکەوتنی فیکری و کەرەسەی مرۆڤ, تەنانەت مافی تازەتریش دروست دەکات.

## پێشڕەوانی بیری دیموکراسی

بە گشتی دیموکراسی وەکو سیستەمی حکومەتی، بەر لە سەدەکانی نوێ لە لای هەموو فەیلەسووف و بیرمەندانی سیاسی بە سیستەمێکی نابەدڵ و وێرانکەر دەژمێردرا. ئەفلاتوون کە بۆ خۆی لایەنگری حکومەتی فەیلەسووفان و پیتۆڵان بوو, دیموکراسی بە حکومەتی خەڵکی نەزان و بێ خەبەر لە راستییەکان دەزانی. ئەرەستۆش گەرچی باسی سوودمەندیی هەموو جۆرە حکومەکانی دەکرد, دیموکراسی بە حکومەتی هەژاران دەزانی کە لە تایبەتمەندیی ناوەنجیخوازی و هاوسەنگی بە دوورن. حکومەتی خوازراوی ئەرەستۆ, حکومەتی چینی نێوەنجی بوو کە لە روانگەی ئەوەوە هێدی و میانەڕەون.

بیرمەندانی دیکەی چاخی کۆن و سەدەکانی ناوەڕاست، دیموکراسیان بە لانی زۆرەوە وەکو یەکێك لە بەشەکانی سیستەمی سیاسیی تێکەڵاو وەردەگرت کە لەگەڵ تێکەڵاویی توخمی حکومەتی پاشایی و خانخانیدا دەبێتە هۆی هاوسەنگی و پارسەنگی سیستەمی سیاسی دەپارێزێ. بە پێچەوانەوە لە سەدەکانی نوێ بەملاوە، دیموکراسی بە شێوەی بەربڵاو وەك باشترین شێوە ژیانی سیاسی لە قەڵەم دراوە. دیارە جیاوازی بیرورا دەربارەی تەعریف و ناسنامەی دیموکراسی لە نێوان تیۆریسیەنگەلدا، زۆر بەربڵاو بووە. بەڵام چاکبوونی دیموکراسی لە دنیای نۆژندا تا ئەو رادەیە چووەتە پێش کە نادیموکراتیکترین وڵاتان خۆیان بە دیموکراتیك لە قەڵەم دەدەن.

بەگشتی ئەو تیۆریگەلەی کە دەربارەی دیموکراسی لە کۆنەوە تا ئێستا سەریان هەڵداوە بۆ دوو دەستەی گەورە دابەش دەبن. یەکیك دڵخوازنەیە و یەکێك ریالیستانەیە. روانگەی دڵخوازانە یان دیموکراسی زۆرینە، هەمان روانگەی کلاسیکە دەربارەی دیموکراسی کە پێ لە سەر ئازادیی تاك، بەشداریی گشتی لە سیاسەت، چاکەی مەدەنی، ئازادیی پۆزەتیڤ، لایەنگری لە بەرژەوەندی گشتی و حکومەتی زۆرینە، دادەگرێ. لەم روانگەوە دەنگی خەڵکی، دەنگی خواوەندە و زۆرینە هیچ کات هەڵە ناکات.

بیروڕای گشتی هەمیشە ڕاست و سەرکەوتووە و دەتوانرێ باوەڕ بە عەقڵ و چاکەی خەڵك بکرێت. عەقڵی خەڵك هەمان عەقڵی ساغ و دروستە. لەم ڕوانگەیەوە هەموو پلە و پایەیەك دەبێ لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە بێت و لە ڕێی ڕفراندۆم و پرس بە ڕای گشتی وەك یەكێ لە گرنگترین ئامێرەکانی حکوومەتی دیموکراتیك، بەردەوام کەڵك وەربگیرێت.

لە هەنبەردا، ڕاستیخوازان بەردەوام گومانیان لە سەر هەڵدانی دیکتاتۆریی زۆرینە، سەرکوتی کەمینە هزریەکان، لادانی سیاسەت بۆ لای تیژڕەوی بە هۆی بەشداریی بەردەوامی خەڵکی ڕەشۆکی و دروست کردنی حکوومەتێکی زۆرملێ کردووە.

ئەم حکوومەتە زۆرەملێیە کە بە ناوی ئیرادەی گشتی و چاکەی مەدەنی دروست دەبێ و لەمیانەی لە دەسچوونی کۆت و بەندی یاسایی لەسەر دەسەڵات ڕاستیخوازەکانی نیگەران کردووە. ڕاستیخوازان لە بەرانبەردا لە مافی تاك، دەوری زانست و زانیاری و ڕووناکبیری لە هاوسەنگیی حکوومەتی زۆرینە، ئازادیی نیگاتیڤ بە مانای ڕزگاری لە ئیرادەی لاساری تاك و گروپ و زۆرینە، پرەنسیپی بەرژەوەندی و سوودی تاك، پارێزگاری دەکەن. لە ڕوانگەی ڕاستیخوازانەوە دەسەڵات هەرچۆنێکی بێ شتێکی سامناکە و دەبێ بە شێوەی یاسایی پەرچین بکرێت و دیموکراسی لە ڕاستیدا حکوومەتی یاسایە. هێزی بێ ئەملا و ئەولای زۆرینە ڕێك بە ئەندازە و ڕەنگە زیاتر لە هێزی ڕەهای گروپی کەمینە بۆ ماف و ئازادی ترسناك بێت. بۆیە لەم ڕوانگەیەوە لە سەر گرنگیی پەروەردە و فێرکردنی دیموکراسی، دروست کردنی هۆگری بۆ دۆزە گشتییەکان، دامەزرانی «زۆرینەی کاریگەر» لە جیاتی زۆرینەی عەدەدی و بێ لایەن، تەسك کردنەوەی دیموکراسی بۆ پرس کردن بە خەڵك و دادوەری ئەوان، لە جیاتی حکوومەتی خەڵکی ڕەشۆکی و پێویستی پەروەردەکردنی کارزانی سیاسی پێ دادەگرن.

یەکێك لە لکە ئەسڵیەکانی ڕوانگەی ڕاستی خوازان، تیۆریگەلی فرەخوازانەی هاوچەرخە. لەم ڕوانگەیەوە جەوهەری دیموکراسی لە جیهانی ئەمڕۆدا نەك لە بەر حکوومەتی زۆرینەی خەڵك، بەڵکو لە بەر حکوومەت و کێبەرکێی چەندین گروپی بژاردە یان هێزی سیاسییە. بەم پێیە پێوانەی دیموکراسیی تاك نییە، بەڵکو تاقم یان

گروپە. فرەخوازان پێ لە سەر زۆرینە و فرەبوونی تاقمگەلی هێز لە دیموکراسیدا و مەیلی هێزی سیاسی بۆ جیاوازی، دادەگرن.

کێبەرکێ لە دیموکراسیدا نە لە نێو خەڵك و تاقمگەلی دەسەڵات، بەڵکو لە نێوخودی ئەم تاقمگەلە دایە. دیارە ئەم کێبەرکێیە دیموکراتیکە لە بەر ئەوەیە «یاسای گەمەی دیموکراسی»، تێدا لە بەرچاو دەگیرێ. تاقمێك لە تیۆریکاران، دیموکراسی لەم رەنگەیان بە پۆلی گارشی «حکوومەتی چەند تاقم» ناودێر کردووە. لەم روانگەیەدا دیموکراسی لە راستیدا رێگایەکە بۆ هەڵبژاردنی کاربەدەستان و بڕیاردان کە لە بۆچوونی کلاسیکدا وەك بایەخی دیموکراتیك «بۆ وێنە وەك ئازادیی تاك، بەشداریی گشتی، هەستی ئەرکی مەدەنی و هتد لە بەرچاو گیرابوون، پەیوەندی نییە. دیموکراسی لە بازاڕی ئازاد دەچێ کە تیایدا یاریکاران بۆ بە دەستهێنانی دەنگی زیاتر لەگەڵ یەکتری کێبەرکێ دەکەن.

لە کۆمەڵگای ئەمڕۆدا، ئازادی و هەڵبژاردن، مافی هەڵبژاردنی تاك و حکوومەتی زۆرینەی شارەزا گەرچی چاکە، بەڵام نامومکینە. تەنیا لە رێگای بەڕێوەبردنی یاسای گەمەی دیموکراسیەوە، هاوسەنگیی هێزەکان لە مەیدانی سیاسیدا دەستەبەر دەبێ و لە سێبەری ئەم هاوسەنگییەدا، لە مافی تاك پارێزگاری دەکرێ. تاکەکان بە شێوەی سروشتی حەزی چوون یەکیان بۆ بەشداری لە سیاسەتدا نییە و هەر وەها لەم بارەوە ئامێرو و زانیاری چوون یەکیان لە بەردەستدا نییە. بەم پێیە دۆزی ئەسڵی لە دیموکراسییەکانی ئەمڕۆدا، نەك ئازادیی تاك و حکوومەتی زۆرینەیە، بەڵکو هاوسەنگیی نێوان هێزە سیاسییەکانە تا لە رێگای دەست بەسەر داگرتنی سەرچاوەکانی دەسەڵات، بڵاو ببنەوە و رێگای کێبەرکێ لە نێوان هێزی سیاسیی رێکخراودا خۆش بکەن. لەم روانگەیەوە دیموکراسی بونیادی حکوومەتێکی تایبەتە کە پێویستییەکی ئەوتۆی بە هاوولاتی دیموکرات و خاوەن چاکەی مەدەنی بە مانا کلاسیکەکەی نییە.

تەنانەت لە بونیادی فرەخوازی دەسەڵاتدا، دەوڵەتان لە ژێر تەوژمی داخوازی راستەوخۆ و توندڕەوی حەشامەتی خەڵك رزگاریان نابێ و سیاست بۆ لای هاوسەنگی دەئاژوێ. لەم بۆچوونەدا بەشداریی راستەوخۆ و بێ سەرە و بەرەی خەڵکی رەشۆکی لە

سیاسەتدا، هۆی خەڵك فریودان و گێرە شێوێنی و زاڵبوونی بۆچوونی بێ سەرە و بەرە پێك دێنێ.

بەشداریی تەسك بەڵام بە حیساب و کیتاب و عەقلانی خەڵك باشترە لە بەشداریی دەیمی و تێکەڵ بە هەستی ئەوان. لەم بەشەدا بە کورتی باسی بۆچوونی گرنگترین بیرمەندانی کۆن و نوێی دیموکراسی دەکەین.

## ٢-١. ئەرەستۆ «٣٨٤-٢٣٣ پ.ز»

ئەرەستۆ وەك بیرمەندی سیاسی دەستی بە لێکۆڵینەوە لە سەر دەوڵەت - شارەکانی «Polis» یۆنان دەکرد. لە پەنای ئەم لێکۆڵینەوەدا ئەرەستۆ سەرەنجی دابووە پەیوەندیی نێوان دیموکراسی و سروشتی سیاسیی ئینسان، بە رای ئەرەستۆ مرۆڤ حەیوانێکی سیاسییە کە لە دەوڵەتشارا دەژی و تەنیا خواگەل و گیانلەبەران دەتوانن لە دەرەوەی ئەم دەوڵەتشارانەدا بژین. مرۆڤ بە هۆی ئەوەی کە لە هێزی تاقانەی قسە و گوتار بەهرەمەندە, دەتوانێ دەربارەی راستی و دروستی، قازانج و ژیان، حەقیقەت و خراپی کارەکان قسە بکات. بۆیە ژینی مرۆڤ پێویستی بە ژیان لە کۆمەڵێکدا هەیە کە مرۆڤ بە ئازادی بتوانێ دەربارەی کاروباری گشتی قسان بکات. لە فەلسەفەی سیاسیی ئەرەستۆدا، تاك بەرابەرە لەگەڵ گیانلەبەر، بنەماڵە بەرانبەرە لەگەڵ گژوگیا، گوند بەرانبەرە لەگەڵ حەیوان و دەوڵەت شار بەرانبەرە لەگەڵ ئینسان. مرۆڤ وەك هاوولاتی کەسێکە کە بەشداریی لە بڕیاردان سەبارت بە کاروباری گشتیدا هەیە و جارناجارێك لە بە کارهێنانی هێزدا بەشداری دەکات. بێجگە لەمانە مرۆڤ، تەنیا حەیوانێکی بەستەزمانە. بەکارهێنانی مافی هاوولاتیەتی تەنیا لە دەوڵەتێکدا بەڕێوە دەچێ کە لەوێدا زۆرینەی خەڵك بەشدار بووبن. دەوڵەت شار, یان کۆمەڵگای سیاسی خوازراو کە لەم دەوڵەتەدا، مرۆڤ لە هێزی ئاوەز و گوتاری خۆی بەهرە وەردەگرێ، دەوڵەتێکە کە تیایدا جەماوەرێکی زۆر لە خەڵك لە بەر قازانجی گشتی, حوکم دەکەن، بەڵام دیموکراسی، حکوومەتێکە کە تیایدا جەماوەرێکی زۆر لە خەڵك بە قازانجی

خۆیـان کـار دەکـەن و لـە بـەر ئـەوەی زۆربـەی خـەڵکی هـەژارن، دەتوانیـــن بڵـێین دیـــموکراسی, حکوومــەتی هەژارانــە. لـە کۆتاییـدا باشتـــرین حکوومــەتی مومکیـــن لـە روانگـەی ئەرەسـتۆەوە حکوومەتێکـە کـە تیایـدا تایبەتـــمەندیی ناســراوی حکوومــەتی دیـــموکراسی و ئۆلیگارشـــی تێکـەڵ کرابـێ. ئـەویش بـەم لەونـە کـە جـەماوەرێکی زۆر لـە خـەڵك بەشـداری لـە حکوومەتـدا بکەن, بەڵام ئەم جەماوەرە ئەوندە زۆر نەبن کە حکوومەت بـخەنە دەستی هەژارانەوە.

## ٢-٢. بنکدیت دو سپینۆزا (١٦٧٧-١٦٣٢)

سـپینۆزا، فەیلەسووفـــی هۆڵەنـــدی, لـــە بیـــرمەندە هەوەڵینــەکانی بۆچـــوونی دیـــموکراسی لـە چـاخی تـازەدا بـە ئـەژمار دێت. لـە چـاوی ئەمــەوە باشتــرین حکوومــەت، حکوومەتێکە کە لە سـەر ئەساسـی دەنگـی زۆربـەی خـەڵك دامــەزرا بـێ و لـەوێ هـەر کـەس بتـوانێ ئازادانـە بیـــر بکاتــەوە و قسـە بکـات. سـپینۆزا لـە نێـوان دیـــموکراسی و زانسـت و زانیـــاریی عەقڵانیـــدا پەیوەنـــدییێکی قـــووڵی بـــەدی دەکـــرد. لـــە بیـــری پێشـــینیاندا، دیـــموکراسی وەك هـــۆی دەســـەڵاتی هـــەژاران لـە بەرچـاو دەگیـــرا کـە چـاکەی مـــەدەنی و رەوشـت و لـە کۆتاییـدا قازانـــجی گشـتی دەخسـتە مەترسییەوە. ئازادیگـەلی دیـــموکراتیك گەرچـی لـە لایـەن بیـــرمەندانی کۆنـەوە دەبوونـە هـۆی سـەرهەڵدانی بیـــر و فەلسـەفە لـە کـورت خایەنـدا، بـەڵام سـەمەرەی خـەراپیان لـێ دەکەوتـەوە. بـەم بۆنـەوە ئـەو بیـــرمەندانە پێیـان بـاش بـوو دیـــموکراسی لـە تیکـەڵاوی توخـــمگەلێك لـە حکوومــەتی ئاریستوکراسـی، مۆنارشـی و ئۆلیگارشـی دروسـت بکرێـت، لـە بـەر ئـەوە هـۆی پێکهـاتنی پـەروەردەکردنی سیاســـەتمەدار و هـــاووڵاتی زانـــا و هەڵکـــەوتوو پێـــك بێنێـــت. لـــەم رووەوە فەیلەســـووفانی سیاسـی پێشـوو، دیـــموکراسی تۆخیـان لـە سـەرجەمدا بـە دوژمـــنی بیـــر و فەلسـەفە لـە قەڵەم ئەدا.

سـپینۆزاش وەکـــو بیـــرەمەندانی پێشـــوو پێـــی وابـــوو کـــە ژیـــانی فەلسەفـــی دڵخۆشـکەرترین ژیانــە، بـەڵام بـە پێچـەوانەی ئەوانــەوە لـە سـەر ئـەوە سـوور بـوو کـە دیـــموکراسی باشتـــرین شـێوەی حکوومەتـە بـۆ پێشخســتنی ئـازادیی بیـــر و فەلسـەفە و

چاکەی راستەقینە. بە بڕوای سپینۆزا دیموکراسی، سروشتیترین و ژیرانەترین شێوەی حکوومەتە، لەبەر ئەوەی وت و وێژی ئازاد، ڕێگا بۆ بیر و بۆچوونی جیاواز و دژ بە یەك خۆش دەکات.

ئامانجی سەرەکی دەوڵەت, دابین کردنی هۆی بەردەوامی ژیانی مرۆڤە کە تەنیا لە چوارچێوەی حکوومەتێکدا کە خۆیان دایان نابێت بە شێوەیێکی عەقلانی بە کەمال دەگات و ئەم چلەپۆپەیە تەنیا لە دیموکراسیدا مرۆڤ پێی دەگات.

بناغەی حکوومەتی دیموکراسی لە چاوی سپینۆزاوە پەیماننامەیەکە کە تیایدا تاکگەل بۆ دابین کردن و پاراستنی بوون و هەستی یەکتری، مۆری دەکەن، تەنیا لە دیموکراسیدا هاوولاتیان بۆیان هەیە لە دانانی سیاسەتی گشتیدا بەشداری بکەن.

## ٢-٣. جۆن لۆك (١٧٠٤-١٦٣٢)

جۆن لۆك بە یەکێك لە دامەزرێنەرانی سەرەکی دیموکراسیی لیبراڵ دادەنرێ. ئەو مامۆستای پزیشکی بوو لە زانستگای ئاکسفۆرد. لە ژیانی سیاسی ئەو دەمی بەریتانیادا دەوری کاریگەری هەبوو و بە هۆی دژایەتی لەگەڵ دەرباری سەڵتەنەتی بۆ چەندین ساڵ ئینگلتەرای بەجێهێشت و لە هۆڵەند گیرسایەوە. توخمە سەرەکییەکانی لیبرالیزمی لۆك بریتی بوون لە پێ داگرتن لەسەر ئازادی و بەرابەریی مرۆڤ، مافی ژیان و دارایی، حکوومەتی تەسك و بەسراوە بە یاسای سروشتی و رەزابوونی خەڵکی، لێبوردەیی ئایینی، جیا کردنەوەی دەسەڵاتەکانی حوکم، رەسانەیەتی کۆمەڵ لە بەرانبەر دەوڵەتدا، مافی سەرهەڵدان بە دژی سەرانی دیکتاتۆر. ئەم بیرانە بە تایبەت لە دوو پەرتووکی حکوومەت (١٦٨٩) بەرهەمی گەورەی لۆك هاتە ئاراوە. ئەو لە پەرتووکی یەکەمدا تیۆری مافی خوایی پاشاکانی خستە بەر رەخنە و بە درۆی خستەوە. بە تایبەت رەخنەی لە روانگەی پارێزگاران و سەڵتەنەتخوازان دەگرت کە پێیان وابوو حکوومەتی پادشاکان لە سەر کتێبی پیرۆز دامەزراوەو لەگەڵ لقی باوکسالاری بنەماڵە کۆکە. لۆك دواتر لە پەرتووکی دووەمدا، بنەماڵەی حکوومەتی لە عەقڵی مرۆڤ

هەڵێنجاوە و پێی وایە مرۆڤ لە هەڵبژاردنی شێوەی جۆراوجۆری حکوومەتدا ئازادە و بنەماڵە و سیاسەت دوو بەشی جیاوازی ژیان و تێکۆشانی مرۆڤ پێک دێنن. لەم پەرتووکەدا، لۆک دۆخی سروشتی بە دۆخی پێش دامەرزانی دەوڵەت لە بەرچاو دەگرت کە تیایدا ئینسانەکان ئازاد و بەرانبەرن، مرۆڤ لە دۆخی سروشتیدا تەنیا پەیڕەو و بەرفەرمانی عەقڵی خۆیەتی و فەرمانەکانی عەقڵ، هەمان یاسای سروشتین. بە مانایەکی تر لەم دۆخەدا پەیڕەو و بەرفەرمانی ئیرادەی کەسێکی تر نییە.

وەکیەکی سروشتی مرۆڤ لە دۆخی سرۆشتیدا لەمپەری دەسەڵاتی یەکێك بە سەر یەکێکی تر دایە. لە دۆخی سرۆشتیدا، یاسای سروشتی یان ئاوەز، مرۆڤ وا لێدەکات کە رێزی مافی یەکتری بگرن. پێش لە دامەزرانی حکوومەت، مرۆڤ لە دۆخی سروشتیدا لە رێگای کار و هەوڵی خۆیەوە، دەبووە خاوەن دارایی و لە رێگای پەیمانەوە بنەماڵەی پێکەوە دەنا و منداڵەکانی بەخێو دەکرد. بۆیە چوارچێوەی ژیانی ئابووری و بنەماڵەیی، لە پێش سنووری ژیانی سیاسی بووە و سەربەخۆیش بووە. بۆیە جەوهەری ژیان و هێزی سیاسی لە بنەڕەتدا لەگەڵ جەوهەری ئابووری و ژیانی بنەماڵەییدا جیاوازە.

هێزی سیاسی، ملك و ماڵێك نییە کە سەر بە خاوەنەکەی بێ و بۆ وەدەست هێنانی قازانج وەگەڕ خرابێ. هەر وەها هێزی سیاسی لەگەڵ دەسەڵاتی بنەماڵەدا کە ئامانجی پەروەردە کردنی منداڵی چکۆلە و بێ ئەزموونە، لە لایەن کەسانی عاقڵ و گەورەوە، یەکسان نییە. مرۆڤ لە دۆخی سروشتیدا بە حوکمی عەقڵ و یاسای سروشتی، مافی ژیان، ئازادی و دارایی هەیە. بەڵام لەو دۆخەدا جیاوازیی گچکە رەنگە شەڕی گەورە و بێ سەرەنجامی لێ کەوێتەوە و بەم پێیە بەهرەمەند بوون لە مافی ژیان، ئازادی و دارایی پشتی پێ نابەستری. لە بەر ئەمە مرۆڤگەل دۆخی سروشتی بەجێ دەهێڵن و «کۆمەڵگای مەدەنی» چێ دەکەن. بەڵام لە بەر ئەوەی مرۆڤ بە شێوەی سروشتی ئازاد و بەرانبەرە و سروشت یەکێکی ژێر چەپۆکەی یەکێکی تر دانەناوە، حکوومەتێك کە لە دۆخی مەدەنیدا دێتە ئاراوە، ناتوانێ پێچەوانەی سروشت و یاسای سروشتی بێت و دەبێت بە رەزامەندیی تاکگەل بەرپا بکرێت.

مرۆڤ تەنیا لە کۆمەڵگای مەدەنیدا مافی تۆڵەسەندنەوە وەلا دەنێ و لە ئازادیی خۆی تا ئەو جێگایە چاوپۆشی دەکات کە بۆ مانەوەی ژیانی خۆی و ئەوانی تر پێویست بێ. ئەو پەیمان و رەزامەندییە کە تاکگەل بە ئەندامی بەردەوامی کۆمەڵگای مەدەنی هەڵ دەبژێرێ و رەوا بوون بە حکوومەت دەبەخشێ، دەبێت لە لایەن بەرەی نوێی خەڵکەوە دیسانەوە وەربگیرێتەوە. بۆیە تەنیا رەزامەندیی پێشینیانی ئەوان بەس نییە. بۆیە ئەو حکوومەتانەی کە رەزامەندانە خەڵك وەریان نەگرتوون شایانی حوکمڕانی نین.

ئامانجی سەرەکی حکوومەت لە دیدی لۆکەوە، پارێزگاری و پاراستنی مافی ژیان، ئازادی و دارایی تاکە کە مرۆڤ لە دۆخی سروشتیدا لەوان بەهرەمەند بووە، بەڵام دەستەبەری بەڕێوە بردنیان لە ئارا نەبووە. بۆیە ئامانجی حکوومەت تەنیا چاوەدێری کردن لە دارایی خەڵکە کە ئەویش گیان و ماڵ و ئازادییان دەگرێتەوە. بە جۆرێکی تر و بە پێچەوانەی بیری رابردووان، حکوومەت ئیشی بە سەر دابین کردنی ئازادیی رۆحیی خەڵك و رێ نیشان دانی هزری ئەوان و راگەیاندن و پڕۆپاگەندی حەقیقەت و ئەو شتانەوە نییە. بەم بۆنەوە لۆك لە نامەیێکدا دەربارەی لێبووردەیی (١٦٨٩) دەڵێت: حکوومەت دەبێت سەبارەت بە هەموو جۆرە بیر و باوەڕ و ئایینێك ساناگیر بێت. جگە لەو بیر و بڕوایانە کە مافی مەدەنی تاکگەل بنکۆڵ دەکەن یان زەربە لە بنەماکانی کۆمەڵگای مەدەنی دەدەن.

هەر وەها بە بڕوای لۆك، حکوومەت لە چوارچێوەی ئەم ئامانجە بەرتەسکەدا، ناتوانێت خاوەنی هێزی بێ ئەملا و ئەولا بێ. هێزێك کە ئامانجی پاراستنی دارایی خەڵکە ناتوانێ لە جەوهەری خۆیدا ملهوڕانە و رەها بێت. بەم بۆنەوە لە روانگەی لۆکەوە یاساگەلی سروشتی لە پێشتر و گرینگترن لە یاسا دانراوەکانی حکوومەتی، بۆیە ئەم یاسا دروستکراوانە ناتوانن یاسا سروشتییەکان وەلا نێن. گەرچی یاساگەلی سروشتیی نەنووسراویش بن. بۆیە لە روانگەی لۆك وە کۆمەڵ و خەڵك لە پێشتر و سەرتر لە حکوومەت و دەوڵەتن. ئەگەرچی لۆك بە پێچەوانەی زانایانی تر وەك «ژان ژاك رۆسۆ» باسی سەروەریی خەڵکی وەك سەرچاوەی هێزی رەها ناکات. بۆیە دەتوانین بڵێین لۆك «یاساخواز» بوو نەك «خەڵکخواز». خەڵکی بە بڕیاری زۆرینە و رەزامەندیی خۆیان،

شـێوەیەك لـە حكوومــەت دادەمــەزرێنن كـە لـۆك نـاوی دەنــێ «یاسـا, یـان حكوومــەتی یەكەمیـن», یاسایەك كە لە هەموو یاساكانی دیكە لە پێشتـرە.

كاتێك خـەڵك هێـزی خۆیـان لـە ڕێگـای ئـەو یاسـایەوە بـە حـوكمڕانی دەسـپێرن، تـا ئـەو كاتـەی كـە حكوومــەت لــە سـەر پێیــە ، نـاتوانن هێــزی خۆیــان وەربگرنـــەوە. بــەڵام وەك ئاماژەمان پێی كـرد ، لـۆك مافــی شۆڕشـی بـۆ خـەڵكی لـە بـەر چـاو گرتبـوو. لـۆك لەسـەر شێوەی جۆراوجۆریی حكوومـەت پێـی وابـوو كـە زۆرینـە لەوانەیـە خـۆی دەسـەڵاتی یاسـادانان بــەڕێوە ببــات و بــەم شـێوەیە ((دیـــموكراسیی تــەواو)) چـێ بكـات, یـان رەنگـە ئـەو دەسـەڵاتەی, بـە تـاقمێكی گچـكە «ئۆلیگارشـی» و تەنانـەت بـە «پاشـا» بسـپێرێ. بۆیـە لەوانەیـــە دامـــەزرانی حكوومـــەتێكی نادیـــموكراتیك (لــە عـــەینی كاتـــدا بەڕێوەبـــەری داخــوازی زۆرینــە) لــە خوێـدا دیـــمەنێك لــە دیـــموكراسی بێــت. بـەم حاڵەیشـەوە لـۆك سـەڵتەنەتی رەهـای لەگـەڵ مافـــی ئەساسـی و سروشــتی مرۆڤـــ بـە نـاكۆك دەزانـی. هـەر چـۆنێكی بـێ لـۆك پێـی وابـوو كـە جیـاواز لـە بیچـمی حكوومـەت، هێــزی یاســادانان و بـەڕێوەبردن ناكرێـت لـە دەسـتی تـاقمێكی یەكسـاندا بێـت، ئـەگینا ئەوانـەی یاسـا دادەنیـــن خۆیان لە بەڕێوەبردنیدا كەمتەرخەمی دەكەن.

## ٢-٤. مۆنتسكیۆ (١٦٨٩-١٧٥٥)

شـــارل لـــویی مۆنتســـكیۆ تیۆریســـیەنی سیاســـی فەڕانســـە ، بیـــری جیاكردنـــەوە و هاوسـەنگیی هێزەكـانی دەوڵـەتی لـە كتـێبی بـەناوبانگی رۆحـی یاسـاكان (١٧٤٨)دا هێنایـە ئـاراوە. مۆنتسـكیۆ لـەو كتێبـەدا سـێ دەلیلـی سـەرەكی خسـتە روو: یەكـەم دابـەش كردنـی كلاسـیكانەی رژێـــمگەلی سیاسـی بـە مۆنارشـی و ئاریستوكراسـی و دیـــموكراسیی تـەواو نییـە ، بـەڵكو دەبێـت حكوومەتگـەل بـە مۆنارشـی، ئیسـتبدادی و كۆمـاری «دیـــموكراتیك یـان ئەشرافـی» پـۆلێن بكرێـت. بنـەمای ئـەم پـۆلێن كردنـە پرەنسـیپەكانی هـەر یـەك لـەم رژێـمانە دروسـتی دەكـەن كـە بریتییـە لـە: شانازیـــخوازی «ئەساسـی مۆنارشـی», تــرس

«ئەساسی ئیستبداد» و چاکەی مەدەنی «ئەساسی کۆماری». ئەسڵ و ئەساسی هەر رژێمێك کەرەسەی حکومەتی تایبەتی ئەو رژێمە, دیاری دەکات.

دووەم: حکومەتگەلی میانەڕەو و پەسەندکراو ئەوانەن کە لە نێوان سێ هێزی: بەڕێوبەر، یاسادانەر و دادوەردا، سنوور و هاوسەنگی دروست بکات. ئازادی گرێ دراوە بە جیا کردنەوەی هێزەکانەوە. هەر کام لەم سێ هێزە دەبێ لە لایەن دامەزراوەی سەربەخۆوە بەرێوە بچێ و نوێنەری پلەو رێ و شوێنی کۆمەلایەتی جیاواز بێت. رێ و شوێنی ئەشرافی دەبێ چاودێریی هێز و کردەوەی گشتیی خەڵك بێت و خەڵکیش لە بەرانبەردا هێزی چاوەدێریی ئەشرافییەتی لە بەر دەست دابێت. هەر وەها پێویستەی جیاکردنەوەی بەردەوامی هاوسەنگیی هێزەکان، هەبوونی رێکخراو و دامەزراوەی مەدەنی نێوانی خەڵك و دەوڵەت وەکو کلیسا و ئەنجومەنی پیشەیی و خەڵکانی جیاجیایە. هاوسەنگیی هێزەکان لە ئاستی نەتەوەییدا, هۆی دابین کردنی ئازادی و لە ئاستی نێونەتەوەییدا هۆی دەستەبەر کردنی ئاسایشە.

سێیەم: بە بۆچوونی مۆنتسکێو، رەفتار و کرداری تاك و حکومەت لە هەر کۆمەڵگایەکدا تەنیا لە رێگای یاساوە دابین ناکرێت، بەڵکو پەیڕەوی کۆمەڵێك هۆی تێکەلاوی وەك ئایین، داب و نەریت، خوو و رەوشت، ئاو و هەوا و هۆی جوگرافییە کە رۆحی یاسا, یان جۆری سیستەمی سیاسی دروست دەکەن.

حوکمرانانە واقعیینەکان ئەوانەن کە لە خووی نەتەوەیی و رۆحی کۆمەڵی خۆیان بگەن و بە پێی هەل و مەرج هاوڕێی بکەن, یان بە دژی بجووڵێنەوە. بە بڕوای مۆنتسکیۆ، ئایین ئامێرێکی سیاسیی گرنگە کە سیاسەتمەدارە زاناکان نابێت خێر و بێری وەپشتگوێ بخەن.

مۆنتسکیۆ هەر وەها لە خێر و شەری جۆرەکانی رۆحی سیاسییەکان دەکۆڵێتەوە. بۆ وێنە حکومەتی پاشایەتی, ئازادیی بەربلاو بە تاك دەبەخشێ بەلام لە بەر ئەوەی بەسراوە بە ئارەزووی پاشاوە، بەسیستەمیکی قورس و قایم لە قەڵەم نادرێت. دیموکراسی, داخوازیی خەڵك و سەبارەت بەوەکیەکی و بەکارهێنانی هێز لە یاسادانانەدا دابین دەکات بەلام گەر دانەمرکێتەوە، داخوازیی بەرابەری بۆ لای توندڕەوی دەئاژوێ و

خەڵك داخوازیی بەڕێوەبردنی ڕاستەوخۆی یاسا و بەڕێوەبردنی ئیدارەی حکوومەت دەکەن. بە بیری مۆنتسکیۆ حکوومەتی باش، حکوومەتێکە تێکەڵاو لە پێکهاتەی پاشایەتی، ئەشرافی و کۆماری. بە بڕوای ئەو باشترین نموونەی ئەم حکوومەتە لە بەریتانیا بوو کە لە سەر جیا کردنەوە و هاوسەنگیی هێزەکان دامەزرابوو و بەم پێیە دابینکەری ئازادی و چاکەی مەدەنی بوو.

خراپترین جۆری حکوومەت لای مۆنتسکیۆ، ئیستبدادییە. لە حکوومەتگەلی ئیستبدادیدا، ترس بنەمای ژیانی سیاسی پێك دێنێت و ژیانی خەڵکی بۆ ئاستێکی حەیوانی دادەبەزێنێ. خەڵکانی حکوومەتی ئیستبدادی بەردەوام لە حاڵەتی دوورەپەرێزی، ترس و دڵەخورپە، نەزانی، ڕەشبینی و بەدگومانی و تەسلیم و ڕەزامەندی دان. بە رای مۆنتسکیۆ خۆ بە زلزانانی (ئەم جۆرە حکوومەتە) وەك ئەو دڕندانەن کە لە بەر خواردنی میوە، دار لە ریشەوە دەردێنن، لە بەر پتەو کردنی حکوومەتی خۆیان، هەموو بنەماڵە ناسراوە گەورەکان ریشەکێش دەکەن. هەندێ لە توێژەران وتوویانە مۆنتسکیۆ لە راستیدا لە جیاوازی دەسەڵات و فیودالیسم لە بەرانبەر دەوڵەتی ڕەهای فەڕانسەدا بەرەنگاری دەکرد و لە بەر هەمان مەبەست بوو کە لە تێکەڵاوی توخمی حکوومەتی تاکی، ئەشرافی و خەڵکی بەرەنگاری دەکرد. گرینگترین تایبەتمەندی ئاوا حکوومەتێك جیاوازی دەسەڵات و چاوەدێری ئەوانە بە سەر یەکتری دا کە بە سەرهەڵدانی بونیادی دەوڵەتی نۆژەن خۆی دەنواند.

### ٢-٥. ژان ژاك رۆسۆ (١٧٧٨-١٧١٢)

رۆسۆ فەیلەسووفی فەڕەنسی لە پارێزەرانی گەورەی ئازادیی تاك، خەڵکی و دیموکراسیی راستەوخۆ بوو. لە هەمان کاتدا ئەو لە رەخنەگرانی سەرەتایی و ئەساسی ئاوەزخوازی و رۆشنگەریی رۆژئاوا بوو کە تیایدا رەخنەی لە سەرپاکی کۆمەڵگا و مرۆڤایەتی نۆژەن دەگرت. ئەگەرچی رۆسۆ ئەو رێگایەی کە پێشنیازی دەکرد لە سەر هەمان ئاوەزخوازی و رووناکخوازی دامەزرا بوو. حکوومەتی دڵخوازی رۆسۆ

دیموکراسیی راستەوخۆ و کۆخوازانە بوو کە لە لایەك لە سەر ئازادی و تاکخوازی و بیری پەیمانی کۆمەڵایەتی و لە لایەکی ترەوە لە سەر چاکەی مەدەنی، ئیرادەی گشتی و خێری گشتی دامەزرا بوو. رۆسۆ لە کتێبی وتارێك دەربارەی ریشەی نابەرابەرییەوە دەلیلی هێناوەتەوە کە سروشتی مرۆڤ لە دوو غەریزەی سەرەکی دروست کراوە، یەکەم غەریزەی خۆپاراستن و خۆخوازی و دووەم غەریزەی مرۆڤ دۆستی. تەبعی مرۆڤ بە شوێن ئەم دوو غەریزە دژیەکەدا وێڵە و تەنیا ویژدان دەتوانێ ئەم دووە ئاشت کاتەوە. مرۆڤی سروشتی، کەسێکە ویژدانی ئەو لە نێوان دوو غەریزەی سەرەکیدا هاوسەنگی پێکهێنابێت. عەقڵ و فەرهەنگ و کۆمەڵگا یارمەتی ویژدان دەدەن و هاوسەنگی رۆحیی مرۆڤ قورس دەکەن. مرۆڤ لە دۆخی «سروشتی»دا «پێش مەدەنی» بوون گیرۆدەی خۆپاراستن و خۆخوازیە, بەڵام لە دۆخی مەدەنیدا هەست بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەکات و غەریزەی مرۆڤدۆستی پەرە دەسێنێ، بە لام دۆخی مەدەنی بە مانا باشەکەی هێما, جێ نەکەوتووە و لە دۆخی مەدەنی ئێستاشدا غەریزەی یەکەم بە سەر مرۆڤدا زاڵە و عەقڵ و فەرهەنگ و کۆمەڵگای داگیر کردووە.

سروشتی مرۆڤ ئەو کاتەی گەشە سەندووە کە لەودا غەریزەی یەکەم رام و بەرفەرمان دەبێت و لەودا ئیرادەی گشتی یەعنی خواستی خێر و بەرژەوەندی گشتی و چاکەی مەدەنی پێڕەوکە بووبێ. دەوڵەتی دڵخوازی رۆسۆ لە کتێبی پەیمانی کۆمەڵایەتیدا دەوڵەتێکە کە تیایدا هاوولاتیانی خاوەنی ئیرادەی گشتی و چاکەی مەدەنی بە مانای ناوبراو بن.

پەیمانی کۆمەڵایەتی رۆسۆ، پەیمانێك نییە کە بەو پێیە لە مێژوودا یەکەمین کۆمەڵگا و دەوڵەت پێك هاتبن، بەڵکو پەیمانێکە کە بەو پێیە کۆمەڵگا و دەوڵەتی دڵخواز و دیموکراتیك لە داهاتوودا پێك دێت. لە کۆمەڵگا و دەوڵەتێکی ئەوتۆدا، یاسا نیشانەی ئیرادەی گشتییە و بەم پێیە عەینی ئازادییە. رۆسۆ دژایەتی لەگەڵ پارلەمانتاریزم و ئەسڵی نوێنەرایەتییە. بە رای رۆسۆ پارلەمان ناتوانێ نوێنەری ئیرادەی گشتی بێ. خەڵکی بە پێشکەش کردنی مافی خۆیان بە نوێنەران، ئازادیی خۆیان لە

دەست ئـەدەن. تـەنیا هـەموو خـەڵکی و بـە شـێوەی راسـتەوخۆ دەتـوانن ئیـرادەی گشـتی دەربـبـڕن. بەم پێیە «دەنگی خەڵکی، دەنگی خوایە».

## ٢-٦. ئالکسی دوتۆکڤێل (١٨٥٩-١٨٠٥)

تۆکڤێـل ، مێـژوونووس و بیــرمەندی سیاسـیی فەڕەنسـی لـە بنەماڵەیـەکی ئەشرافـی بـوو و سـەرەڕای ئـەوەی کـە بنەماڵەکـەی لـە بـزاوی شۆڕشـی فەڕانسـەدا زیـانی زۆریـان لـێ کـەوتبوو، پێـی وابـوو ئەندێشـەی ئەساسـیی دیــموکراسی, واتـا ئـازادی, ئەونـدە پـەرەی گرتووە کە دژایەتی لەگەڵیـدا بـێ‌سـوودە. تۆکڤێـل بـە دژایـەتی لەگـەڵ سـەڵتەنەتی لیبـرالی لـۆیی فلیـپ، لـە رابـردووی ئەشرافـی خـۆی دوور کەوتـەوە و کەوتـە بـەرەی پارێزگـاری لیبـراڵیزم و دیــموکراسییەوە. تۆکڤێـل لـە سـاڵانی ١٨٣٩ تـا ١٨٥١ ئەنـدامی مەجلسـی نوێنـەران بـوو و بـە هـۆی دژایـەتی لەگـەڵ کودەتـای لـۆیس نـاپلیۆن ناچـار بـە لـە لادان لـە کـاری سیاسـی کـرا. گرنگتــرین بەرهـەمی ئـەو دەربـارەی دیــموکراسی، دوو بـەرگی کتـێبی دیــموکراسی لـە ئامریکـا (٤٠-١٨٣٥)دا بـوو. دەلیلـی سـەرەکی تۆکڤێـل لـەم کتێبـەدا، ئەوەیـە کـە دنیـای نـۆژەن، دنیـایێکی دیــموکراتیکە و لەمـەو بـە دوا دامـەزرانی دەسـەڵاتی نادیــموکراسی، رەوایـی نییـە. بـە مانایـەکی دیکـە خواسـتی بەرابـەریی، گرنگتــرین تایبەتــمەندیی دنیـای نـۆژەن و سیاسـەتیی تازەیـە، گەرچـی لەوانەیـە سیسـتەمی دامـەزراو لە سـەر ئەندیشـەی بەرابـەری مرۆڤـ, ئاکـامی وەك کامـەرانی, یـان وێرانـی ژیـانی مرۆڤـی لیٚ بکەوێتەوە.

خواسـتی بەرابـەری لـە لایێـك رەنگـە هـەر جـۆرە ئیمتیـاز و سـەربوونێکی تـاك لـە نێـو ببـات و لـە زۆرینـەی حاکمـدا مـەیلی دروسـت کردنـی ئیسـتبداد زیـاد بکـات. ئـاوا تێگەیشـتنێك لـە وەکیـەکی دژی تاکایەتییـە کـە خـۆی لـە چـەمکگەلی سـەرەکی دیــموکراسییە. ئیسـتبدادی زۆرینـە بـە رای تۆکڤێـل دەبێتـە هـۆی کـزی و لاوازی رێکخـراو و دامەزراوەی مـەدەنی، کـە کۆڵەکـەی سـەرەکی بەرەنگارییـە لـە بەرانبـەر دەسـەڵاتی دەوڵەتـدا، و ئەمـەش لـە خۆیـدا دژی دیــموکراسییە. دیــموکراسی پێویسـتی بـە بازنـەی مـەدەنی و دامـەزراوەی کۆمەڵایـەتی بـۆ پەیوەنـدی نێـوان خـەڵك و دەوڵـەت هەیـە, کـە نـەبوونی

کۆمەڵگای مەدەنی و دامەزراوەی کۆمەڵایەتییە، دۆخێك دێتە ئاراوە کە تۆکڤیل «تاك کەوتنەوە»ی ناو دێر دەکات و مەبەستی ئەو نە تاکایەتی بەڵکو گۆشەگیری و هەڵوەرانی تاکە لە کۆمەڵدا کە دواتر ناوی «کۆمەڵگای تودەیی» لێنا. تاك کەوتنەوە رەنگە بە شێوەیێك تاکایەتی لاواز بکات، کە تاکگەل بە سانایی گیرۆدەی سەیتەرەی بیروڕای گشتی و تەنانەت گیرۆدەی حکوومەتی رەهای زاڵمانێك بێن کە تەنیا بەڵێنی بەرابەریی کۆمەڵایەتی و ئابووریان پێ دەدەن. لە لایەکی ترەوە خواستی بەرابەری لە کۆمەڵگای مودێرندا دەتوانێ ئاکامی باشی لێ کەوێتەوە و لای تاکگەل بۆ خواستی بەرابەریی سیاسی و ئەخلاقی بگۆڕێ کە بۆ شێوەی ژیانی خۆیان یاسا دادەمەزرێنن. ئازادی و بەرابەریی دیموکراتیك تەنیا لە بەشداریی حکوومەتدا دەردەکەوێت. لەم بارەوە تۆکڤێل بە قووڵی لە ژێر کاردانەوەی رۆسۆ دایە. دەربارەی دیموکراسیی ئامریکایی، تۆکڤێل پێی وابوو سیستەمی سیاسیی ئامریکا ناتوانێ ترسی ئیستبدادی زۆرینە لە کۆتاییدا لە بەین ببات. بەم حاڵەیشەوە زیرەکی خەڵکی ئامریکا لە دامەزرانی رێکخراو و دامەزراوەی مەدەنی لە هەموو بوارەکاندا، ئەم بۆچوونە کەمڕەنگ دەکاتەوە و پێشگیری لە دۆخی «تاك کەوتنەوە» دەگرێت. دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لە ئامریکایی دا وەك قوتابخانەیێکە کە خەڵکی لەوێدا فێری وانەی دیموکراسی دەبن. لە سیستەمی دیموکراسیی ئامریکاییدا لە نێوان بیری وەکیەکی دیموکراتێك و دامەزراوەی کۆمەڵگای مەدەنی بەم جۆرە پەیوەندی ساز دەبێت. بەڵام ئەو چێشتی مجێورەی کە لە دامەزراوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە ئامریکادا پێك هاتووە لە وڵاتانی دیکەدا بە ئاسانی دروست نابێت، لە بەر ئەوەی بە شێوەی سروشتی لە نێوان سەروەریی گەل، کە مەیلی ئیستبدادی زۆرینەی هەیە و دامەزراوە و رێکخراوی کۆمەڵگای مەدەنی کە مەیلی بەرەنگاری لەگەڵ سەروەریدا هەیە، ناتەبایی دێتە پێش. بە رای تۆکڤێل ئەو چێشتی مجێورە تا رادەیێکی زۆر بەرهەمی پێکهاتنی ئایینی پروتستان و رۆحی ئازادییە. لە بەر ئەوەی ئایینی پرۆتستان پێ لە سەر پێ گەیشتن، ئازادی، تێکۆشان و خولقانی مرۆڤ لە جیهاندا، دادەگرێ. ئازادی, پێویستی بە چاکەی مەدەنییە و چاکەی مەدنی بە رای تۆکڤێل لە رێگای ئایینی پرۆتستانەوە دابین دەکرێت.

## ٢-٧. تۆماس جفرسۆن (١٨٢٦-١٧٤٣)

تۆماس جفرسۆن سێیەمین سەرۆك كۆماری ئامریكا و لایەنگری سەربەخۆیی ئامریكا لە بەریتانیا و هەر وەها نووسەری سەرەكی بەیاننامەی سەربەخۆیی ئامریكا و دامەزرێنەری سوننەتی ئەساسی دیموكراسیی ئەمریكی، یەعنی دیموكراسیی جفرسۆنی بوو. بیروڕاكانی دەربارەی ئازادی، بەرابەری، بەشداریی هاوولاتیانی بلیمەت لە سیاسەت و بەرپرسایەتیی حكومەت، بنەماكانی دیموكراسیی ئامریكایی دادەمەزرێنن. جفرسۆن پێی وا بوو مرۆڤەكان لە راستیدا سیاسی و كۆمەلایەتین و پێویستیان بەوە هەیە بەشداری حكومەت بن تا لەو رێگایەوە توانا سروشتییەكانی خۆیان پەرە پێ بدەن. بە رای ئەو بەشداریی سیاسی، پێویستی بە دەوڵەمەندیی ئابووری هەیە. لەم سۆنگەوە جفرسون لایەنگری لە دیموكراسی وەرزێران و خاوەن ملكانی نێوەنجی دەكرد. جفرسۆن چوار پرەنسیپی بۆ دیموكراسی لە بەر چاو گرتبوو: یەكەم: بەشداریی سیاسی، دووەم: وەكیەكی ئابووری، سێیەم: فێركردنی چاكەی مەدەنی و چوارەم: نوێنەرایەتی خەڵك لە لایەن ئەشرافییەتی سروشتییەوە. ئارمانی جفرسۆن دامەزرانی دەوڵەتشاری گچكە بوو كە لە هەر دەوڵەت شارێكدا نزیكەی سەد بنەماڵە جێگە بگرێت و هۆی دیموكراسیی راستەوخۆ دابین بكات. بەم حالەیشەوە جفرسۆن بە سەرەنج بەوەی كە دەوڵەتێكی گەورەی وەك ئەمریكا ناكرێت لە رێگای دەوڵەتشاری ئاوا بچكۆلەوە ئیدارە بكرێت، پێشنیاری سیستەمی فیدراڵی كرد كە تیایدا ئاوا دەوڵەتشارگەلێك لە دەروونی كۆماری گەورەتردا كۆ بكرێنەوە. نوێنەرانی خەلكی لەم كۆمارگەلەدا دەبێت لە نێوانی «ئەشرافییەتی سروشتی زانست و بژاردە»دا هەلبژێرێن تا لە سەیتەرەی دەسكردی پێشینەی بنەماڵە و سامان پێشگیری بكەن. بەم جۆرە جفرسۆن دەیویست دیموكراسیی راستەوخۆی كلاسیك لەگەڵ سیستەمی دیموكراسیی نوێنەرایەتی نۆژەندا تێكەڵ بكات. جفرسۆن هەر وەها خوازیاری پێشگیری كۆی زەویی وەزیران لە دەستی تاقمێكی بچووك دابوو هەر وەك نەیشی دەویست زەویی لە نێوان خەلكانی بێ ملكدا دابەش بكرێت. بە بڕوای ئەو بەشداریی سیاسی، بێ خاوەنی دارایی نامومكین بوو. لەم رووەوە بە جفرسۆنیان وتبوو لایەنگری «دیموكراسی- وەرزێرانی ئازاد».

## ٢-٨. جیمز مادیسۆن (١٨٣٦-١٧١٥)

مادیسۆن لە دامەزرێنەرانی دیموکراسیی ئامریکا و چوارەمین سەرۆك کۆماری ئەوێ بوو. سەرەڕای ئەمەش وەك تیۆریسیەنی گەورەی دیموکراسیش ناسرا بوو. کاتێك یاسای ئەساسی نوێی ئامریکا بۆ پەسەند کردن بۆ پارێزگاکان دەنێردرا، ئەلکساندر هامیلتون داوای لە جیمز مادیسۆن وەك نوێنەری گوێرجینیا لە کۆنڤانسیۆنی یاسای ئەساسیدا کرد تا لەگەڵ جان جی وتارگەلێك لە ڕۆژنامەکانی نیویۆرکدا بۆ پارێزگاری لە پەسەند کردنی یاسای ئەساسی بنووسن. هەشتا و پێنج وتار بەم شێوەیە نووسرا، کە دواتر وەك «فدرالیست» ناوبانگیان دەرکرد. مادیسۆن بیست و نۆ وتاری نووسیبوو. مادیسۆن لەم وتارانەدا نووسیبووی کە حکوومەت دەبێ نەك هەر خەڵکی بەڵکو کونترۆڵی خۆیشی بکات. سیستەمی نوێنەرایەتی و پارلەمانی بەرپرسایەتیی حکوومەت لای خەڵکی دابین دەکات، بەڵام ناتوانێ لە کردەوەی زۆر و ئیستبدادی زۆرینە بە سەر کەمینەدا پێشگیری بکات. بە ڕای مادیسون کۆمەڵگا پڕە لە چین و گروپی کۆمەڵایەتی و بەرژەوەندی گروپی کەمینە لە بەرانبەر زۆرینەدا لە مەترسی دایە. بە ڕای مادیسۆن لە کۆمارێکی دامەزراو لەسەر سیستەمی فیدراڵی، فرەبەرژەوەندی و فرەگروپی ئەوندە زۆر دەبن کە پێشگیری لە دروست بوونی زۆرینەی تۆکمە و یەکگرتوو دەکەن. مادیسۆن ئەم بیرەی لە بەرانبەری دەلیلی ئەوانەدا دەهێنا ئاراوە کە پێیان وابوو حکوومەتی دیموکراسی تەنیا لە وڵاتی بچکۆلەدا درێژخایەن دەبێ. ئەو دەورێکی بەرچاوی لە پەسەند کردنی یاسای ئەساسی ئامریکا و لە چاکسازیی یەکەمی یاسای ئەساسی دا هەبووە.

## ٢-٩. ئەندرۆ جەکسۆن (١٨٤٥-١٧٦٧)

جەکسۆن حەوتەمین سەرۆك کۆماری ئامریکا بوو و لە بەرانبەر سوننەتی دیموکراسیی مادیسونیدا، پشتیوانی لە ئارمانی بەرابەری لە دیموکراسیدا دەکرد.

هەر وەها لە پەرەسەندنی مافی دەنگدان بۆ چینی هەژار لایەنگری دەکرد و تێدەکۆشا سوننەتی کۆماری بە چەمکی رۆسۆیی زیندوو بکاتەوە. بەم حاڵەش دیموکراسیی جەکسۆنی تەنیا خوازیاری مافی بەرابەر بۆ پیاوانی سپی پێست بوو و ژنان و کۆیلەکانی نەدەگرتەوە. جەکسۆن لە ماوەی سەرۆك کۆماری خۆیدا لە مافی خەڵکی گشتی لە بەرانبەر گروپی دەسترۆیشتو و کاربەدەستدا پارێزگاری دەکرد. بەم هۆیەوە ئەو خوازیاری هەڵبژاردنی راستەوخۆی سەرۆك کۆمار لە لایەن خەڵکەوە «بە جێی کۆلێژی هەڵبژاردن» بوو و هەر وەها جم و جووڵی بۆ کۆنترۆڵ کردنی گروپە دەسترۆیشتووەکانی نێو ئیدارەکانی ئەمریکا دەست پێکرد. جەکسۆن بە تایبەتی پێی وابوو کە دەسەڵاتداری و ئیمتیازاتی یاسای بانکەکانی ئامریکا ئەسڵی بەرابەری نێوان هاووڵاتیانی ئەمریکی ژێر پێ دەنێ و هێزی روو لە زیادی بازرگانی و ئابووری بە سەر ژیانی خەڵکی ئاساییدا زاڵتر دەکات. لەم سونگەوە کەوتە شەڕ لەگەڵ ئەو ئیمتیازگەلە و لە کۆتاییدا سەریش کەوت. جەکسۆن لە سەرەی دووەمی سەرۆك کۆماریدا، هێرشی خۆی بۆ سەر بانکەکان پەرە پێدا و ئەوانی بە هاورێیانی چینی چەوسێنەر و دوژمنی چینی هەژار لە قەڵەمدا. لەسەریەك دیموکراسیی جەکسۆنی سەرەڕای کەم و کورتیش زەربەری لە دیموکراسیی بلیمەتخوازی ئامریکایی وەشاند.

## ٢-١٠. جان ئستیوارت میل (١٨٧٣-١٨٠٦)

جان ئستیورات میل فەیلەسووفی سیاسی بەریتانی لە تیۆریسیەنگەلی کەڵەی ئازادی و دیموکراسی بوو. میل هەوڵیدا چاکسازیی کۆمەڵایەتی بۆ چەسپاندنی دیموکراسی وەك بەشێك لە سوننەتی لیبرالیزم پاساو بدات.

بیرۆکەی سەرەتایی ئستیوارت میل دەربارەی دیموکراسی لە ژێر کارتێکردنی بیری جرمی بنتهام فەیلەسووفی قازانجخوازی بەریتانیدا بوو. ئەو لە سەرەتا پێی وابوو کە مافی دەنگدانی گشتی، هەڵبژاردنی ئازاد و دەنگدانی نهێنی بۆ دانانی بناغەی دیموکراسی تەواوە. بە بیری ئەو, کەرەسەی ئاوا رێگە لە خراپ بوونی

حکوومــەت کــە هــۆی ســەرەکی شــوێن کــەوتنی قازانجــە لــە لایــەن کاربەدەســتانەوە، دەگرێــت. بۆیــە لــە روانگــەی قازانجخوازانــەی ئیســتوارت میلــەوە، دیــموکراسی ئــەم خێــرە بنەڕەتییــەی بــە دواوە بوو کە گەندەڵی سیاسی لە نـاو دەبـرد و هـەر بـەم هۆیـەوە پاسـاو دەدرا، نـەك بـەم دەلیلـەی کە دیــموکراسی, ئازادی و تاکایەتی, یان مافـی ئەساسی مرۆڤــ باشتر دابیــن دەکات.

بــەڵام دوای ماوەییێــك میــل لــە روانگــەی قازانـــجخوازانە دوور کەوتــەوە و کەوتــە ژێــر کاریگـــەریی ســـوننەتی سوســـیالیزمی فەرەنســـی و هـــەر وەهـــا فەلەســـفەی مافـــی ئینگلیزییەوە. پرسیارێك کە دوای ئەمە زەیـنی میلـی تەنیـەوە ئـەوە بـوو، کـە ئایـا خـەڵك بـە راسـتی لـە دیـــموکراسیدا ئەوەنـدە خـاوەنی زانیـاری و توانـایی هـزری پێویسـت، بـۆ دانـانی یاسـا و بـەڕێوەبردنی سیاسـەتی دروسـت و کاریگـەر هـەن یـان نـە؟ بـە رای میـل خـەڵك لـە نەخۆشـگەلێك دەچـن کـە هەسـت بـە ئـازار دەکـەن و خۆیـان دەرمـانی خۆیـان ناناسـن. دیـارە خـەڵك دەتـوانن دەرمـانی پێشـنیارکراوی سیاسەتـــمەداران وەر بگـرن, یـان وەری نـەگرن. کـەوا بوو لە سیاسەتیشدا کەسانێك هەن کە سیاسەتی دروست بۆ خەڵك بە کار بێنن.

بۆیــە میــل لــە کتــێبی چــەند تێبــینی ســەبارەت بــە حکوومــەتی دامــەزراو لــە ســەر نوێنەرایـەتی (١٨٦١) دەلیـل دێنیتـەوە کـە نوێنـەرانی خـەڵك و خـودی خەڵکەکـەش توانـایی و شـایانی ئـەوەیان نییـە یاسـا دانـێن و کـردەوەی حکوومـەت دیـاری بکـەن. بـەم حاڵەیشـەوە پێـی وایـە، هـەبوونی پارلـەمان و نوێنـەران بـۆ کۆنتـــڕۆڵ کردنـی کردەکـانی حکوومـەت پێویستن. بۆیە دیـــموکراسی, پێگەیشـتووترتان حکوومەتێکـە کـە لـە لایـەك لـە سـەر دەنـگ و رای زۆرینـە و نوێنـەرانی ئـەوان دامـەزرا بـێ و لـە لایـەکی تـرەوە خـاوەنی دەنـگ و شـیاوی «کەمینەی بلیمەت» لـە یاسـادانان و کـارگێڕی دابێـت. بـەم پێیـە میـل پێشـنیازی ئـەوە بـوو کـە کۆمیســیۆنێك بـۆ یاسـادانان دامـەزرێت کـە ئەنـدامانی لـە بـەینی روونـاکبیـــران و بلیمـەتان بـژاردە کـرابن و گەڵاڵـەی یاسـایی بـۆ دەنـگ وەرگـرتن بـۆ پارلـەمانێك بنێـرین کـە ئەندامانی لە هەڵبژاردەکانی خـەڵکی پێـك هـاتوون. میـل هـەروەها پێشـنیاری ئـەوە بـوو کـە خـەڵکانی خوێنـەوار و دەرس خوێنـدوو مافـی دەنگـدانی زیاتریـان پـێ بـدرێ. بـە رای میـل سیسـتەمی نوێنەرایـەتی رێـژەیی، بـە مەبەسـتی دابـین کردنـی مافـی کەمینـەکان لـە پارلەمانـدا، بـە تایبـەت تـاقمی روونـاکبیـر و بلیمـەت, ئەسـڵی زۆرینـە هاوسـەنگ دەکـات.

بۆیە میل پێیْ لـە سـەر پێویسـتیی تێکـەڵ کردنـی زانسـت و پیشـە و زۆرینـەی ئـەژماری لـە دیـموکراسی دا دادەگـرت و پێـی دابـوو دیـموکراسی راسـتەقینە ئـەبێت لـە تێکـەڵی ئـەوتۆ پێـك هاتبێـت. بـە پێچـەوانەوە دیـموکراسی لـە سـەر بنـەمای زۆرینـە، بـە رای ئـەو دیـموکراسییێکی فشـەیە کـە باشتـرین وێنـەی دیـموکراسیی ئـەمریکی پێـك دێنـێ. بـە رای میل زۆرینە ئەژماری، پێـك هـاتوو لـە خـەڵکانێکی بۆرەپیـاو کـە خـاوەنی ڕا و دەنگـی خۆیـان نیـن. بۆیـە دیـموکراسی زۆرینـەی خوێڕیلـە، وریـایی و تاکایـەتی بلیمـەتان لـە پـێش چـاو ناگرێ و حەز و شیـرینکاری خەڵکانی رەشۆکی لە کۆمەڵگادا پەرە پێ دەدا.

دیـموکراسیی ئـەژماری، دیـموکراسیی درۆیـە، لـە بـەر ئـەوەی جیـاوازی سروشـتی نێـو خـەڵکی لـە بەرچـاو نـاگرێ. لـە بەرانبـەردا، دیـموکراسیی راسـتەقینە بـۆ توخـمی جۆراوجـۆری کۆمـەڵگا، دەور و دەسـەڵاتی شـیاو لـە بەرچـاو دەگـرێ. بۆیـە دیـموکراسیی راسـتەقینە لـە بـاتی نوێنەرایـەتی تاکگـەلی بـێ ئـەژمار و پـرژ و بـڵاو، هـۆی نوێنەرایـەتی تاقم و ئامانـجی جۆراوجۆری لە دامەزراوە سیاسیەکاندا پێك دێنێ.

## ۲-۱۱. ویلیام جیمز (۱۹۱۰-۱۸٤۲)

ویلیـام جیمـز فەیلەسووفـی ئـەمریکی و یـەکێك لـە دامەزرێنـەرانی قوتابـخانەی پراگمـاتیزم لـە بەرهەمـە گـرنگەکانی خـۆی وەك پراگمـاتیزم (۱۹۰۷) و مـانـای راسـتی (۱۹۰۹) تیـۆری و فەلسـەفەی بـە کەرەسـەی تێگەیشـتنی واقعیـەتی بگـۆڕ دەناسـی. پەیوەندی نێـوان زەیـنی مرۆڤـ و راسـتی دەرەوەیـی شـتێك نییـە لـە پێشـەوە دیـاری کرابێـت. بـەڵکو مرۆڤـ بـەردەوام تێبـینی خـۆی لـە راسـتیی دەرەوەی چـاك دەکاتـەوە و پێوانـەی ئـەم چـاککردنەوەیە، هێـز و بڕشـتی ئـەو تێبینییـە لـە سـەر خسـتنی ژیـانی رۆژانـەی مرۆڤـ. بـە واتـایێکی دیکـە، خێروبێـری ئـەو تێبینیەیـە. بۆیـە تێبـینی مرۆڤـ لـە راسـتی بەسـراوە بـە پێوەنـدی چـێکراوی نێـوان زەیـن و راسـتییەوە هەیـە یـەعنی لـە ئاکامـدا بەسـراوەیی بـە فایدەمەنـدی ئـەو شـتانەوە هەیـە کـە پـێش هـاتوون. جیمـز لـە روانگـەی ئـەم بۆچـوونە فەلسەفـییەوە کەوتـە پارێزگـاری لـە لیـبرال - دیـموکراسی. لـە بـەر ئـەوەی راسـتییەکان

بەردەوام بگۆڕن و دەگـۆڕێن. مرۆڤـــ لـە دەشـتی ئازادیـدا دەژیـت و پێبەنـدی هـیچ راسـتییێکی تۆکمە و نـەگۆڕ نییـە. تـاك دەتـوانێ بـۆ جێبـەجێ کردنـی کاروبـاری خـۆی هـەر بیـــروباوەڕێك وەرگرێ و تـەنیا پێوانـەی بـۆ راسـتی ئـەو بیـــروباوەڕە، بەهرەمەنـدیی ئـەو بیـــروباوەڕەیە. ئـەم فرەڕەنگـــی و بگـــۆڕی راســـتییە، پاســـاوەدەری گرینگتــــرین بنـــەمای بیـــری دیـــموکراسیی لیبـرالْ یەعنی ئەسڵی لێبوردەیی و ساناگیـریە.

## ٢-١٢. جۆن دیوی (١٩٥٢-١٨٥٩)

جـۆن دیـوی فەیلەسووفـــی پراگماتیســـتی ئـەمریکی، بـە یـەکێك لـە تئۆریسـیەنەکانی گەورەی دیـــموکراسی بـە ئـەژمار دێـت. دیـوی مامۆسـتای فەلسـەفەی زانسـتگای شـیکاگۆ و دواتر زانستگای کولۆمبیـا بـوو. بـە رای دیـوی سروشـتی مرۆڤـ نـەگۆڕو پتـەو نییـە، بـەڵکو بـەردەوام لـە گـۆڕان دایـە. مرۆڤـــ بـەردەوام لـە حـاڵی گـۆڕان و سـەرکەوتن دایـە و رووی لـە ئامانـــجێکە کـە پێناسـە ناکرێـت. بـە بـڕوای نـاوبراو بـۆ گەیشـتن بـە ئامانـــجەکانی دیـــموکراسی یـەعنی ئـازادی، بەرابـەری و پێشـکەوتن، تـەنیا دەتـوانرێ لـە کەرەسـەی دیـــموکراتیك کـەڵك وەرگـیرێ. لـە چـاوی دیویـەوە، لـە نێـوان دیـــموکراسی، فـێر کـردن و زانستدا، پەیوەندی دوو لایەنە و هاوپشتیوان هەیە.

پـەرە پێـدانی دیـــموکراسی، پێویسـتی بـە فـێرکاریی دیـــموکراتیك هەیـە. دیـــموکراسیش بـۆ خـۆی، زەمینـەی سـەرهەڵدانی زانسـت و پێشـکەوتن دابیـن دەکـات. بـە رای دیویی بەرابـەری، ئەساسـی دیـــموکراسییە. دیـــموکراسی لـە سـەر ئـەم بڕوایـە دامـەزراوە کـە هـەموو خـەڵکی خـاوەنی عـەقڵن و هـیچ تـاك و گروپێـك نـاتوانن بـە دەربـڕینی زانـایی و سەربوونی ئاوەزەوە، بە سەر ئەوانی دیکەدا حکوومەت بکەن.

دیویی جیـاوازی لـە نێـوان ئـازادیی نگـاتیڤ (نـەرینی) و پـوزەتیڤ (ئـەرێنی)دا، تۆفـیری دادەنـا و ئـازادی پـوزەتیڤی بـە شـەرتی دیـــموکراسی دەزانـی. ئـازادیی نیگـاتیڤ تـەنیا بـە مانـای ئـازادی لـە دەسـتدرێژی و دەسـتتێوەردانی خـەڵکانی دیکەیـە، بـەڵام ئـازادیی پـوزەتیڤ بـە مانـای تێکۆشـان بـۆ پێگەیانـدنی خۆیـە. وەك وتـرا، دیـــموکراسی بایـەخی فـێرکردنی

هەیە لە بەر ئـەوەی وت و وێـژی ئـازاد زەیـنی گشـتی پـەروەردە دەکـا و خـەڵکی بـۆ ژیـانی بـە کۆمـەڵ تـەیار دەکـات. لـە نێـوان دیـــموکراسی و زانسـتدا پەیوەنـدیی قـووڵ هەیـە. لـە بـەر ئـەوەی شـێوەی دڵخـوازی دیـــموکراسی تـاقی کردنـەوە و ئـەزموون و گـەڕانی بـەردەوام لـە ئەندیشە و باوەڕ و سیاسەت دایە و ئەمەش ڕێك ڕێگای زانستە.

## ٢-١٣. هارۆڵد لاسکی (١٨٩٣-١٩٥٠)

تیۆرسـیەنی سیاسـیی ئینگلیسـی، مامۆسـتای زانسـتگاکانی هارڤـاردو و لەنـدەن و خـاوەنی بـەهرەی فـراوان وەك قەیـرانی دیـــموکراسی (١٩٣٣) دەوڵـەت لـە بیـر و کـردەوەدا (١٩٣٥) و دەسـەڵاتی دەوڵـەتی نـۆژەن (١٩١٩) بـووە. لاسـکی پێـی لـە سـەر بنـەمای فرەخـوازی دیـــموکراسی و گرنگـی تاقمـە کۆمەڵایەتییـەکان لـە سیسـتەمی دیـــموکراسیدا دادەگرت و لەم بـارەوە سـەبارەت بـە دەوڵـەتی بـە هێـز و ناوەنـدخواز دوو دڵ بـوو. بـە رای ئـەو تاکگـەل لـە بنەڕەتـدا سـەبارەت بـە تاقمگـەلی کۆمەڵایـەتی و دامـەزراوەی نادەوڵـەتی وەك کلیسا و کۆمکار، هەسـتی وەفـاداری و لایـەنگرییان هەیـە و ئـەم هەسـتە بـۆ دەوڵـەتی گـەورە و ناوەندیـخواز نییە.

بـەم پێیـە بنـەمای دیـــموکراسی هـەر ئـەم گـروپ و دامەزراوانـەن و بـە مەبەسـتی پاراسـتـن و بـەهێز کردنیـان، هێـزی دەوڵـەتی دەبـێ کـز و ناناوەنـدی بکرێـت. وەفـاداریی سیاسیی خەڵك چوون یـەك نییـە، بـەڵکو وەفـادارییی ئـەوان چـەند لایەنـە و شـەرتی پاراسـتنی ئازادی، پاراستنی ئەم وەفادارییانەیە.

سەرەڕای ئەمانـەش لاسـکی لـە بەرهەمـەکانی دیکەیـدا، لـە سـەر بیـری کـز کردنـەوەی دەوڵـەت بـە مەبەسـتی بـە هێـز کردنـی تاقمـە کۆمەڵاتییـەکان بـە وەفـا نەمایـەوەو دەلیلـی هێنایـەوە کـە دەوڵـەت بـە مەبەسـتی پێگەیانـدنی ئامانـجی بەرابـەری و ئـازادی، دەبـێ بـۆ دابیـن کردنی توانا مادییـەکانی چـینەکانی خـوارێی کۆمـەڵ دەسـت لـە کـار وەردا. بـەم جـۆرە لاسـکی هێـدی هێـدی لـە بیـری لیبـراڵی دوور کەوتـەوە و هـۆگری بـۆ سۆسـیالیزم زیـادی کـرد. لـە دوا بەرهـەمی گرنگـی خۆیـدا واتـە: دیـــموکراسی لـە ئـەمریکا (١٩٤٨)

ئیستدلالی کرد کە دیموکراسی لە دنیای مودێرندا لە بەر زاڵبوونی سەرمایە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، پیفەڵ بووە و بۆیە دیموکراسی لە ئەساسدا، لەگەڵ سەرمایەداریدا ناخوێنێ.

## ٢-١٤. هارۆڵد لاسول (١٩٧٨-١٩٠٢)

لاسول، زانای سیاسیی ئەمریکی و مامۆستای زانستگاکانی شیکاگۆ وییل پێی وابوو کە دەکرێ لە رێگای سەرخستنی مەعرەفەتی زانستی لە کایەی سیاسیدا بۆ جێخستنی بنەماکانی دیموکراسی و پێشگیری لە دابەزینی لە قەیراندا هیوادار بوو. ئەو لە کتێبی گەنناسی دەروونی و سیاسەت (١٩٣٠) دەلیلی هێناوە کە تاك لە کردەوەی پێکهاتن لەگەڵ دەور و بەری بگۆڕ کە تایبەتکاری «خۆ» یان «ئیگۆ»یە لەگەڵ دەست تێوەردان و لەمپەری سۆزاوی و سەرەتایی لە لایەن «من» و «بان خۆ»وە رووبەڕوو دەبێ.

هەرچی «خۆ» گەورەتر دەبێ، تاك تێدەگا کە سەبارەت بە دەسەڵاتی باوك شتەکان گەورە کراوەتەوە. بەم حاڵەیشەوە مرۆڤی تاك بە هۆی هەمان پێویستی بە باوکی ئارمانی و بەهێز، کە لە پێنەزانراوا شاراوەیە، لە رێبەر یان حاکم و دامەزراوەی سیاسی باوك رەنگدا دەر دەکەوێ. بۆیە پێویستیی پەرەپێدانی «خۆ» لە هەنبەر داخوازی «من» و «بان خۆ» دایە. «خۆ» کردەوەی عەقڵانی رادەپەڕێنێ، «خۆ» پێویستی بە بڵاوکردنەوەی بەشی زانایی و بیرکردنەوەیە کە دادگەری بایەخی و ئەخلاقی لە سەر ئەساسی ئەو دامەزراون. بەم بۆنەوە زانایان لە سەر خستنی دیموکراسیدا بەرپرسایەتی قورسیان لە سەر شانە. ئامانجی فێرکاری لە زەمینەی دیموکراسیدا ئەبێ هەستی بەرپرسایەتیی تاك، لە دۆزی بەکار هێنانی هێزدا بێت. بەم حاڵەیشەوە فێرکاریی هزری و دەروونی تەواو نابێت، بەڵکو ئامانجەکانی دیموکراسی پێویستی بە کاروباری سیاسی وەك جیاکردنەوەی هێزەکان و چاوەدێریی

ئەو هێزانە لە سەر یەکتری هەیە. بە رای ئەو دەسەڵات هۆی سەرەکی دڵەڕاوکێ و کێشەی کۆمەڵایەتییە و تەنیا رێگای رزگاری تاك و کۆمەڵ لەوە دایە هەرچی لە توانایان دایە بیکەن تا بونیادی دەسەڵات لاواز بکەن.

## ۲-۱۵. ژۆزف شومپیتر (۱۸۸۳-۱۹۵۰)

شومپیتر لە ئوتریش لە دایك بوو و لە زانستگای ڤیەننا ئابووری تەواو کرد و لە ساڵی ۱۹۳۲ بۆ ئەمریکا کۆچی کرد و لە زانستگای هارڤارد دەستی بە دەرس وتنەوە کرد. ئەو لە کتێبی بەناو بانگی سەرمایەداری، سوسیالیزم و دیموکراسی (۱۹٤۳) باسی لە دیموکراسی وەك شێوەیێك لە هەڵبژاردنی رێبەرانی سیاسی کرد، لە کاتێکدا بیرمەندانی پێشووتر وەك ئامانجێك لە دیموکراسییان دەڕوانی، بە وتەیێکی دیکە روانگەی شۆمپیتر سەبارەت بە دیموکراسی راستیخوازانە بوو، نە ئارەزووخوازانە.

بۆچوونەکانی شۆمپیتر لە سەرهەڵدانی قوتابخانەی فرەخوازی سیاسی، یان دیموکراسی تاقمگەلی بژاردە لە ئامریکا کاریگەرییان هەبوو. شۆمپیتر لە ژێر کارتێکردنی لێکدانەوەی ئابووری خۆیدا، سیاسەتی بە بازاڕی رکەبەری دەنرخاند کە لەودا خەڵك شوێن قازانجی خۆیان دەکەون و یاریکارانی سیاسی بۆ وە دەستهێنانی دەنگی خەڵك لەگەڵ یەکتری کێبەرکێ دەکەن. لە تیۆرییە کلاسیکەکاندا، دیموکراسی وەك نموونەی باشترین شێوەی حکومەت بۆ دابین کردنی چاك یان خێر و خۆشی گشتی لە قەڵەم دەدرا. هەموو فەیلەسوفانی ئارمانخواز وەکوو رۆسۆ و هەروەها بیرمەندانی راستیخوازی وەك بنتهام، دیموکراسیان وەك ئامێری دابین کردنی چاکە، یان خێر و خۆشی گشتی لە بەرچاو دەگرت. بەڵام بە رای شۆمپیتر چەمکی چاکەی گشتی، چەمکێکی شلوێ و خەیاڵ پلاوە. سەرەڕای ئەمەش شومپیتر یەکێك لە گریمانە ئەساسییەکانی تئۆریە کۆنەکانی دیموکراسی وە درۆ دەخستەوە، کە رەفتاری مرۆڤ لە سنووری سیاسەتدا عەقڵانییە، ئەو پێی وابوو هاووڵاتیان بە گشتی دەکەونە بەرکارتێکردنی دنەی ناعەقڵانی سیاسییەوە. دیارە بۆچوونی ئەوتۆ، لەگەڵ بۆچوونی

سەرەکی شۆمپیتـردا کە پێی وابـوو بـازاڕی سیاسـەت لـە بـازاڕی کـاڵا دەچـێ ناتـەبایی هەیـە. بـە رای شۆمپیتـر دیـموکراسی لـە بنەڕەتـدا شـێوەییێکە بـۆ هەڵبـژاردنی سیاسەتـمەداران، یـان بـە وتـەییێکی تـر دیـموکراسی ڕێبازێکـە بـۆ بڕیـاردانی ئـەو ڕێبەرانـە کـە دەسـەڵاتی خۆیان لە ڕێگای کێبـەرکێی دەنگدانـەوە وەدەسـت دەهێـنن. بـەم پێیـە هـەموو ئـەو شـتانە کـە لـە دیـموکراسیی کلاسـیکدا وەك بایـەخ دادەنـران «وەك چـاکەی گشـتی، تاکایـەتی، ئـازادی، بەرابـەری» جێگـای خـۆی بـۆ دیـموکراسی وەك چاکتـرین و دڵنیـاترین ڕێبـازی هەڵبـژاردنی ڕێبـەران، بـە بـێ شـەڕ و ئـاڵۆزی، چـۆڵ کـرد. دیـموکراسی باشتـرین و تـەنیا ڕێبـازی مومکیـنە بۆ دوورکەتنەوە لە پاوانـخوازی.

## ٢-١٦. ریمون ئارۆن (١٩٨٣-١٩٠٥)

ئـارۆن, فەیلەسـوف و نووسـەری فەڕەنسـی، لـە لایـەنگرە تۆخـەکانی دیـموکراسی و باوەکوشـتەی کمـونیزم و فاشـیزم و توتالیتـاریزم بـوو. ئـەو پێـی وابـوو کـە ئـازادی و بایـەخی مرۆڤـ تـەنیا لـە سـێبەری بیـری بەرابەریـخوازی چـاخی مۆدێرنـدا، دابیـن دەبێـت. ئـارۆن لـە کتـێبی دیـموکراسی و توتالیتاریزمـدا پارێزگـاری لـە سیسـتەمی فرەخـواز و دیـموکراتێکی هاوچـەرخ، وەك سیسـتەمی یاسـامەند و مـەدەنی دەکـرد. بـە رای ئـارۆن, تایبـەتکاری ئـەم سیسـتمگەلە، نـەك پـاك کردنـەوە و سـڕینەوە، بـەڵکو هاوسـەنگ کـردن و کـەم کردنـەوەی کێشـە کۆمەڵایەتییەکانـە. رکەبـەری، یاسـامەندی، فرەڕەنگـی و فرەحـەزی و ئامانـجی کۆمەڵایـەتی، جەوهـەری دیـموکراسی دروسـت دەکـەن. لـە بەرانبـەردا، سیسـتمگەلی تۆتالیتـار هـەوڵ ئـەدەن بـە شـێوی ئـارەزووخوازی کێشـە کۆمەڵایەتییـەکان ریشـەکێش کـەن و لـەم سـۆنگەوە، ئـازادی و بەشـداری و رکەبەری لە نێو بەرن. بە رای ئـارۆن، دیـموکراسی لـە چـاخی نۆژەنـدا بـە بـێ دامـەزرانی دەوڵـەتی خێرومـەن، کـە کـەل و پـەلی پێویسـت بـۆ بەهرەمەنـدبوونی تـاك لـە ئازادییـە دیـموکراتییەکان دابیـن بکـات، بێمانایـە. بـەڵام لـە لایێکـیتـرەوە بـە رای ئـارۆن،

دامەزرانی وەکیەکی لە کۆمەڵگای نۆژەندا مەحاڵە. لە بەر ئەوەی لەمپەری بونیادیی گەورە لە سەر ڕێگای کۆمەڵگای بەرابەردا هەیە. بە رای ئارۆن هەوڵ دان بۆ دامەزرانی بەرابەریی تەواو لە کۆمەڵگا، ئاکامی تەنیا پاوانخوازی و توتالیتاریزم دەبێ.

### ٢-١٧. ئایزایا برلین (١٩٩٧-١٩٠٩)

برلین, فەیلەسووفی سیاسیی هاوچەرخ لە لاتفیا هاتە دنیاوە. لە بەریتانیا دەرسی تەواو کرد. وتاری بەناوبانگی برلین لە ژێر ناوی «دوو چەمکی ئازادی» (١٩٥٨) کە دواتر لە کتێبی چوار وتار دەربارەی ئازادی (١٩٦٩)دا بڵاو کرایەوە، بنەماکانی بیروباوەڕی برلین دەربارەی ئازادی و دیموکراسی دەگرێتە خۆ. ئەو لەم کنێبەدا دوو چەمکی ئازادیی نەرێنی و ئەرێنی (نگاتیف و پۆزەتیفی) لە یەك جیا کردەوە. ئازادیی نیگاتیڤ کە بە مانای، رزگاری لە دەست تێوەردان و ئیرادەی زۆرەملی خەڵکانی ترە، جەوهەری لیبرالیزم چێ دەکات. لە بەرانبەردا، ئازادیی پۆزەتیف بە مانای ئازادی کردەوە لە چوارچێوەی عەقڵی گشتی دایە، بنەمای ئیستبداد و توتالیتاریزمە.

بە وتەیێکی دیکە ئازادیی پۆزەتیف پێویستی بە هەڵبژاردنی بەشی عەقلانی دەروون بە سەر بەشی ترسناك و ناعەقلانی ئەو دایە. ئەو شتەی کە ژیرانە و عەقلانییە، بە گشتی لە لایەن کۆمەڵگا یا خەڵکانی ترەوە دیاری دەکرێ و مانا دەکرێتەوە و بەم پێیە ئازادیی پوزەتیف لە ئاکامدا بە مانای پاڵ دان بە ئیرادەی خەڵکانی دیکەوەیە، ئەوانەی کە چاکەی «راستەقینە» و «عەقلانی» تاك مانا دەکەنەوە. هەر ئەم بیرەیە کە بنەمای تۆتالیتاریزم و ئیستبدادی بەربلاوی مودێرن دروست دەکات. لە راستیدا لایەنگرانی ئازادیی پوزەتیف، تاك بە ئازادبوون مەجبوور دەکەن. بە گشتی برلین لە سەر ئەو بڕوایە بوو کە دیموکراسی سیستەمیکە کە لەودا ئیمکانی هەڵبژاردن لە نێوان بەربژاری جواروجۆر، بۆ تاك مسۆگەرە. دیارە لە نێوان بایەخە باشەکانی مرۆڤدا بەردەوام ناتەبایی هەیە و ئەم ناتەباییە بە هیچ شێوەیێك، تەنانەت بە دیموکراسیش، حەل

ناكرێــت، بــەڵام دیـــموكراسی ئیمكــانی هەڵبــژاردن لــە نێــوان بایەخگــەل و ئامانـــجی ڕەنگاوڕەنگی ژیان بۆ تاك دابیــن دەكات.

### ٢-١٨. موریس دووڕژە

دووڕژە, لــە ســاڵی ١٩٥٥ تــا ١٩٨٥ مامۆســتای كۆمەڵناســی سیاســی زانســتگای پــاریس بــوو. ئــەو لــە كتێبــە بەناوبانگەكــەی خۆیــدا بــە نێــوی «حیزبــە سیاسییەكان» لــە نێوان سیســتەمی هەڵبــژاردن و سیســتەمی حزبیــدا پەیوەندییــەكی دۆزیــەوە كــە بــە «قــانوونی دووڕژە» بەنێوبانگــە. بــەم مانایــە كــە سیســتەمی هەڵبــژاردنی زۆرینەیــەكی ســاكار لــە ســەر ناوچەیەكی یەك نوێنــەری بەنــدە. لەوێــدا ئــەو پــاڵێوراوەی كــە زۆرتــرین دەنــگ وەدەس بهــێنێ، كورســی پارلــەمان وەدەســت دەهێنــێ، ئەمــەش دەبێتــە هــۆی بونیادنــانی سیســتەمیكی دوو حزبــی. بــە رای دووڕژە لــە لایــەكی تــرەوە، سیســتەمی نوێنەرایــەتیی ڕێــژەیی بــە پێگــرتنی زیــاتر لــە دوو حــزب یارمــەتی دەگــەیێنی. بــە گشــتی بــە رای دووڕژە لــە نێــوان كورســیەكانی هــەر ناوچــەیێ دەنگــدان و ژمــارەی ئــەحزابی گــەورەی نیشــتماندا پەیوەندییــەك هەیــە. ئــەو پێــی وایــە هــۆی ئەمــەش دوو شــتە: هــوێ فــەننی و هــۆی دەروونــی: بێدەســەڵاتی ئــەحزابی بچكۆلە لە وەدەســت هێنــانی دەنــگ لــە سیســتەمی زۆرینــە بــە ناوچــەی یــەك نوێنەریەوەیــەو هۆكاری دووەم بــێ مــەیلی ئــەو دەنگدەرانەیــە بــۆ بــە فــیڕۆچوونی دەنگیــان بــەو حزبانــەی كــە هێزی سەركەوتنان نییــە. لــە ئاكــامی ئــەم هۆیــەوە، دەنگــی ئــەم حزبانــە بــەر یــەكێك لــە دوو حزبــی ســەرەكی دەكــەوێت. بــەڵام كاتێــك سیســتەمی هەڵبــژاردن ڕێــژەیی بــێ، هیچــكام لــەو دوو هۆیــە كاریگــەر نــابن و لــە ئاكامــدا توانــایی ئــەحزابی گچــكە بــۆ وەدەســت هێنــانی كورســی پارلــەمان زیــاتر دەبــێ. لــەم سیســتمەدا، ناوچــەكانی هەڵبــژاردن چــەند پــاڵێوراوین. هــەر چــەند ژمــارەی كورســییەكانی ناوچــە زیــاتر بێــت, ژمارەیــەكی زیــاتر لــە حزبــەكان دەتــوانن نوێنــەر وەدەســت بێــنن. نووســەرانی دوای دووڕژە بــە پــێ لێنــان لــە رای ئــەو، ئاماژەیان كردووە كە دوو هۆكــاری نــاو بــراو لەوانەیــە تــا رادەیــەك لــە سیســتمگەلی ڕێژەیشــدا كاریگەر بن. بۆیــە ئــەم نووســەرانە «قــانوونی دووڕژە»یــان بــە شــێوەی خــوارەوە خــڕ كردۆتــەوە: كاتێك ناوچەی هەڵبــژاردن یــەك كورســی هەیــە, یــان یــەك پــاڵێوراوی بێــت، ژمــارەی ئــەحزاب

لـه دوو زیـاتر نابێـت، بـەڵام هەرچـی ژمـارەی کورسـییەکان و پـاڵێوراوان لـە ناوچـەی هەڵبژاردن زیاد بکات, ژمارەی ئەحزابی گەورەش زیاد ئەکات.

### ٢-١٩. کارل پۆپر (١٩٠٢-١٩٩٤)

پـۆپر، فەیلەسووفـی زانسـت و زانـای گـەورەی ئوتریشـی, دەربـارەی دیـموکراسیش خـاوەن را بـوو. لـە راسـتیدا هـەموو بەرهەمـەکانی پـۆپر وەرگیـراو لـەم بیـرە سـەرەکییە وەرگـیراوە کـە ئـازادی و حەقیقـەت پێکـەوە بەسـراون. گرنگتـرین بەرهـەمی سیاسـیی پـۆپر کۆمـەڵگای کـراوە و دوژمنـانی ئـەوە، ئـەو لـەم کتێبـەدا کەوتـە هـەڵ سـەنگاندنی بیـروڕای دوژمنـانی ئازادییـە دیـموکراتییەکان و کۆمـەڵگای کـراوە و فەیلەسووفـی گـەورەی وەك ئـەفلاتوون، ئەرەسـتۆ، هیگـل و مارکسـی بـە بەرپرسـی جێبـەجێ کردنـی کۆمـەڵگای داخـراو و ئیسـتبدادی سیاسـی لـە قەڵـەم دا. ئـەو رێبـازی عەقڵانیـەتی رەخنەگرانـەی خـۆی لـە سنووری زانستەوە کێشـایە سـنووری کۆمـەڵگا و سیاسـەتەوە. هـەر بـەو جـۆرە کـە زانسـت لـە رێگـای وەدرۆ خسـتنەوەی تیـۆری جێگرتـووەوە پـێش دەکـەوێ، کۆمـەڵگا و سیاسـەتیش بـۆ پێش کەوتنیان پێویستیان بە رەخنەی بەردەوام هەیە.

کۆمـەڵگای داخـراو، کۆمەڵگایەکـە کـە لەوێـدا هـەموو حەقیقـەتێك، دۆزراوە لـە قەڵـەم دەدرێـت، لـە کاتێکـدا پـۆپر پێـی وایـە, هـیچ کـات ناکرێـت حەقیقـەتی کۆتـایی بدۆزرێتـەوە. ئێمـە ناتوانیـن پرۆسـەی داهـاتووی مێـژوو بناسیـن، لـە بـەر ئـەوەی ناتوانیـن مەعریفـەی زانسـتی داهـاتوو لـە ئێسـتاوە دەسـت نیشـان بکـەین، جیـا لەمـە ئەبوایە زانستی داهاتوو هەر لـە ئێسـتاوە لـە بـەر دەسـتدا بوایـە. کۆمـەڵگای داخـراو لـە سەر بنەمای ئەو ئیدعایەی کـە پێبەنـدە بـە حەقیقـەتی لـە پێشـدا دارێـژراوە و هـەلێ بـۆ هەڵسـەنگاندن و درۆ خسـتنەوەی سیاسـەت نارەخسـێنێ. گرینگتـرین ئیمتیـازی دیـموکراسی لەچـاو حکوومەتـەکانی تـر لـەوە دایـە کـە لـە دیـموکراسیدا مرۆڤـ دەتـوانێ کاربەدەسـتانی گەنـدەڵ و ناشایسـت وەلا بنـێ. بـە گشـتی پـوپر پێـی وایـە، دیـموکراسی لەگەڵ ئەسڵی گشـتی و هـەموو لایەنـەی زاڵ بـە سـەر بیـری ئـەودا، یـەعنی

کراوەبوونی دنیا و ناحەتمی و ناتەواو بوونی هەموو راستییەکان، پەیوەندیەکی بنەڕەتی هەیە.

## ٢-٢٠. رابرت دالْ

دالْ، تیۆریسیەنی گەورەی دیموکراسی, یەکێکە لە زانا سیاسییە مەزنەکانی سیاسی ئەمریکا، چەمکی «پۆلی گارشی» کە بۆ نیشاندانی سیستمگەلی دیموکراسیی هاوچەرخ وەگەڕ خستووە. ئەو پێی وایە دیموکراسی بە مانا ئارەزوومەندانە و کلاسیکەکەیەوە وەدەست نایێت. بەڵکو تەنیا دەکرێ بۆ پێوانەی نزیکی دیموکراسیگەلی ئارا بە دیموکراسی ئارەزوومەندانە لە بەر چاو بگیرێ. بە واتایێکی دیکە، تیۆری دالْ دەربارەی دیموکراسی، تیۆریەکی راستیخوازانەیە کە بە تایبەتی لە روانگەی بلیمەتخوازانەوە کاری تێکراوە. ئەو لە یەکەم کتێبی گرنگی خۆی پاشکۆیەك لە سەر تیۆری دیموکراسی (١٩٥٦), تیۆرییەکانی زۆرینەخوازی و بەشداریکارانە و ئارەزوومەندانەی وەبەر رەخنە دا و لە بەرانبەردا چەمکی پۆلی گارشی بۆ خستنەرووی دیموکراسی ئێستا و مومکین بەکار هێنا. پۆلی گارشی بە مانای زۆر بوونی کاربەدەستانی حوکمڕانی، رادەی دڵخوازیی بەشداری و رکەبەری سیاسی دروست دەکات و لە سەرهەڵدانی ئیستبداد پێشگیری دەکات. حکوومەتی دیموکراسیی راستەقینە نە حکوومەتی زۆرینە و نە حکوومەتی کەمینەیەکە، بەڵکو حکوومەتی چەندین کەمینەیە. بۆیە تیۆری پۆلی گارشی, تیوری پلورالیزم یا فراوانخوازیی سەرچاوەکانی دەسەلاتە. دالْ لە کتێبی بە سەنگی دواتری خۆیدا دەربارەی تیۆری دیموکراسی یانی پۆلی گارشی (١٩٧١) کەوتە لێکدانەوەی هەل و مەرجی مێژوویی، کۆمەلایەتی و فەرهەنگی کە رێخۆشکەرن بۆ سەرهەڵدانی دیموکراسی. بە پێی لێکدانەوەی دالْ سەرهەڵدانی دیموکراسی بە بەرهەمی بەدیهاتنی هاوکاتی کۆمەڵێك هەل و مەرج دەزانی کە بە دەگمەن کۆ دەبنەوە. بە گشتی لە روانگەی دالەوە دیموکراسی وەك رێبازی بژاری رێبەران و دەستەبەر کردنی چاوەدێری هاوولاتیان بە سەر رێبەراندا گرینگی زیاتری

هەیە تا وەکو سیستەمیك بۆ دابین کردنی ماف و ئازادیی تاك و بەشداری و رکەبەری تەواو و تۆکمە و پتەو.

## ٢-٢١. سیمۆن مارتین لیپست (   -١٩٢٢)

لیپیست, کۆمەڵناسی هاوچەرخی ئەمریکی، لێکۆڵینەوەیەکی بەربلاوی دەربارەی هەل و مەرجی پێکهاتنی دیموکراسی لە بەرهەمە جۆربەجۆرەکانی خۆیدا وەك مرۆڤی سیاسی (١٩٨١) و هاودەنگی و کێشمەکێشدا (١٩٨٥) کردووە. ئەو لەم کتێبانەدا لە نێوان شێوەی ژیانی دیموکراتیك، حکومەتی یاسا، نابەرابەریی تەسك کراوە، هێزی چینی نێوەنجی و فەرهەنگی سیاسیی هێمن، هاو پەیوەندییەکی قووڵی پەیدا کردووە. یەکێك لەو باسانەی کە لیپیست هۆگریەتی، لێکدانەوەی ئەو هۆکارانەیە کە کێشەی سیاسی لە چوارچێوەی گشتی تری یەکگرتن و هاوبیریدا کونترۆڵ دەکات. بەم پێیە لە دیموکراسییەکاندا، کەلێن و کێشە و تەنگژەی کۆمەڵایەتی و سیاسی بە جۆرێك لەگەڵ هاوبیری و یەکیەتیدا هاوژینە. یەکێك لە هۆکارەکانی راگرتنی نەگۆڕیی کۆمەڵایەتی و سیاسی، کەلێنی چەپ و راستە کە (یەکتری) دەپێکن و ئەمەش پێشگیری لە کەڵەکە بوونی هێڵ و لایەنی کێشەکان دەکات. کەلێنی راست و چەپ, توندیی کێشەکان و هەستی سیاسی کەم دەکەنەوە و ئەو هەل و مەرجە دروست دەکەن تا ئەو کەسانەی لە بارێکەوە کەمینەن لە بارێکی ترەوە زۆرینە بن. بە رای لیپیست، یەکێك لەو هەل و مەرجانەی کە بنەمای بە پێوە وەستانی دیموکراسییە، وجوودی ئەو دامەزراوانەیە کە رێگا هەم بە کێشە، هەم بە هاوبیری دەدەن.

## ٢-٢٢. ئانتۆنی داونز

داونز نووسەری کتێبی تیۆریی ئابووریی دیموکراسی (١٩٥٧) دەورێکی بەرچاوی لە گەشە پێدانی تیۆریزە کردنی دیموکراسی بە تایبەت «تیۆری هەڵبژاردنی گشتیدا»

بووه. بە رای داونز سیاسەتمەداران و حزبە سیاسییەکان لە هەڵبژاردندا بە شێوەی بەرچاو لە بیری هەڵبژاردنی خۆیاندان و ئەمانە لە ئاکامدا سیاسەتگەلێك وەگەڕ دەخەن کە لەگەڵ داخوازی و چاوەڕوانی دەنگدەران یەك بگرنەوە. ئەو لە کتێیی ناوبراودا، وێنەیەکی ساکار دەربارەی رکەبەریی سیاسی دەخاتە روو. بە پێی ئەم وێنەیە ئەحزابی رکابەر بە پێچەوانەی تیوری و بۆ چوونەکانی پێشوو، حەزی بە هێزیان بۆ دەرخستنی سیاسەت و گفتی یەکسان و لێکچوو هەیە. داونز بەم شێوەیە رەفتاری یاریکەرانی سیاسی لە سەر چەمکی «بژاری عەقلانی» راڤە دەکات. وێنەی رکەبەری سیاسی - حزبی لە تیوری ئەودا لە سەر چەند گریمانەی بنەڕەتی دامەزراوە: هەموو حزبی سیاسی و پاڵێوراوانی حیزبی لە بیری قازانجی خۆیان، واتە سەرکەوتن دان. هەر دەنگدەرێك دەنگ بە حزب, یان پاڵێوراوێك دەدات کە سیاسەتی دڵخوازی ئەو بەڕێوە ببات، سیاسەتی هەر حیزب و پاڵێوراوێك تەنیا بە مەبەستی سەرکەوتنی سانا لە هەڵبژاردندا دادەرێژرێت. لە سەر ئەم گریمانانە، داونز بەو ئاکامە ئەگات کە لە سیستەمی دوو حزبیدا، سیاسەتی ئەحزاب و پاڵێوراوان لایەنگریخواز و حەزی «دەنگدەری نێوەنجی»ە. لە ئاکامدا، حزب و پاڵێوراوی سەرکەوتووی هەڵبژاردن بە مەودایەکی کەمەوە بە سەر رکەبەرەکانیدا سەر دەکەون. رەخنەگرانی داونز پێیان وایە کە ناتوانرێ باس لە وێنەیەکی عەقلانیی تاك لە رکەبەری حزبگەلدا بکرێ. بەڵکو دەتوانرێ وێنەی عەقلانیی جۆربەجۆر بدۆزێتەوە.

# پێشینەی مێژوویی و زەمینەی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی دیموکراسی

گەرچی دیموکراسی بە شێوەییەکی تەسك، شتێکی لە مێژینەیە و بۆ سەردەمی یۆنان و رۆمی کۆن دەگەڕێتەوە، بەڵام دیموکراسی لە چەمکە نۆژەنەکەیدا بەرهەمی گۆڕانکارییە فیکری و کۆمەڵایەتییەکانی سەدەی نوێیە. زۆر لە خاوەنڕایان لە نێوان دیموکراسی، سەرمایەداری، کۆمەڵگای پیشەسازی، نوێخوازی و فەرهەنگدا پەیوەندییەکی نزیك بەدی ئەکەن. لە ئەورووپای رۆژئاوا، هۆکاری جۆراوجۆری وەك فئۆدالیسم و پرژوبڵاوی دەسەڵاتی سیاسی، بزاڤی چاکسازیی دینیی مەسیحی، سەرهەڵدانی چینی بازرگانی نوێ و دەرکەوتنی شێوەی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری، شۆڕشگەلی دیموکراتیك و پیشەسازی لە پێگەیشتن و سەقامگیربوونی دیموکراسیدا دەوری بنەڕەتییان بووە. ئەم کۆمەڵە هۆکارە لە ناوچەکانی تری دنیادا پێنەگەیشتن و بۆیە لە ئاکامدا دیموکراسیی رۆژئاوا لەوێ دووپات نەبووەوە. دیموکراسی لە رۆژئاوا بۆ خۆی چەن پلەیەکی پێواوە و لە شێوەی تەسك و سەرمایەدارانەوە بۆ شێوەگەلی گشتگیرتر و هێمنانەتر رۆیی و پێگەیشت. لەم بەشەدا سەرەتا ئاماژە بە هەندێ لە پێشینە مێژووییەکانی دیموکراسی لە دنیای باستاندا دەکەین و دواتر زەمینەگەلی کۆمەڵایەتی، ئابووری و فەرهەنگی سەرهەڵدانی دیموکراسی لێك ئەدەینەوە.

### ٣-١. زەمینەگەلی مێژوویی

یەکەمین دامەزراوەی دیموکراتیك لە یۆنان و رۆمی باستاندا پێڕەوکە بوون. هەر وەها یەکەمین هزرەکانی فەلسەفی سەبارەت بە دیموکراسی لە لایەن فەیلەسووفانی ئەوێوە هاتنە بەر باس. لە چاخی رێنسانس لە ئەورووپا، ئەزموونی بە کردەوە و تیۆری دیموکراسی چاخی باستان جارێکی تر بەر سەرنج کەوتەوە و لە نێوان ئامانجی

کۆماری نوێ و دیموکراسیی کۆندا پەیوەندی دۆزرایەوە. بیرمەندانی ڕێنسانس لە سەر لاسایی کردنەوەی ئەزموونی یۆنان و ڕۆم پێ داگر بوون و هەر بۆیە بناغەکانی دیموکراسیی ئەتینا سەر لە نوێ کەوتنە بەر سەرنجی بیرمەندانی سیاسییەوە.

دیموکراسیی یۆنانی، ئەزمونێکی سیاسی بوو کە لە نێوان سالأنی ٥٠٨ تا ٣٣٨ پێش زایینیدا جێگیر بوو. ئەتینا گەورەترین دەوڵەتشاری یۆنانی و بەهێزترین دەوڵەتشاری دیموکراتیك بوو لە نێوان دەوڵەتشارەکانی یۆناندا. گەرچی سیستەمی ئولیگارشی هۆکاری دروست بوونی مەجلیسی بۆ راوەرگرتن لە کاروباری سیاسیدا ڕێك ئەخست، بەڵام بەشداریی سیاسی لەو مەجلیسەدا تەنیا بۆ تاقمێکی کەم لە دەوڵەمەندان بوو. لە بەرانبەردا دیموکراسی ئیمکانی بەشداری ئەژمارێکی بەرچاو لە هاووڵاتیان لە ژیانی سیاسیدا ڕێك ئەخات، دیارە ژنان، کۆیلەکان و نامۆیان «بێگانە» بە هاووڵاتی ئەتینا لە قەڵەم نەئەدران. گۆڕانکاریی سەرەتایی لە سیستەمیی سیاسیی ئەتینادا لە ئەرستۆکراسییەوە بۆ دیموکراسی لە ئاکامی چاکسازیی سۆڵۆن، ڕێبەری هەڵبژاردەی ئەو دەوڵەتشارە لە ساڵی ٥٩٤وە دەستی پێ کرد. بۆ ئەم مەبەستە، سۆڵۆن کەوتە هاوسەنگیی دابەش کردنی سەروەت، کۆنترۆڵی خواردن و رواڵەت کاری، رزگار کردنی هەندێ لە کۆیلەکان و هەر وەها کەوتە دابین کردنی بەشداریی بەربڵاوی سیاسیی خەڵکەوە. بەڵام چاکسازیی سۆڵۆن زۆری نەخایاند و جێگای بۆ حکوومەتی زۆرداران چۆلکرد. یەکێکی دیکە لە دامەزرێنەرانی دیموکراسی ئەتینا, کلیستن بوو. ئەو لە کۆتایی سەدەی شەشەمی پێش زایینیدا کەوتە بەهێز کردنی دامەزراوە دیموکراتییەکان و هەر وەها کەوتە چاکسازیی شاری ئەتینا و بنەڕەتی عەشیرەتی ئەوێی گۆڕی. لە ئاکامی ئەم گۆرانکاریانەدا، ئەتینا لە سەدەی پێنجەمی پێشزایین شایەتی پەرەگرتنی دامەزراوە مەدەنی و دیموکراتیکە سەرەتاییەکان بوو. مەجلیسی هاووڵاتیان، جێگای مەجلیسی ئەشرافی گرتەوەو بەشداری لەو مەجلیسەدا بۆ هەموان ئازاد کرا. شورایەکی بەڕێوەبەرەیی تایبەت، شێوەکاری هەر کام لە دانیشتنەکانی مەجلیسی شاری دادەڕشت. مەجلیس هەر ساڵێ نزیك ٤٠ دانیشتنی هەبوو. ئەندامەتی لە شۆرای بەڕێوەبەریدا بە پێی پشك بوو و هەر مانگە دەگۆڕا، سەرۆکی شوراش بە پێی

پشك دیاری دەكرا. نزیكە ١٠٠٠ پلە لە هەر ساڵدا بەم شێوەیە دەگیرا. كاربەدەستانی گشتی لە كۆتایی هەر ساڵێكدا لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەكرا تا ئەوە دەركەوێ داخۆ تووشی لادان و كەمكارییەك بە تایبەت لە باری ماڵییەوە نەبوونە. گرینگترین كاربەدەستانی هەڵبژێراوی شار، (١٠) فەرماندەی لەشكری بوون. پریكس، رێبەری گەورەی دیموكراسی ئەتینا، خۆی یەكێك لەم فەرماندە هەڵبژێراوانە بوو كە بۆ ماوەی بیست ساڵ لە لایەن خەڵكەوە بۆ ئەو پلەیە هەڵبژێراوە. دیموكراسی ئەتینا لە سەر یەك ١٧٠ ساڵ درێژەی كێشا و كاتێ فیلیپ مەقدوونی لە ساڵی ٣٣٨ پ.ز یۆنانی گرت كۆتایی پێهات. لە رۆمدا ئەزموونی دیموكراسی لە چوارچێوەی حكوومەتی كۆماریدا دەركەوت. بە پێی نووسراوەكانی پۆلیب نووسەری یۆنانیی مێژووی رۆم، سیستەمی كۆماری ئەو ولاتە لە سێ توخمی شایی «كنسوول گەل»، ئەشرافی «پیران» و دیموكراسی «مەجلیسی خەڵكی» پێكهاتبوو. كاتێك شاكان لە نزیك ساڵی ٥٠٩پ.ز سەرنگوون كران، دەسەڵات كەوتە دەستی مەجلیسی ئەشرافییەوە. ئەندامانی پیران لە لایەن خەڵكەوە و بۆ هەتا هەتایی هەڵ دەبژێران و هەر بەم پێیە، پیران سەرچاوەی لە خەڵكییەوە بوو. بەڵام ئەندامەتی لە پیران بەرتەسك كرابووەوە بۆ ئەژمارێكی كەم لە خانەدانە دەوڵەمەندەكان. پیران تا سەدەی یەكەمی پێش زایین بەردەوام دەسەڵاتی لە دەستا بوو، هەر چەندە مەجلیسگەلی خەڵكی لەم چاخەدا زۆر دەسرۆیشتوو بوون. هەروەها دادگەی قەزایی وەك دامەزراوەی پشتیوانی لە مافی خەڵكی دامەزران. هەموو كاربەدەستان بە كونسولەكانیشەوە بۆ ماوەی یەك ساڵ لە لایەن مەجلیسی خەڵكەوە هەڵدەبژێران. كونسوولەكان بە نوێنەری دەوڵەتی رۆم لە لای ولاتانی دەرەوە دەژمێردران و پیرانیان بە رەسمی دروست دەكرد، بەڵام هیچ جۆرە دەسەڵاتێكیان بە سەر رەوەندی راوەرگرتندا نەبوو, كونسوولەكان لە دۆخی قەیرانیدا دەیانتوانی ئەو پیشنیازە بدەن كە دەسەڵات بۆ ماوەی شەش مانگ لە دەستی یەك كەس وەك «دیكتاتۆر»دا دەبێت. كاربەدەستانی لەشكری و دەوڵەتی مافی ئەوەیان هەبوو ئەو یاساگەلە بە پێچەوانەی مافەكانی خەڵكی بزانن و ڤیتۆی بكەن و ئەنجوومەنی میللی بۆ رادەبڕێن بانگ

هێشتن بکەن. بیروڕای ئەنجومەنی خەڵکی بەم شێوەیە «پلبیسیت» دەبوو بە یاسا و پێویستی بە دان پیانانی پیران نەبوو.

ئەنجومەنە گشتییەکان خاوەنی بەرپرسایەتی تایبەت بوون. مەجلیسی ئەشراف کاربەدەستان و قازییان هەڵدەبژارد، شەڕ و ئاشتییان رادەگەیاند و دەنگیان بۆ پێشنیازەکانی کونسوولەکان ئەدا. لەو مەجلیسەدا باسی گشتی نەئەهاتە پێش و لە پێشدا دەوڵەمەندان دەنگیان ئەدا و دوای ئەوەی زۆرینەی دەنگ وەدەست ئەهات، دەنگدان کۆتایی پێئەهات. لە «مەجلیسی قەبیلە»یی کە هێدی هێدی قورسایی و گرینگیان زیادی دەکرد هەندێ یاسایان پەسەن دەکرد و هەندێ کاربەدەست هەڵدەبژێردران. لە کۆتایی سەدەی دووەمدا، کۆماری رۆم تووشی گەندەڵی و داڕووخان هات، حیزبە سیاسییەکان کەوتنە کێبەرکێوە و هەوڵی چاکسازی، کەلێنی لە نێوان رێبەرانی سوننەتی پیراندا دروست کرد و کۆنترۆڵی ئەوانی لە سەر چارەنووسی وڵات کەمڕەنگ کردەوە. لە سەدەی یەکەمی پ.ز دا بە زیاد بوونی تەنگەژەکان، رێبەرانی کۆمار هەر یەکە بۆ خۆی سوپایەکی تایبەتی پێکەوە نا و کەوتنە شەڕ و تەڵەکە بە دژی یەکتری و هەندێ لەو رێبەرانە بە شێوەی کاتی دەسەڵاتی بێ هاوتایان وەدەست هێنا.

لە ساڵی ٤٤ پ.زدا دوژمنانی سزار لە ترسی ئەوەی نەکا ئەو, هێزی پیران لاواز بکات و حکوومەتی زۆرەملی دامەزرێنێ کوشتیان، بەڵام دوای ئەوەی کە کوڕی کۆڵەوەسی سزار لە ساڵی ۳۱ پ.ز بە سەر دوژمنانیدا سەرکەوت سیستەمی کۆماری و پیران و مەجلیسی خەڵکی جێگای خۆیان بە حکوومەتی ئیمپراتۆری سپارد.

هەندێ لە نووسەرانی شێوەکانی حکوومەت، باسیان لە سەدەکانی ناوەڕاست، یازدە تا هەڤدە وەك زەمینەی سەرهەڵدانی دامەزراوە دیموکراتیکەکان کردووە، بە تایبەت باسیان لە دەوڵەتشارەکانی باکووری ئیتالیا، فلۆرانس، ونیز، کۆنفدراسیۆنی سوویس و کۆماری هۆڵەند کردووە. لەم سیستمگەلەدا پرەنسیپی سەروەریی خەڵك و سیستەمی نوێنەرایەتی لە شێوەی جۆراجۆردا بەڕێوە دەچوو، گەرچی حکوومەت لە دەستی کەمینەیەك لە ئەشرافی خاوەن ملك و بازرگاندا بوو و ئەمەش نەك دیموکراسی، بەڵکو ئۆلیگارشی بوو. بە زۆر دەلیل لە سەرەتای سەدەی یازدەوە، شارەکانی ئەورووپا

قورسایی و گرینگی ئابووری و سیاسی زیادیان پەیدا کرد. ئەم دۆخە بە تایبەت لەو شوێنانە هاتە پێش کە دەوڵەتەکانیان بەهێز نەبوون وەك باکووری ئیتالیا، ناوچەی راین و هۆڵەند و بەلژیکا. لە ئاکامدا شارە نۆیکان بوونە خاوەنی خودموختارییەکی بەرچاو و پاساوی نەزەری و یاسایی جۆر بە جۆریان بۆ سەربەخۆیی رێژەیی خۆیان دەهێنایەوە.

دەوڵەتشارەکانی ئیتالیا، «کۆمۆن»یان پێ دەوترا کە بە مانای ملّك و ماڵی هاوبەش بوو. کمۆنگەلی ئیتالیایی لە سەدەکانی یازدە و دوازدەدا شارەکانی وەك بۆلۆنی، جنیوا، پیزا، پیزتورا دروست بوون. لە سەرەتاوە بەشداریی سیاسی لە حکوومەتدا، تەنیا بۆ خاوەن ملّك و ماڵ کرابووەوە. بە گشتی هەر شارێك کاربەدەستێکی «پودستا»ی لە شارێکی دیکە دەعوەت دەکرد تا وەك دادوەر و حاکم، بۆ ماوەی شەش مانگ بە شێوەی عادلانە چاوەدێری کاروباریان بکات. لە سەدەی سێزدەدا چینی بازرگان و پیشەساز کە بزاڤی جۆربەجۆریان رێکخستبوو، هێزیان گرتە دەست و کاربەدەستانی بەڕێوەبەریان بە ناوی «سەرکردەکانی خەڵك» دروست کرد کە هاوشان لەگەڵ «پودستا» لە سامانی چینی بازرگانی پشتیوانیان کرد. بەشداری بە کردەوەی خەڵك لە کاروباری حکوومەتی کمۆندا کەم بوو. لە کۆماری ونیز کە لە سەرەتای سەدەی چواردەدا نزیك ١٢٠٠٠٠ کەس دانیشتوانی هەبوو، کاربەدەستانی سیاسی لە دەستی ٢٠٠ بنەماڵەی ئەشرافیدا بوو کە ئەندامی شۆرای گەورە بوون. هەر وەها لە کۆماری فلۆرانس کە لە سەرەتای سەدەی شانزەدا خاوەنی نزیك ٦٠٠٠٠ کەس بوو، نزیکە ٣٥٠٠ پیاوی چینی سیاسی و خاوەن پلەیان پێکدەهێنا. هەڵبژاردن بەم شێوەیە بوو کە پێرستێك لە کاندیدی ساڵح لە لایەن دەستەی هەڵبژاردنەوە بۆ وەرگرتنی پۆستە دەوڵەتییەکان دیاری ئەکران. دواتر ناوی کاندیدەکانیان لە سەر نەواری جیا ئەنووسی و ئەیانخستە نێو کیسەیەکی چەرمیەوە و دواتر بە پێی پشك کار بەدەستانیان هەڵدەبژارد. زۆر جار سەبارەت بەوەی چ کەسانێك بە ئەندامی دەستەی هەڵبژاردن وەربگیرێن هەرای سیاسی گەورە ئەهاتە ئاراوە. هەندێ لە بنەماڵە دەسترۆیشتووەکان کاریان لە سەر دیاری کردنی ئەندامانی دەستەی هەڵبژاردن ئەکرد. لە درێژەی سەدەی چواردەدا زۆر لە دەوڵەتشارەکانی ئیتالی کەوتنە بەر هێرشی داگیرکارانی دەرەکی, یان کەوتنە بەر شەپۆلی کاربەدەستانی زۆرەملێی نێوخۆییەوە, یان

ئەوەی کە هێدی هێدی تایبەتمەندیی کۆماری و دیموکراتیکی خۆیان لە دەست دا و بۆ ئۆلیگارشی ئەشرافی گۆڕان.

مێژووی کۆماری و دیموکراسی لە سۆییس کە وەك کۆنفدراسیۆنی سۆییس بەناوبانگە، بۆ ساڵی ١٣٩١ دەگەڕێتەوە, ئەو کاتەی کە سێ کانتۆن یان ئەیالەتی گەورە بە مەبەستی سەربەخۆیی خۆیان لە بەرانبەر سوڵتانەکانی هامبۆرگدا یەکیان گرت. کانتۆنەکانی سۆییس بە پێچەوانەی کۆمارەکانی ئیتالیا زیاتر لە کۆمەڵێ گوندی و وەرزێری پێکهاتبوون. بەم حاڵەیشەوە شاری و لادێیی هاوولاتی هاوشان بە حیساب ئەهاتن. هەر کام لە کانتۆنەکان دەسەڵاتی قانوون دانانیان هەبوو و حکوومەت لە هەر کامیاندا بە پێی داب و نەریتی خۆماڵی بەڕێوە ئەچوو. بەڵام کۆنفدارسیۆن خۆی لە هێزێکی ئەوتۆ بۆ کۆنترۆڵی ئەندامانی خۆی بەهرەمەند نەبوو. لە سەدەکانی شانزدە و هەڤدەدا خەڵکانی سۆیس بۆ پێشگیری لە رووخانی کۆنفدراسیۆنەکەیان، بەرانبەر بە سیاسەتی دەرەوە بێ لایەنی خۆیان دەربڕی. هەر لەم سەدەیەدا مەیلی دەروونی کانتۆنەکان بۆ وەرگرتنی ئۆلیگارشی میراتی زیادی کرد.

## ٣-٢. سەرمایەداری و دیموکراسی

دیموکراسیی مۆدێرن لە ژێر کارتێکەریی هەل و مەرجی جۆراوجۆردا پێگەیشتووە و هۆکاری جۆراوجۆر لە سەر هەڵدانیدا بەشدار بوونە. زۆر جار دەوترێ کە سەرمایەداری یەکێك لە هۆکارە بنەڕەتییەکانی بەرفراوان بوونی دیموکراسی بووە. بەم حاڵەیشەوە سەرمایەداری لەگەڵ رژیمی سیاسیی رەنگاورەنگدا پێکەوە ژیاوە. پێوەندیی نێوان سەرمایەداری و دیموکراسی باس و خواسی زۆری لە سەر بووە. یەکێك لە روانینە بەهێزەکان، سەرمایەداری و دیموکراسی بە دوولایەنی یەك راستی دەزانێ. تان و پۆ ئەسڵییەکانی دیموکراسی یەعنی، ئازادی، پەیمان، کێبەرکێ، بەشداری و هتد, تار و پۆی ئەساسی سەرمایەداریشن. لە باری مێژووییشەوە سەرمایەداری و دیموکراسی کەم و زۆر پێکەوە لە دایك بوونە و یەکترییان بەهێز کردووە. لە چاوی خوێندنەوە

سەرەتاییەکانەوە، پەیوەندیەکی نزیك لە نێوان سەرکەوتنی ئاستی پەرەسەندنی سەرمایەداری و سەرهەڵدانی دیموکراسیدا دیتراوە. بەم حاڵەیشەوە پەیوەندیی نێوان دیموکراسی و سەرمایەداری زۆر ئاڵۆزە. سەرمایەداری لەگەڵ سیستمگەلی دیکتاتۆری، فاشیستی و دەسەڵاتخوازدا، هاوڕێ و هاوئاهەنگ بووە. لە لایەکی ترەوە نەریتی دیموکراسی لەوانەیە لە دۆخی زیاد نەکردنی سەرمایەداریدا جێگیربێ، هیندوستان وێنەیەکە لەم بارەوە. جۆرەها دیموکراسی کۆن وەك باسمان کرد لە هەل و مەرجی پێش شێوە بەرهەمهێنانی سەرمایەداریدا پێڕەوکە بوونە. سەرەڕای ئەمانە پارێزەرانی پەیوەندیی ئەساسی لە نێوان دیموکراسی و سەرمایەداریدا دەڵێن کە تەنیا سیستەمی دیموکراسی دەتوانێ لە گۆڕی ئەو دۆزە سیاسی و ئابوورییە ئاڵۆزانە بێت کە لە سیستمگەلی سەرمایەداریدا قوت ئەبنەوە. بێجگە لەمانە، لەم روانگەیەوە لە نێوان هەڵبژاردنی کاڵا لە بازاڕی ئابووری و هەڵبژاردنی سیاسی لە بازاڕی دەنگەکاندا، پەیوەندییەکی جەوهەری هەیە. بە واتایەکی دیکە بێ ئازادیی ئابووری، ئازادیی سیاسی بێ مانایە و بێ ئازادیی سیاسی، ئازادیی ئابووری بە چڵەپۆپەی خۆی ناگات. سەرمایەداری و دیموکراسی لە سەر یەك گوتار و عەقڵانییەت بەندن و شوناس و کردەوەی چوون یەك بۆ مرۆڤ لە بەرچاو ئەگرن.

هەر وەها لە نێوان دیموکراسی و سەرمایەداریدا لە باری چینایەتییەوە ڕێژەیەکی ئەساسی هەیە، لە بەر ئەوەی لە هەر دوودا، بۆرژوازی وەك هۆکاری کەڵەکە بوونی سەرمایە و پارێزەری ئازادی دەور و بوونێکی ئەساسی هەیە. لانی کەم دیموکراسیی بورژوایی بێ سیستەمی سەرمایەداریی ئازاد مومکین نییە. هەر چەندە چینی بورژوا پشتەوانی لە بەشداریی گشتی لە سیاسەتدا نەئەکرد، بەڵام جەوهەری پشتیوانی لە هزری ئازادی، زەمینەی بۆ بەشداریی سیاسی هەموو چینەکان خۆش کرد. بۆچوونێکی دیکە لە هەمان ئیستدلالدا ئاوایە کە لە نێوان دیموکراسی و هێزی چینی نێوەنجیدا ڕێژەکارییەك هەیە. بە پێی ئەم بۆچوونە چینی نێوەنجی بە پێچەوانەی چینی سەروخوار، زۆر جار رۆحیەیەکی هێمن، لێبوردن, ساناگیر و میانەڕەوی هەیە و ڕێگای پەڕگیری و بنەیی ناگرێتە بەر. لانی کەم لە نێوان چینە گەورە کۆمەڵایەتییەکاندا، چینی نێوەنجی

زیاتر لە چینی زەویداران، وەرزێران و کریکاران مەیلی بۆ لای سەرمایەداری و دیموکراسی هەیە.

بە گشتی نووسەرانی جیاواز بە هاوئاهەنگی و ناهاوئاهەنگی جۆربەجۆر لە نێوان سەرمایەداری و دیموکراسیدا، ئاماژەیان کردووە. لەسەریەك دەتوانین بڵێین کە دیموکراسی و سەرمایەداری کاتێ هاوئاهەنگییان هەیە کە هەردووکیان بۆ سەرخستنی ئامانجی بەرابەریی ڕێژەیی لە کۆمەڵگا لە باری ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە یارمەتی بدەن. سەرمایەداری کاتێك ئەبێتە هۆی سەرهەڵدانی نابەرابەریی بنەڕەتی و بەرچاو، دیارە لەگەڵ ئامانجی دیموکراسیدا ناهاوئاهەنگ ئەبێت.

هەر وەها دیموکراسی کاتێك جێگیرتر ئەبێ کە دەسەڵاتی سیاسی تا رادەیەکی زۆر لە دەسەڵاتی ئابووری، سەربەخۆ بوویێتەوە. بە پێی بنەما، سەرمایەداری هۆیی سەربەخۆیی هێزو دەسەڵاتی سیاسی لە ملکایەتی ئابووری پێك دێنی، بەڵام بە کردەوە ئەبێت ئەم سەربەخۆییە ببینرێ تا بزانرێ جێگیر بووە یان نە.

## ۳-۳. زەمینە کۆمەڵایەتییەکان

لە کاتێکدا پەیوەندیی سەرمایەداری و دیموکراسی باس و قسەی گەورە و قورسی لێ کەوتوەتەوە، باسی نوێتر دەربارەی زەمینەی کۆمەڵایەتیی دیموکراسی تەسکتر و روونتر بوونە. تیۆریپەردازی سەبارەت بە هەل و مەرجی سەرهەڵدان و پێگەیشتنی دیموکراسی لەم بوارەدا یەکێك لەسەر ئێشە رۆژانەییەکانی زانایانی سیاسی نوێ بووە و لەم تیۆری دارشتنانەدا، لە سەر دەور و هۆکاری رەنگاورەنگ لە سەر سیستەمی سیاسی پێ داگیراوە. کاتێك پەیوەندیی ئەم هۆکارە رەنگاورەنگە لە بەرچاو بگیرێ, نەزەریەی ئاڵۆزتر دێتە ئاراوە. زەمینەگەلی ئابووری، کۆمەڵایەتی و چاندی زیاتر لە هۆکارەکانی تر وەك سەرەتایەکی پێویست بۆ سەرهەڵدانی دیموکراسی لە بەرچاو گیراوە تا ئەو جێگایەی کە جێگایەك بۆ زەمینەی سیاسی نەماوەتەوە. یەکێك لە روانگە گشتییەکان لە سەر پەیابوونی دیموکراسی، روانگەی ساختی - کارکردی «بنەڕەتی - کردەوەیی»

تالکۆت پارسۆنز، کۆمەڵناسی گەورەی ئەمریکایی بوو کە ئەو لەوێدا لە سەر پەیوەندیی وەکیەکی نێوان سیستەمی سیاسی و سیستمەکانی تری کۆمەڵگا پێداگربوو. لەم رووەوە پێگەیشتنی دیموکراسی پێویستی بە گۆڕانگاری لە سنوورەکانی تر هەیە. ئەم جۆرە ئیستدلالانە گشتین و بۆ وێنە لە نێوان پەرەسەندنی ئابووری و سەرهەڵدانی دیموکراسی پەیوەندیی پێکەوە بوونی مانادار دەبینێ. لە بەکار هێنانی روونتری ئەم روانگەیەدا ئیستدلال کراوە کە کۆمەڵێك گۆڕانگاری لێك گرێدراو لە سنووری ئابووری، فێرکاری و پەیوەندییەکان، سەرەتاییەکە بۆ سەرهەڵدان و سەقامگیربوونی دیموکراسی. سیمون مارتین لیپیست کۆمەڵناسی دیموکراسی لە نێوان گۆڕانگاری لە سنووری هۆکارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سەرهەڵدانی نیشانەکانی دیموکراسیدا، پەیوەندییەکی نزیکی پەیدا کردووە. ئەو لە خوێندنەوەکانی خۆیدا بەم ئاکامە گەیشت کە بە بەراوردکردنی وڵاتانی جۆربەجۆر بە پێی نیشانەگەلی وەك، پەرەسەندنی پیشەسازی، فێرکاری و بە شاری بوون، ئەکرێ بڵێیت لە نێوان دیکتاتۆریی ناسەقامگیر و دیموکراسی سەقامگیردا جیاوازیی ئەساسی و مانادار هەیە. لە لێکۆڵینەوەیێکی تردا کە لە ژێر کاریگەریی ئەم تۆێژینەوەدا لە سەر ٧٥ وڵات ئەنجام دراوە، لە نێوان سەرهەڵدانی نیشانەکانی گەشەی ئابووری و زیادکردنی کێبەرکێی سیاسی وەك نیشانەیەکی ئەسڵی لە دیموکراسی, پەیوەندییەکی ئەرێنی و مانادار پەیدا بووە. لە خوێندنەوەی هاوچەشنی دیکەدا دەرکەوتووە کە سەقامگیر بوونی دیموکراسی لەگەڵ پەرەسەندنی دامەزراوەکانی ئابووریی نوێژەن، سیستەمی فێرکاری، سیستەمی پەیوەندی و رادەی شارنشینی، پێکەوە بوونی باڵای نیشان داوە. لێکۆڵینەوەی لەو جۆرە لە وڵاتانی ئەمریکای لاتین دەری خستووە کە هەرچی دیاردەکانی گەشەی ئابووری سەرکەون، بەشداریی سیاسی و یاساخوازی خەڵکی سەردەکەوێت. ئەم جۆرە خوێندنەوانە گەرچی لە زیادی دان، بەڵام بەر رەخنەش کەوتوون. بۆ وێنە هەندێ لە رەخنەگران وتوویانە جگە لە ئاستی گەشەی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکی دیاریکراو، هیچ پەیوەندییەکی روون و راستەوخۆ لە نێوان پەرەی دیموکراسی و دیاردەکانی گەشەی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا بەدی ناکرێ. هەر وەها وتراوە کە ئەم جۆرە خوێندنەوانە تەنیا

پەیوەندیی پێکەوەبوون نیشان ئەدەن و بە شێوەی هۆکار و ئەنجام دەری ناخەن کە بۆ وێنە، پەرەسەندنی ئاسایش و فێرکاری، خەڵك بۆ بەشداری و کێبەرکێی دیموکراتیك ئامادە ئەکەن, یان ئەوەی کە خودی دیموکراسی، ئاسایش و فێرکاری باشتر دەکات. لە بەر تیشکی ئەم رەخنانەدا لێکۆڵینەوەیەکی تر ئەنجام درا تا پەیوەندییەکی دیاریکراو لە نێوان ئەو سنوورانەدا دەرکەوێت. بۆ وێنە دانیل لرنر کە یەکێ لە کۆمەڵناسە کلاسیکەکانی دیموکراسییە، پەرەسەندنی بەشداریی سیاسی وەك نیشانەیەکی بەرچاوی دیموکراسی, پێویستیی بە تێپەڕ بوونی چەن پلەی یەك لە دوای یەکی وەك پەرەگرتنی شارنشینی، پەرەگرتنی فێرکاری و گەشەسەندنی ئامرازەکانی پەیوەندییەوە هەیە. بە بڕوای لرنر لە هەموو جێگایەکدا پەرەگرتنی شارنشینی یارمەتی بە زۆر بوونی خوێندەواری و فێرکاری داوە و ئەمەش خۆی پەیوەندییەکانی پەرە پێداوە و پەیوەندییەکانیش پەرەیان بە بەشداریی سیاسی داوە.

لە خوێندنەوەی هاوچەشنی دیکەدا لە سەر دەوری دیاریکراوی پەرەگرتنی شارنشینی لە پەرەی ئابووری و خۆخستنی کۆمەڵایەتیدا پێ داگیراوە کە ئەم دوو دیاردەش لە سەر چێ بوونی سوودی گروپی تایبەت و حیزب و کێبەرکێی سیاسی دەوری کاریگەریان بووە. لەم جۆرە خوێندنەوانەدا بە گشتی دیموکراسی بە بەرهەمی گۆڕانکاریی ئابووری و کۆمەڵایەتی لە قەڵەم دراوە. بەڵام لە روانگەی رەخنە گرانەوە، گەشە و پەرەگرتنی دیاردەکانی گەشەی شاری، کۆمەڵایەتی و ئابووری بە زۆری و لە خۆڕا - لانی کەم لە ماوەی کورت خایەندا - دیموکراسی سەقامگیر ناکات. یان ئەوەی کە دیموکراسی وەك لە هیندوستان هەیە کە لە باری ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە پێشکەوتوو نییە. لەم رووەوە وا بە بیر دادێ کە پێویستە، دەوری هۆکاری دیکە بە تایبەت ستراکتوری دەسەڵات لە سنووری سیاسیدا لە بەرچاو بگیرێ. بە واتایەکی دیکە بگۆڕەکانی دیاریکەری دیموکراسی تەنیا کۆمەڵایەتی و ئابووری نین، بەڵکو ستراکتۆری دەسەڵات لەم بوارەدا گرینگە. لە بەر تیشکی ئەم رەخنانەدا، هەندێ توێژینەوە نیشانیان داوە کە پێشینەی سەرهەڵدانی دیموکراسی لە رۆژئاوا بۆ پێش گەشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەگەڕێتەوە. لەم لێکولێنەوانە روونیان کردوەتەوە کە دیموکراسی لەو وڵاتانە

سەقامگیـــرە کـــە خـــاوەنی وێنـــەی گۆڕانکـــاریی سیاســـی زوورەس و گۆڕانکـــاریی ئـــابووری دێرڕەســـن. بـــە پێچـــەوانەوە لـــەو وڵاتانـــەی کـــە پـــێش لـــە سەقامگیـــر بـــوونی بنـــەماکانی دیـــموکراسی، لـــە بـــاری ئـــابووری و کۆمەڵایەتییـــەوە پـــەرەیان ئەســـتاندبوو، دیـــموکراسی زۆر پێی نەگرتووە.

بۆچـــوونەکانی ســـەرەوە بـــە گشـــتی پێشـــاندەری روانگـــەی کلاســـیك لـــە کۆمەڵناســـی دیـــموکراسی دان و لـــە ســـەر دەوری هۆکـــارە نێوخۆییـــەکانی دیـــموکراسی پێـــداگرن. لـــە بەرانبەردا، ئەمڕۆکـــە لـــەو باسـانەدا کـــە لـــە ســـەر شـــەپۆلەکانی دیـــموکراسی دەکـــرێ و دواتـــر سەرەنـــجیان ئـــەدەینێ، دەوری هۆکـــارە ناوچـــەیی و جیهانییـــەکان لـــە پێشـــکەوتنی دیـموکراسیدا زیاتر بەرچاو بوونە.

## ٣-٤. کۆمەڵگای مەدەنی

هەنـدێ لـە نووسـەران لـە باسـی زەمینـە کۆمەڵایەتییـەکانی دیـموکراسیدا، و بـوونی کۆمەڵگـەی مـەدەنی بـەهێز بـە مـەرجی بنـەڕەتی بـۆ دەوام و سەقامگیـریی دیـموکراسی ئـەزانن. کۆمـەڵگای مـەدەنی کۆمـەڵێك نـەهاد و ئەنـجومەن و ڕێکخـراوی کۆمەڵایەتییـە کـە بـە حکوومـەت و دەسـەڵاتی سیاسـی بەنـد نیـن, بـەڵام دەورێکـی کاریگـەریان لـە شـێوەدانانی دەسـەڵاتی سیاسـیدا هەیـە. بـە بـڕوای زۆر لـە نووسـەرانی کۆمـەڵگای مـەدەنی، یـەکێك لـە بناغـە حاشـاهەڵنەگرەکانی دیـموکراسی، کۆمـەڵگای مەدەنییـەو کاتێـك ئـەو کۆمەڵگایـە دادەمـەزرێ نـەك هـەر لـە هێـزی سیاسـی سـەربەخۆیە و خودموختـارە، بـەڵکو چـاوەدێری بـە سـەر نـەهادەکانی دەوڵەتـدا دەکـات و دەستیشـی دەڕوات. کۆمـەڵگای مـەدەنی بە پێی ناسیـن، پێویسـتە خـاوەنی کۆمـەڵێك کایـەو سـنووری گشـتی خودموختـار بێـت کـە لەوێـدا ئەنـجومەن و نـەهادە مەدەنییـەکان بتـوانن کاروبـاری خۆیـان ڕاپـەڕێنن و پارێزگـاری لە سوودی ئەندامانی خۆیان بکەن.

هەر وەها ئەم کایـەو سـنوورانە پێویسـتە لـە بـەر دەسـتی هـەموو خـەڵك دابـن و خـەڵکی بەگشـتی بۆیـان هـەبێ لەوێـدا بەشـداری بکـەن. بـە گشـتی پێویسـتە لـە نێـوان خـەڵك و

دامەزراوە مەدەنیەکان لە لایێک و کۆمەڵەی مەدەنی و دەوڵەت لە لایەکی تره پەیوەندییەکی ئۆرگانێک هەبێت تا دیموکراسییەت بچەسپێ. پاوان کردنی دەسەڵات و سەرچاوەکانی فەرمان لە دەستی هەر تاقم و نەهادێکی سیاسیدا گەر وای لێ بێ کە لەمپەر بۆ بەشداری و رکەبەری تاقم و نەهادی تر دروست بکات، ئەبێتە ئاستەنگێک لە بەر دەم جێگیر بوونی کۆمەڵی مەدەنی و دیموکراسیدا، پەیوەندی نەهادی و لەشئاسا لە نێوان دەوڵەت و کۆمەڵی مەدەنی زۆر جار لە چوارچێوەی دامەزراوی پارلەمانی و حیزبی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکاندا مسۆگەر دەبێ. مەجلیسی یاسادانان، حیزبەکان، چاپەمەنی و راگەیێنەکان، رەهەندی ناسراوی نێوان کۆمەڵی مەدەنی و دەوڵەتن. بنەڕەتی کۆمەڵی مەدەنی بە پێی کۆمەڵ و چاخ بگۆڕە و بە هۆکاری رەنگاوڕەنگی وەك کەلێنی کۆمەڵایەتی، جۆری خەباتی هێزە کۆمەڵایەتییەکان، پێکەوە بوون, یا رێکخراو بوونی چینەکانی ئابووری، جۆری فەرهەنگی سیاسی و نەریتە مێژوییەکان، رادەی درێژ بوونەوەی شوناسە سوننەتییەکان، جەوهەری کۆمەڵایەتیی رژیمی سیاسی، رادەی خەباتی سیاسی ئەندامانی کۆمەڵی مەدەنی پەیوەستە.

کۆمەڵگای مەدەنی بەم مانایە لە سەدەی حەڤدە و هەژدە لە ئەورووپا سەری هەڵدا و بواری جێگیر بوونی بەشداریی سیاسی و رکەبەری و بنەما ئەساسییەکانی تری دیموکراسی خۆش کرد. کۆمەڵێك لە هێز و تاقمی چینایەتی، قەومی، ئایینی، پسپۆڕی و هزری و... هتد لە یەکتر و لە دەوڵەت سەربەخۆ بوون و بۆ سەر خستنی ئامانجەکانیان و بەشداری لە بواری دەسەڵاتی سیاسیدا وەگەڕ کەوتن. شارەکانی ئەورووپا لەم چاخەدا خاوەنی خودموختاریی فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی بەرفراوان بوون. جۆری پەیوەندی لە نێوان کۆمەڵی مەدەنی و دەوڵەت لە وڵاتانی ئەورووپایی لە ژێر کاریگەریی هۆکاری جۆراوجۆری وەك رادەی پێشکەوتنی ئایدیۆلۆژیای لیبرالیزمی سیاسی و ئابووری، بیرکردنەوەی باو سەبارەت بە تایبەتکاریی دەوڵەت، جۆری شۆڕش, یان چاکسازی کە دێتە ئاراوە، رادەی بۆرۆکراتیك بوونی نەهادە سیاسییەکان و دەوڵەت لە باری مێژوییەوە، جۆر و جەوهەری بزاڤە کۆمەڵایەتییەکان و دەنگ بەرز کردنەوە، کزی و بەهێزیی چینی بورژاو و هتد, جێگیر بوو. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ژێر

هۆکاری وەك پێداگرتن لـە سـەر بەرابـەری و ئـازادی، لاوازیـی مێـژووی پاشـایەتی، ئەشرافـی و فیۆدالّی و هۆکاری دیکـە، کۆمـەڵی مـەدەنی بـە باشـی شـنیا و دیـمـوکراسی لیبـرالّی لـە سەر ئەو بنەمایە گوڵی کرد.

جۆری کۆمەڵی مەدەنیش بـە سـەرەنج دان بـە ئیـدئیۆلۆژی سیاسـی تایبـەت، کـە لـە هـەر کاتێکـدا بـە سـەر دەوڵەتـدا زاڵـە گۆڕانکـاری بـە خۆیـەوە بـینی و لـە ئاکامـدا لـە سـەر ناسـنامەی دیـموکراسی جـێ پەنـجەی دانـا. ئیـدئیۆلۆژی و دەوڵـەتی لیبـراڵ زیـاترین بـەرەی تێکۆشـانیان بـۆ کۆمـەڵی مـەدەنی کـردەوە. لەگـەڵ قـەیران و سـەرەولێژ بـوونی لیبـرالیزم و دەوڵـەتی بچـکۆلە و بـێ بەرپرسـایەتی لـە کۆتـایی سـەدەی نـۆزدە و لەگـەڵ سەرهەڵدانی بیـری دەوڵـەتی بـەرپرس لـە بـاری کۆمەڵایـەتی و ئـابووری و پێویسـتیی دەست تێوەردانی دەوڵـەت، کۆمـەڵی مـەدەنی حاڵـەتی تەسکتـری بـە خۆیـەوە گـرت و دیـموکراسی سـیمایەکی نـوێی بـە خۆیـەوە گـرت. لەگـەڵ پـەرەگرتنی سـنووری تێکۆشـانی دەوڵەتیـدا، مـەودای سـەربەخۆیی تێکۆشـانی دامـەزراوەکانی کۆمـەڵی مـەدەنی بـە هـەمان رادە تەسکتـر بووەوە.

دامەزراوە بـوونی دەوڵـەتی خێرومـەن لـە رۆژئـاوا دوای شـەڕی جیهـانی دووەم، لـەم بـوارەدا بەرتەسـکی دروسـت کـرد. بـەلام لادان بـۆ ئیـدئیۆلۆژی نیولیبـرالیزم و پێـداگرتن لـە سـەر دەوڵـەتی بچـووك لـە دەیـەی ١٩٨٠ ژیـانێکی نـوێی بـۆ پـەرەگرتنی دامـەزراوە و رێکخـراوی کۆمەڵی مـەدەنی دەسـتی پێکـردووە هـەر چـۆنیکی بـێ, بازسـازی پەیوەنـدیی نێـوان دەوڵـەت و کۆمـەڵی مـەدەنی بـە مانـای دیسـان ناسـاندنی سـنووری دەسـەلات و خـەباتی دەوڵـەت و گۆڕانگـاری لـە جـۆر و بیچـمی دیـموکراسی دایـە. لـەم پەنـجەرەوە دەور و خـەباتی کۆمـەڵی مەدەنی، یـەکێك لـە پێوانـە ئەساسـییەکانی پۆلیـن کردنـی رژێـمگەلی سیاسـی بـە گشـتی و دیـموکراسی بـە تایبەتییـە. جیـا کردنـەوەی رژێمگـەلی دیـموکراتیك، شـێوە دیـموکراتیك، دەسەلاتـخواز، تۆتالیتـار، فاشیسـتی و هتـد بـە پێـی پێوانـەی خـەبات و توانـایی کۆمـەڵی مـەدەنی و پەیوەنـدی لەگـەڵ دەزگـای هێـزی دەوڵەتـدا ئەنـدازە دەگیـرێ. جیـا کردنـەوەی دیـموکراسی لیبـرال، کۆمەلایـەتی، خێرومـەن، ئەنـجومەنی و هتـد و هـەر وەها بە پێی مەودا و شکڵ و خەباتی کۆمەڵی مەدەنی دەناسێنرێ.

لە لێکدانەوەی تەسکتر لە پەیوەندیی دیموکراسی و کۆمەڵی مەدەنی، لە سەر گرینگی ئەنجومەنگەلی کۆمەڵایەتی وەك توخمەکانی پێکهێنەری کۆمەڵی مەدەنی لە پێگەیشتن و سەقامگیریی دیموکراسیدا پێداگیراوە. ئەنجومەنەکان ئەو دامەزراوانەن کە هاوولاتی لە کۆمەڵگای نۆژەندا بۆ سەر خستنی حەز و ئامانجی هاوبەش دروستیان دەکەن. دیموکراسی بە بێ تۆڕێکی بەربلاوی ئەنجومەنە کۆمەڵایەتییەکان لە بنەڕەتدا نامومکینە. هەرچی بنەڕەتی ئەنجومەنە کۆمەڵایەتییەکان پەرەگرتووتر و چڕتر بێ، دیموکراسی پێگەیشتووتر دەبێ. لەم روانگەیەوە هەندێ لە نووسەران، ئەنجومەنەکان بە ئەسڵی رێکخەری سیستەمی دیموکراتیك لە قەڵەم ئەدەن. بەم حاڵەیشەوە هەندێ لە لایەنگرانی دیموکراسی، فرە بوونی کۆمەڵ و ئەنجومەنەکان بە مەترسی بۆ سەر یەکیەتی سیاسی کۆمەڵگا دادەنێن. بە گشتی لایەنگرانی دیموکراسی ژاکوپنی و رۆسۆیی سەبارەت بە فرەبوونی دامەزراوە و ئەنجومەنی مەدەنی رەشبین بوونە و ئەمانەیان بە رێگر لەبەردەم جێگیربوونی ئیرادەی گشتی داناوە. بە رای ئەوان ئەنجومەن و یەکیەتییەکان بە پشتیوانی لە قازانجی تایبەتی خۆیان، چاکەی مەدەنی و وەفاداری بۆ دەوڵەت، وەك نوێنەری مەسڵەحەتی گشتی لاواز دەکەن و وەفاداری و ئەرکی تایبەت بە خۆیان دروست دەکەن. لە لایەکی ترەوە لایەنگرانی دیموکراسی لیبرال بە پێ داگرتن لە سەر ئیحتمالی سەرهەڵدانی زۆرەملی زۆرینە، لە فرەخوازی و ئەنجومەنگەلی مەدەنی وەك بنەمای دیموکراسی بەرنگاریان کردووە. بە رای ئەوان ئەم ئەنجومەنگەلە تەواوکەر و تەنانەت جێخۆشکەری کردەوەی دامەزراوە رەسمییە دیموکراتیکەکانی وەك مەجلیسی یاسادانان و ئەحزابن. سیستەمی فرەحیزبی بە بێ کۆمەڵگای تێکۆشەر و ئەنجومەنی کۆمەڵایەتی، بۆ بیر لێ کردنەوەش نابێ. وەك دەزانین لایەنگرانی دیموکراسی لیبراڵ و کۆمەڵی مەدەنی، بیرمەندانی وەك جیمز مادیسون، تۆکڤێل و جان ئیستوارت میل ئاماژەیان بە مەترسی ئیستبدادی زۆرینە کردووە. تۆکڤێل پێی وابوو کە ئەنجومەنەکان پارێزەری ئازادی و فرەڕەنگی لە دیموکراسی خەڵکی دان.

نەزەریەکانی لایەنگری دەوری ئەنجومەنە مەدەنییەکان وەك بنەمای دیموکراسی لە سەرەتای سەدەی بیستدا زۆر پەرەیان ئەستاند، بەڵام لە دەیەکانی دواتردا لە بەر پەرەگرتنی دەوڵەتی خێرومەن، لە کزییان دا، گەرچی جارێکی تر لە کۆتایی سەدەی بیستدا گەشەیان کردەوە. لەم روانگەیەوە، ئەنجومەنەکان لە باتی دەوڵەت، کرۆکی ئەسڵی ژیان و کۆمەڵگای دیموکراتیك دروست ئەکەن، لە کاتێکدا لە بۆچوونەکانی لیبرالی کۆندا، بە بەراورد لەگەڵ دەوڵەت گرینگیان کەمتر بوو.

ئەنجومەنخوازان چەمکی دەوڵەت وەك سامانەدەری کۆمەڵگای دیموکراتیك وەرناگرن. بە رای ئەوان وەرگرتنی دەوڵەت لەگەڵ چەمکی ئازادی لە بیری لیبرالیدا دژایەتی لێ دەکەوێتەوە. دیارە ئەوان هەبوونی جۆرێك سیستەمی سیاسی نا مەرکەزی و تەسك وەردەگرن، بەڵام ئەنجومەنەکان ئەبێ کاروباری کۆمەڵایەتی هەڵسوڕێنن و مافی خۆ بەڕێوە بردنیان هەبێ. دەوڵەت تەنیا ئەبێ ئەو یاسا و نەزمە کە ئەنجومەنەکان بۆ خۆیان ناتوانن داییمەرزێنن، دابینی بکەن. گەر دەوڵەت لەمە زیاتر دەوری پێ بدرێ، بە مەترسی بۆ سەر ژیانی ئەنجومەنە مەدەنییەکان دێتە ئەژمار. بە رای ئەوان ئەنجومەنەکان بە مۆڵەتی دەوڵەت هەبوونیان نییە، بەڵکو ئەم مۆڵەتە لە زاتی خۆیاندایە. پێویستیی پاراستنی نەزم و یاسا تەنیا دەوڵەتێکی بچووك و لانی کەمە.

روانگەکانی ئەنجومەنخواز لە درێژەی سەدەی بیستدا، نەیانتوانی لەگەڵ ئیدئیۆلۆژییەکانی لیبرالیزم و سوسیالیزم بەربەرەکانێ بکەن و لە ئاکامدا لە کۆتایی سەدەی بیستدا لە پەل و پۆ کەوتن. ئەنجومەنخوازان، خوازیاری کزی و لاوازی دەوڵەت و لامەرکەزیی سیاسی بوون، لە کاتێکدا لە درێژەی سەدەی بیستدا چێ کردنی دەوڵەتی بەهێز بۆ بەرەنگاری دەرەکی و پێشکەوتنی ناوخۆ بە شتێکی پێویست ئەزانرا. دەوڵەتی خێرومەن خۆی یەکیك لە روالەتە بەرچاوەکانی دەوڵەتی بەهێز بوو، بۆیە ئەنجومەنەکانی کۆمەڵی مەدەنی دەورێکی گرینگ بەڵام پلەدوویان لە سیستەمی دیموکراتیکدا پێ درا. لیبرالیزم دەوری سەرەکی بۆ ئەنجومەنگەلی کۆمەڵی مەدەنی پەسەند نەدەکرد. بەڵام لە کۆتایی دەیەی ۱۹۷۰دا، پێ داگرتن لە سەر دەوڵەتی گەورە، بووروکراسی و دەست تێوەردانی حکوومەت لە ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری، لەگەڵ پەرە

گرتنی ئیدیۆلۆژی نیولیبرالیزم له کزیدا. له باری نێونەتەوەییەوە، جیهانی بوونی بازرگانی و بزاڤە مالییەکان، دەسەلاتی دەولەتیان لە بەڕێوەبردنی ئابووریدا کەم کردووە. بە کۆتایی هاتنی شەڕی سارد، پاساو دانی کۆکردنەوەی هێزی لەشکری و ئابووری دەولەت کاڵ بوەوە. هەر وەها لە باری ئابووریەوە تیۆریەکان لە سەر تایبەتمەندیی روو لە خێری ناوەندی نێوەنجی و بچکۆلەی ئابووری پێیان دادەگرت. بەگشتی لەسەر دەوری ئەنجومەنە مەدەنییەکان لە جێگرکردنی دیموکراسیدا بە مانایێکی تەواوتر، زیاتر پێدادەگیرا.

## ٣-٥. زەمینەگەلی فەرهەنگی و کولتووری سیاسی

هەندێ لە نووسەران دیموکراسی وەك کۆمەلێك روانین، بە بەشێك لە کولتووری سیاسی لە قەلەم ئەدەن. کولتووری سیاسی, کۆمەلی روانین و بایەخە، کە بە ڕەوەند و ژیانی سیاسی, سامان دەبەخشێ. باسی فەرهەنگی سیاسی لە سەدەی بیستدا بە تایبەت لە پەیوەندی لەگەڵ زەمینە فەرهەنگییەکانی دیموکراسیدا هاتە بەرباس. پرسیاری سەرەکی ئەمە بوو چ جۆرە فەرهەنگێکی سیاسی بۆ پەرەگرتنی دیموکراسی بە پیتە؟ پرسیاری لاوەکی ئەمەیە کە کام زەمینەی کۆمەلایەتی و ئابووری و مێژوویی، هۆی پێگەیشتنی خودی فەرهەنگی سیاسی دیموکراتیکە. شێوە روانینی باوی هەر فەرهەنگێکی سیاسیی، کەم تا زۆر شێوە کردەوەی دەسەلاتی دەولەت نیشان ئەدات، بۆیە دەکرێ فەرهەنگی سیاسی وەك فەرهەنگی گشتی بکرێ بە دوو بەشەوە: فەرەنگی سیاسیی ئارمانی و فەرهەنگی سیاسیی راستی. بەم حالەیشەوە مەبەست لە فەرهەنگی سیاسی لە باسکردنی دیموکراسیگەلی ئەمڕۆ, هەمان کولتووری سیاسی واقیعییە. هەندێ لە نووسەرانی دیکە خودی فەرهەنگی سیاسیان کردووە بە دوو بەشەوە، فەرهەنگی سیاسیی گروپی بژاردەی کاربەدەستان و دووەم فەرهەنگی سیاسیی خەلکی. باس کردن لە پەیوەندیی ئەم دوو فەرهەنگە لە باسی دیموکراسیدا ئێجگار گرینگە.

به دەلیلی جۆراوجۆ رەنگە لە نێوان ئەم دوو فەرهەنگەدا ناكۆكی پێش بێت. رەنگە گرووپی بژاردە لە باری هۆگری بۆ دیموكراسی بە بەراورد لە خەڵك دواكەوتووتربن (وەك ئەوەی كە لە رژێمە سوننەتییەكاندا بینراوە) یان پێشكەوتووتربن (وەك ئەوەی كە لە رژێمە نوێخوازەكاندا دەبینرێ). هەر چۆنێكی بێ كەلێنی نێوان ئەم دوو بەشە فەرهەنگییە شتێكی هەتاهەتایی نییە.

نووسەرانی پێشوو كاتێك باسیان لە چاكەی سیاسی وەك پشتیوانی دیموكراسی، دەكرد لە راستیدا مەبەستیان فەرهەنگی سیاسیی دیموكراتیك بوو. هەندێ لە نووسەران فەرهەنگێكی ئەوتۆیان لە راستیدا بە هەل و مەرجی ژیانی چینیكی تایبەتی (وەك چینی نێوەنجی، چینی بازرگانی و هتد) دەزانی و ئەم شتەیان بۆ هەموو خەڵك بە راست نەدەزانی. بە پەرەگرتنی زانستی مرۆڤناسی, فەرهەنگی دوای شەڕی دووەمی جیهان، لێكۆڵینەوە لەسەر فەرهەنگی سیاسیی قەوم و نەتەوەكان بە گشتی پەرەی سەند. هەندێ لەم لێكۆڵینەوانە بۆ ناسینی خوو وخدە و تایبەتمەندیی نەتەوەكان تەرخان كرا بوون. نووسەرانی جیاواز باسیان لە سیماو خووی نەتەوەیی ئەمریكایی، رووسی، ژاپۆنی و ئەڵمانی كرد و لە نێوان ئەم خووە و دیموكراسی, یان دیكتاتۆری پەیوەندیان دۆزیەوە. خووی نەتەوەیی بە تایبەت بە پێی رەوەندی كۆمەڵوەرگیری سەرەتایی لە بنەماڵەدا دەناسێنرێ. لەم روانگەیەوە پەیوەندی نێوان كۆمەڵوەرگیری لە بنەماڵە و دیموكراسیدا بەر چەقی سەرەنجەكان كەوت. لەم روانگەیەوە ئەو روانییانە كە رەهەند و روانینی كۆمەڵوەرگیری سەرەتایی دروست دەكەن وەك بڕوا بەوانی تر یا بڕوا پێ نەكردنیان، هەستی باوەڕ بە خۆ و سەربەخۆیی تاك، چاوەڕوانی لەوانی دیكە.. هتد لە سەر روانین و كردەوەی سیاسی كاریگەرن. رەهەندی دواتری كۆمەڵوەرگیری وەك فێركاریی گشتی و سیاسی، هەستی پیشەیی و هتد, رەنگە روانینی رەوەندی كۆمەڵوەرگیری سەرەتایی سەقامگیر بكەن, یان دژی ببنەوە. لە روانگەی خاوەنڕایانەوە سەبارەت بە بنەماڵە وتراوە، جۆری بنەڕەتی دەسەڵاتی باو لە بنەماڵەدا، لە سەر روانینی باش, یان خراپ سەبارەت بە بەشداری، ركەبەری و دیموكراسی كاریگەرە. زۆر جار سێ جۆر ستراكتۆری دەسەڵات لە بنەماڵەدا جیا دەكرێتەوە.

١- دابەشکردنی دەسەڵات لە نێو ئەندامانـدا، یان کۆنەبوونەوەی دەسەڵات لە دەستی یەك کەسدا بە تایبەت باوك.

٢- کۆ کردنەوەی دەسەڵات لە دەستی باوکدا لەگەڵ پەیوەندی گەرم و دلۆڤانانە

٣- کۆکردنەوەی دەسەڵات لەگەڵ دیسیپلینی توند و تەمیێ کردن و لێداندا.

هەندێ لێکۆڵینەوە نیشاندنی داوە کە باوك لە بنەماڵەگەلی رووسدا تەنیا ئەو کاتە تەمیێ کردن نیشان دەدەن، لەگەڵ مناڵەکانی خۆیاندا کایە ناکەن، مناڵان مافی شەڕ کردنیان نییە و پێویستە هەموو ناکۆکییەکانیان بخەنە بەر دەستی باوکیانەوە. بە پێی هەمان لێکۆڵینەوە هەل و مەرج لە بنەماڵە ئامریکاییەکاندا رێك بە پێچەوانەیە. بە پێی توێژینەوەیەکی دیکە فەرهەنگی خەڵکی باشووری ئیتالیا کە خاکی مافیایە، تەوەرەی لە سەر بنەماڵەیە، بەم مانایە کە پەیوەندیی پێکەوە بوون و باوەڕ و پشتیوانی لە نێو هەر بنەماڵەیەکدا بە هێزە، بەڵام بنەماڵەکان سەبارەت بە یەکتری رەش بین و بێ باوەڕن. هەر ئەمەش یەکێك لە گرێکانی بەردەم بەشداری لە ژیانی گشتی دایە. هەندێ لێکۆڵینەوە لەمەڕ فەرهەنگی سیاسی لە ولاتە ئاسیاییەکاندا دەری خستووە کە لە بنەماڵەی خەڵکانی ئاسیادا ئاکاری باوك و دایك لە نێوان حەزی رەها و قینی رەها لە هات و چۆدایە و منداڵ بەم ئاکامە دەگات کە سەیتەرەی نییە لە سەر ئاکاری کەسانی تر بە سەر خۆیدا. کە وابوو دنیا لە بەر چاوی, ناعەقڵانی، ناوەستا و بێ باوەڕ دەنوێنێ و تەنیا رێگای دابین کردنی ئاسایش، بەرفەرمانی کۆیرانەی باڵادەستان و سەرچاوەکانی دەسەڵاتە. منداڵان زۆر جار هەستی خۆیان سەبارەت بە باوك و دایك, یان بۆ کۆمەڵ و دەوڵەت دەگۆزنەوە و ئەمەش بۆ خۆی یارمەتی بە پێگەیشتن و بەردەوامیی خووی نەتەوەیی ئەدات. بەڵام زۆری نەخایاند کە باسی دڕدۆنگی خووی نەتەوە کەوتە بەر رەخنە و جێگای بۆ باسی روونتری فەرهەنگی سیاسی چۆل کرد و لە ئاکامدا زەمینە بۆ لێکولێنەوە لەسەر مانای فەرهەنگی رەفتاری سیاسیی دیموکراتیك خۆشتر بوو.

لەم لێکۆڵینەوانەدا لە باتی پێ داگرتن لە سەر رەهەندەکانی کۆمەڵوەرگیری سەرەتایی بە تایبەت بنەماڵە، لە سەر رەهەندەکانی کۆمەڵوەرگیری دواتر و رەوەندی پەیوەندییەکان لە داڕشتنی روانین و لایەنەکان پێ داگیراوە. سەرەڕای ئەمانە شێوەی شکڵ گرتنی فەرهەنگی سیاسی بە مانای تایبەتی وشە لە چەقی سەرنج دابووە. لەم نەریتەدا، هەندێ لە

نووسەران چەمکی «فەرهەنگی مەدەنی»یان بۆ بەیان کردنی تار و پۆ و بنەماکانی ئەسڵی فەرهەنگی سیاسیی دیموکراتیك دانـاوە. فەرهەنگی سیاسیی دیموکراتیك لەم روانگەیەوە بریتییە لە ڕێرەوێ سەبارەت بە سیاسەت و حکوومەت کە پێویستی بە رادەیەکی زۆری زانیاریی سیاسی، هەستی سەربەخۆیی و توانـایی تـاکی، هەستی هاوکـاری لەگەڵ کەسانی تـر و هەستی بەشداری لە راوێـژکردنی گشتیدا بێ. «فەرهەنگی مەدەنی» بەم مانایە لەگەڵ سەقامگیریی سیاسی و دیموکراسی خزمایەتییەکی مانـادار پەیدات دەکـات. هەندێ لە نووسەران ئەو فەرهەنگە سیاسییە بە پێت بـۆ جێگیر بوونی دیموکراسی دەزانن کە یەکەم سەبارەت بە بیر و باوەڕی جیاواز ساناگیر بێ و دووەم باوەڕ بەوانی تری تێدا بەرجەستە بێ.

گابریل ئالموند و سیدنی وربـا، کـە دوو زانـای سیاسـی ئامریکـایین, لـە کتێبی بەناوبانگی خۆیانـدا بـە نـاوی «فەرهەنگی مەدەنی ١٩٦٣» وتوویانـە کـە دیموکراسیی سەقامگیر، پێویستی بـە هـاوولاتی گـەلی هەیـە کـە هـەم خـاوەنی فەرهەنگی هـاوولاتی و هـەم خـاوەنی فەرهەنگی بەشداری بـن، لـە بـەر ئـەوەی یەکـەمیان بـەردی بناغـەی هەستی فەرمانبـەری و وفاداری بـە حکوومەتـە لـە کاتێکـدا دووەمیـان بنـەمای بـاوەڕی خـەڵك بـە بەشداری و رکەبـەری لە ژیانی سیاسیدا دروست دەکات.

ئـەم نووسـەرانە جۆرەکـانی فەرهـەنگی سیاسـی لـە سـەر دوو تـەوەرە دابـەش دەکـەن: یەکەمیان لـە سـەر تـەوەرەی لایـەنگریی تـاك سـەبارەت بـە سیسـتەمی سیاسـی کـە بریتیـن لـە ١- تێڕوانینی تێگەیشتنی ٢- روانینی بایەخی ٣- روانینی هەستدار

دووەم لە سەر تەوەرەی لایەنگریەکان کە بریتیـن لە:

١- کەسایەتییە کاربەدەستەکان

٢- سیاسەتەکانی حکوومەت

٣- بنیادەکانی حکوومەتی

لـەم روانگەیـەوە هەرچـی فەرهـەنگی سیاسـی تێگەیشـتنی تـر و سـەر بـە باسـی گشتیتـر بێت، زیاتر بۆ حاڵی دیموکراسی لە بارترە.

هەنـدێك لـە نووسـەرانی دیکـە، فەرهـەنگی سیاسـیان لـە کۆمـەڵگای دیـموکرات لەگـەڵ کۆمـەڵگای سـوننەتی و نادیـموکراتیك بـەراورد کـردووە. بـە بۆچـوونی ئـەوان لـە سیسـتمگەلی دیـموکراتیکدا، رەهەنـدە سـەرەتاییەکانی کۆمەڵوەرگیـری لـە تاکـدا، هەسـتی بـڕوا بـەوانی تـر و

پەیوەنـدیی مرۆڤـانی دروسـت دەکـات بـەڵام رەهەنـدەکانی دواتـر لـە دەقـی ئـەم بـڕوا گشـتییەدا، سـەبارەت بـە دامـەزراوە سیاسـییەکان هەسـتی رەشـبینییان تێـدا سـەوز دەکـات و پێویسـتی تەسـك كردنـەوەی دەسـەڵات دەعـاملێنن. لـە بەرانبـەردا لـە فەرهەنگـە سـوننەتییەکاندا، رەهەنـدەکانی کۆمەڵوەرگیـری سـەرەتایی، هەسـتی بێبـاوەڕی سـەبارەت بـەوانی تـر و پەیوەندییـە مرۆڤەکانیان لە تاکدا دروسـت دەکـەن. لـە حاڵێکـدا لـە رەهەنـدی دواتـردا لـە تـاك چـاوەڕوانییان هەیە تا سەبارەت بە دامەزراوە و رێبەرانی سیاسی ئیمانی تەواویان هەبێ.

### ٣-٦. کەسایەتیی دیموکراتیك

هەنـدێ لـە نووسـەران کەمتـر باسـی زەمینـە فەرهەنگییـەکانی دیـموکراسی دەکـەن و زیـاتر جـەخت لـە سـەر کەسـایەتیی دیـموکراتیك دەکەنـەوە. مەبەسـت لـە کەسـایەتیی دیـموکراتیك لـە رەوانناسـی کۆمەڵایەتیـدا، جـۆرە کەسـایەتییێکە کـە بـۆ بەشـداری لـە ژیـانی گشتیدا بە پیتـە و ژیـانی سیاسـی بـە زەمینـەی تێکۆشـان لـە نێـوان تاکگـەلی هاوشـان دەزانـێ. ئەو لە لایێك نایـەوێت بـە سـەر ئـەوانی تـردا زاڵ بێـت و لـە لایێکـی تـرەوە لـە هێـزی کوێرانـەی دەسـەڵاتداران (کـە دوو تایبەتـمەندیی رەسـەن و جمکانـەی کەسـایەتی دەسەڵاتـخوازە) خـۆی دەبـوێرێ. شـێوەی پێگەیشـتنی کەسـایەتیی دیـموکراتیك، دیـارە باسـێکی ئەسـتەمە، بـەڵام لـەم بوارەدا پێك گەیشتنێك هەیـە کـە ئـەم جـۆرە کەسـایەتییە تایبەتییـە لـە نـاخی بنـەڕەت و رەوەنـدە دیـموکراتیکەکاندا پێرەوکـە دەبـێ و دواتـر لـە لایـەن خۆیـەوە لـە سـەر ئـەم بنـەڕەت و رەوەندانـە کاریگـەری دەبـێ. لـەم روانگەیـەوە، کەسـایەتیی دیـموکراتیك وەك رەوانناسـی کۆمەڵایـەتی چاوی لە تایبەتـمەندییەکانی زاتـی تـاك نییـە بـەڵکو ئـەم کەسـایەتییە بـە بـەهرەی رەوەندگـەلی ئـاڵۆزی کۆمەڵوەرگیـری دەزانـێ و پێـی وایـە هۆکـاری رەنگـاوڕەنگ بـە تایبـەت جـۆری بنـەڕەتی دەسەڵاتی سیاسـی دەورێکـی بەرچـاوی هەیـە. وەك ئاماژەمـان پێـی کـرد یەکـەم کـەس کـە باسـی چـەمکی کەسـایەتیی دیـموکراتیکی لـە حکومـەت و سیاسـەتدا کـرد، هارولـد لاسـول بـووە, لاسول پێی وابوو کەسایەتیی دیـموکراتیك خاوەنی چوار تایبەتـمەندییە:

١- یەکـەم کـراوە بـوون و کۆمەڵایـەتی بـوون و لـە ئاکامـدا پەیوەنـدیی بـەربڵاو لەگـەڵ کەسانی دیکەدا.

٢- پێشخستنی ئەو بایەخ و نیازانەی کە جێی پەسن و سەرنجی کەسانی دیکەن.

٣- بڕوا بە سروشتی باشی بنەڕەتی مرۆڤەکان لەگەڵ بڕوا بە خۆبووندا.

٤- ڕۆچوونی ئەم سێ تایبەتییە بۆ ناخودئاگای تاك.

بە بڕوای لاسول کۆمەڵگای دیموکراتیك پێویستی بە کەسایەتیی دیموکراتیکە و لە نێوان ئەم دووەدا پەیوەندی بەرانبەر هەیە. نووسەرانی جیاواز لە نێوان تایبەتمەندیی کەسایەتی و بەشداری لە ژیانی سیاسیدا پەیوەندی نزیکیان دۆزیوەتەوە. تایبەتمەندیی، کۆمەڵایەتی بوون، دەرەوەخوازی٢، گەش بینی، باوەڕ بە خۆ بوون، هەستی سەربەخۆیی و هانی کەم بۆ دەسەڵاتخوازی و پاوانخوازی، لەگەڵ بەشداری لە ژیانی سیاسی گرێدراویان نزیك بووە.

لە بەرانبەر کەسایەتیی دیموکراتیکدا، باس لە کەسایەتیی دەسەڵاتخواز کراوە. ڕەوانناسیی کۆمەڵایەتی ئەم کەسایەتییەی وەك زەمینەی ڕەوانناسی سیستمگەلی نادیموکراتیك و بەسراو لێك داوەتەوە. ئەم چەمکە باس لە کۆمەڵێك تایبەتمەندیی کەسایەتی وەك خۆ بە دەستەوە دەر لە بەرانبەر دەسەڵاتی سەرتر، زۆر وتن بە ژێردەستان و ئەو هەستەی کە لەگەڵ ئەوانی تردا بەرانبەر نییە «هەستی سەرتر بوون یا خوارتر بوون» ئاماژە کراوە. بە پێی لێکۆڵینەوەی کلاسیکیی ئادرنۆ لە کتێبی کەسایەتیی دەسەڵاتخواز (١٩٥٠) ، کەسایەتیی دەسەڵاتخواز لە ئەساسدا کەسایەتییێکی لاواز و بەسراوە و نائەمنە کە بۆ گەیشتن بە هەستی ئەمنییەت و دەسەڵات، دنیا بە خاوەن نەزم و ڕێك و پێکی دەزانی یان دەیەوێت ئەم نەزم و ڕێك و پێکیە دروست بکات. کەرەسەیێکی باو لە ڕەوانناسیی کۆمەڵایەتیدا بۆ هەڵسەنگاندنی دەسەڵاتخوازی، «پێوانەی فاشیسم» کە لە سەر ئەساسی تایبەتمەندییەکانی کەسایەتیی دەسەڵاتخواز دروست کراوە. بە پێی لێکۆڵینەوەکان، ئەو کەسانەی کە پلەی بەرزتر لە سەر ئەم پێوانە بە دەست بێنن، بەشداریی دیموکراتانەی کەمتر لە خۆیان نیشان دەدەن. کەسایەتیی دەسەڵاتخواز، خوازیاری کۆمەڵێکی پۆلێنکراو و ڕێك و پێکە کە لەگەڵ چەمکی کۆمەڵگای کراوە و دیموکراتیدا خزمایەتییەکی ئەوتۆی نییە.

---

٢- بـرون گـرایـي

# بنەماكانی حكوومەتی دیموكراتیك

لەم وتارەدا دەكەوینە لێكدانەوەی بنەماكانی حكوومەتی دیموكراتیك لە دیموكراسیی هاوچەرخدا كە بە دیموكراسیی ناڕاستەوخۆ ناسراون و لەسەر پرەنسیپی نوێنەرایەتی و پارلەمانتاریزم چێ كراون. گرینگترین باسە گشتییەكانی حكوومەتی دیموكراتیك وەك ئازادیی مەدەنی و سیاسی، كۆماری بوون، پرەنسیپی جیاكردنەوەی دەسەڵات بۆ پێشگیری لە ئیستبداد و كۆبوونەوەی هێز، پارلەمانتاریزم، بزاڤی دروست بوونی حكوومەت لە دیموكراسیدا، بزاڤی بڕیاردانی سیاسی و بەرپرسایەتیی كاربەدەستانی حكوومەتی لە بەرانبەر خەڵكدا هەموو لە چوارچێوەی چەمكی بنەمای حكوومەت لە دیموكراسییگەلدا دێن بەرباس.

## ٤-١. مافی مەدەنی

دیموكراسی لە ئەساسدا پێبەندە لە سەر پێناسەكردنی كۆمەڵێك مافی مەدەنی بۆ هاووڵاتیان، مافی مەدەنی, مافێكە كە هاووڵاتیان بە پێی یاسای ئەساسی و یاسای دیكەش لێی بەهرەمەندن, چەكی مافی مەدەنی لە چاوەڕۆخەی مرۆڤدا بەمانای گشتیی خۆیان, بەكاردێت.

مافی مرۆڤ هەر وەك لە باسە گشتییەكاندا دیتمان، مافێكە كە هەر كەس بە حوكمی ئەوەی كە مرۆڤە، لێی بەهرەمەندە. وەكو پاراستنی گیان، مافی ژیان، مافی دارایی و هتد. بەیاننامەی مافی مرۆڤ كە لە ساڵی ١٩٤٨ لە لایان رێكخراوی نەتەوە یەكگرتوەكانەوە بڵاو كرایەوە، سەرچاوەی گەلێك مافی گرینگە.

بێگومان مافی مرۆڤ بنەمای مافی مەدەنیی هاووڵاتیانە. بەڵام مافی مەدەنی، هەم لە یاسای نێوخۆییدا بە وردی باس دەكرێ و هەم بە شێوەی تایبەتی چاوەدێریی پەیوەندیی نێوان خەڵك, یان هاووڵاتیان و حكوومەتن، بۆ وێنە وەك ئازادی دروست كردنی ئەنجومەن و كۆمەڵە و بەڕێخستنی رێپێوان بە مەبەستی فشار خستنە سەر

حکوومەت بۆ پێ ڕاگەیشتن بە سکالاَو شکایەت و دەنگ هەڵبڕینی خەڵك, یان بە مەبەستی دژایەتی لەگەڵ سیاسەتی حکوومەتدا. بەیەکێك لە ماف و ئازادییە ئەسڵییەکان لە دیموکراسیدا لە قەڵەم دەدرێ و دیارە یاسای ئەساسی پێ لە سەر گرنگیی دادەنێت. یەکەمین چاکسازیی یاسای ئەساسیی ئەمریکا (١٧٩١) ئازادیی ئەنجومەن و کۆمەڵەی لە پەنای ئازادیی بەیان و بلاَوکردنەوەی بیروڕا، بە مافی ئەساسیی تاك لە قەڵەمدا. یاسای ئەساسی زۆر لە دیموکراسیگەل دواتر چاویان لەم چاکسازییە کرد. هەر وەها گەلێك بەیاننامە و پەیماننامەی نیۆنەتەوەیی وەك بەیاننامەی جیهانی مافی مرۆڤ، پەیماننامەی نێونەتەوەیی مافی مەدەنی و سیاسی و هتد پێیان لە سەر مافی ئەنجومەن و کۆمەڵە داگرت، دیارە زۆرتری ئەم پێداگرتنانە لە سەر سروشتی ئاشتیخوازی و یاسایی ئەم کۆمەلاَنە بوو. بەم حاڵیشەوە لێبوردەیی و ساناگیری سەبارەت بە ئەنجومەن و کۆمەڵەگەل جیاوازی هەیە. لە ولاَتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، دەربڕینی بێزاری و وەزمان هێنانی قسەی «ترسێنەر» تا ئەو کاتەی بۆ کردەوەی نایاسایی نەگۆڕاوە، ئازادە. لە کاتێکدا لە زۆربەی ولاَتان جوولاَنەوەی ئەوتۆ قەدەغەیە. دەوڵەتی بەریتانیا لە ساڵی ١٩٨٦ لە بەر نیگەرانی لە بەرز بوونەوەی ئەژماری کۆبوونەوە و ڕێپێوان، وەك هێزی شاراوەی ترسێنەر، یاساییێکی بە ناوی یاسای نەزمی گشتی پەسەند کرد و لەم بارەوە تەسك کردنەوەی لە بەر چاو گرت.

ئازادیی بەیان, بە گرنگترین مافی مەدەنی و سیاسی لە دیموکراسی گەلی ئەمڕۆدا حێساب دەکرێ. بە وتەیەکی دیکە ئازادیی بەیان یەعنی ئازادیی پەیوەندی بە شێوەی قسە کردن و نووسین لە نێو هاوولاَتیاندا. ئەم پەیوەندییە لەوانەیە لە ڕێگای ڕۆژنامە، کتێب و بلاَوکەرەوە جێبەجێ بکرێ. بەم پێیە لە دیموکراسیدا، فەرهەنگ و هونەر و ئەدەبیات، مەیدانی ئازادیی بەیانە و بە دوورە لە سەیتەرەی دەسەلاَتی دەوڵەتی. ئازادیی بەیان هەر وەها پێویستی بە ئازادی و ئیختیار هەیە لە ڕەفتار نواندن و لەبەر دەست دابوونی کەرەستەکاندا. ئازادیی بەیان, ئەساسی جۆرێکی تر لە بیرکردنەوەیە کە ئەویش یەکێك لە بنەماکانی شێوەی ژیانی دیموکراتیك دروست دەکات. لەم شێوە ژیانەدا، ئەوانەی جۆرێکی تر بیر دەکەنەوە ناکرێت بە تاوانی بیروڕای جیاواز و دژ بە

حکوومەت بخرێنە ژێر ئازار و ئەشکەنجەوە. بە گشتی ئازادیی بەیان دەبێتە هۆی گەشەی بیر و توانایی هاوولاتیان لە بەشداریکردن لە ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتیدا، هەر وەها ئازادیی بەیان, دەست پێڕاگەیشتن بەو بۆچوونانە کە لە راستیەوە نزیکترن، هاسان دەکاتەوە. هەروەها پێشگیری لە کەڵەگایی سیاسی و پاوانی دەسەلات, دەکات. بە هۆی رەخنە گرتنەوە، یارمەتی بە دروست بوونی کۆمەڵگای کراوە دەدات و توانایی هاوولاتیان بۆ هەڵبژاردنی هێڵی جیاجیا، کە شێوەی رۆژانەی ژیانی دیموکراتین، بەرز دەکاتەوە. بنەمای ئەسڵی کۆمەڵگای مەدەنی و سنووری گشتیی ئازاد، هەمان ئازادیی بەیانە. چەمکی هاوولاتی بە بێ ئازادیی بەیان شتێکی نامومکینە. وەك ئاماژەی پێ کرا لە روانگەی ئەرەستووەوە، ژیر بێژی و بەیان, تایبەتمەندیی پرەنسیپی مرۆڤ بوونە، لە سیستمگەلی زۆرەملیدا مرۆڤ دەکرێنە حەیوانێکی بەستەزمان، بەلاّم لە پۆلیتیدا، سیاسەت بە مانای پەیوەندیی یەکسان لە نێوان کەسانێکە کە بیر دەکەنەوە و قسان دەکەن. بۆیە چاکەی سیاسی بە بێ ئازادیی بەیان نامومکینە. جان میلتون نووسەری سەدەی هەڤدە و یەکەمین پارێزەری گەورەی ئازادیی بەیان، پێی وابوو کە ئەو چاکانەی کە لە رێگای ئازادیی بەیان و بە شێوەی ئازادانە وەدەست نەهاتبن، شایانی نێوی ئەوتۆ نین.

گرنگترین مافی مەدەنی و سیاسی لە دیموکراسییەکانی ئەمڕۆدا مافی دەنگدانە. مافی دەنگدان دەبێ گشتی، یەکسان، نهێنی و راستەوخۆ بێ. ئەم تایبەتمەندیانە چوار پرەنسیپی بنەڕەتی مافی دەنگدان لە دیموکراسیی ئەمڕۆدا بە حیساب دێن. مەبەست لە گشتی بوونی دەنگدان ئەمەیە کە هەموو هاوولاتیانی یەك ولاّت بە چاوپۆشی لە نەتەوە، جنس، زمان، ئایین، خوێندەواری، دارایی، دۆخی چینایەتی، بیروڕای سیاسی و ئیدلۆژی و هتد، مافی دەنگدانیان هەیە. بەم حالّەیشەوە دیاری کردنی خەت و نیشانی وەك، تەمەنی دیاریکراو، هاوولاّتی بوون، دانیشتوو بوون، هاوولاّتیەتی، لەشساخی دەروونی و نەبوونی پێشینەی داد، بەپێچەوانەی پرەنسیپی گشتی دەنگدان نییە. مەبەست لە پرەنسیپی یەکسانی لە مافی دەنگداندا ئەمەیە کە بایەخی دەنگی هاوولاّتیان یەکسانە. بە جۆرێکی دیکە ناکرێت دەنگی خەڵکی لە سەر ئەساسی قورسی و گرینگی ئابووری، فێرکاری، بیروباوەڕ، رەگەزی، چینایەتی و جنسی

پێوانە بکرێ و جیاوازی لە نێوانیانـدا دابنـرێ و نرخـی کەمتـــر، یـا زیاتریـان پـێ بـدرێ. بـەم پێیە ناکرێت بۆ چـینێکی تایبــەت، ژمـارەییێکی تایبــەت نوێنــەر لەبەرچـاو بگیـــرێ. بـە پێـی پرەنسیپی نهێنی بوون، دەنگـی تاکگـەل بـە شـێوەی نهـێنی، بـە بـێ ئاگـاداری کەسـانی دیکـە و بـێ ئیمـــزا دەخرێتـــە ســـندوقەوە. پرەنســـیپی چـــوارەم بـــەم مانایەیـــە کـــە دەنگـــدەران، خۆیـــان نوێنـــەری خۆیـــان هەڵدەبـــژێرن، نـــەك ئـــەوەی بـــێ ســـەرەنج دان بـــە دەنگـــی ئـــەوان نوێنـــەریان بـــۆ هەڵبژێرن.

## ٤-٢. پرەنسیپی نوێنەرایەتی

پرەنسـیپی نوێنەرایـەتی، بنـەمای بەشـداریی ناڕاسـتەوخۆی خەڵکـە لـە حکوومەتـدا لـە ڕێگـای نوێنـــەرانی خۆیانـــەوە. هەڵبـــەت، لـــە دیـــموکراسییگەلدا، هـــەموو کاربەدەســـتان و کـــارگێڕانی گشـــتی لـــە لایـــەن خەڵکـــەوە دیـــاری نـــاکرێن، بـــەلاّم ئەوانـــەی کـــە ڕاســـتەوخۆ هەڵنابژێرین دەبێ لە لایـەن ئەوانـەوە کـە خـەڵك ڕاسـتەوخۆ هـەڵی بـژاردوون، هەڵبـژێرێن. بـۆ وێنە لە ئـەمریکا کولێـژی هەڵبـژاردن هەیـە کـە سـەرۆك کۆمـار دیـاری دەکـات کـە خۆیـان لـە لایـەن خەڵکـەوە دیـاری دەکـرێن. سـەرۆك کۆمـاریش بـە هـاودەنگیی ئەنجومـەنی پـیران، هـــەموو کـــارگێڕان و کاربەدەســـتانی دەوڵـــەتی فـــێدراڵ دەســـت نیشـــان دەکـــات، لـــە حکومەتگـەلی بـە تـەواوی «کۆمـاری»، یـان دیـــموکراتیکدا، هـیچ پلـەیێك میراتـی و بـۆ هەمیشـە نییـە. بـەم پێیـە ئەنجومـەنێك وەك مەجلیسـی ئـەعیانی بـەریتانیا کـە هەنـدێ لـە ئەنـدامانی میـــراتی و بـــۆ هەمیشـــە دادەنـــرێن، جۆرێـــك تەســـك کردنـــەوە بـــۆ دیـــموکراسیی نوێنەرایەتی لـە قەڵـەم دەدرێـت. لـە دیـــموکراسیی چـاخی باسـتاندا کـە لـە سـەر بەشـداریی ڕاســـتەوخۆی هاوولاّتیـــان دامـــەزرابوو، نوێنەرایـــەتی لـــە کـــارا نـــەبوو. هەنـــدێك لـــە کاربەدەســـتانی سیاســـی بـــە پێـــی تیروپشـــك دیـــاری دەکـــران و بـــە شـــێوەی ســـووڕی، هێزیـــان دەگرتـە دەسـت. بـەلاّم لـە دیـــموکراسیی ئەمڕۆژیـدا ئیمکـانی دیـــموکراسیی ڕاسـتەوخۆ نییـە و بـــەم پێیـــە دامـــەزراوە و پرەنســـیپی نوێنەرایـــەتی چاوپۆشـــی لـــێ ناکرێـــت. پارلەمانـــەکان ئەمڕۆکـە بـە گرینگتـــرین دامـــەزراوەی نوێنـــەری خـەڵکی بـە حیسـاب دێـن و بـە تایبـــەت

مەجلیسی یەکەم یەعنی مەجلیسی ئەسڵی کە هێزی یاسادانانی بەربڵاوی هەیە. مەجلیسی دووەم بە تایبەت لە زەمینەی بڕیار وەرگرتنی ئابووریدا دەسەڵاتی کەمترە.

بۆ یەکەم جار، تۆماس هابز, فەیلەسووفی بەریتانی، چەمکی نوێنەرایەتی هێنایە ناوانەوە. بە رای ئەو حکوومەتی دامەزراو لە سەر شێوەی نوێنەرایەتی, حکوومەتێکە، کە لە سەر داخوازی خەڵك دامەزرا بێ، بە چاوپۆشی لەوەی کە سەڵتەنەتی و میراتی, یان خاوەنی مەجلیسی کارگێڕی بێت. بە رای هابز سەڵتەنەتی رەها وەکو نوێنەری خەڵك چاکتر دەتوانێ پارێزەری ئاشتی و ئاسایش و یاسا بێت. لە بەرانبەردا جۆن لۆك لە سەر ئەو بڕوایە بوو کە حکوومەتی دامەزراو لە سەر نوێنەرایەتی بە مانای تەواوی وشە, حکوومەتی مەجلیسێکە کە هەڵبژاردەی خەڵك بن و یاسادانانیان لە ئەستۆوەیە.

بەم حاڵەیشەوە جۆن لۆك پێی وابوو ئەگەر بەرپرسیی هێزی بەڕێوەبەر کەسێکی تاك و تەنیا بێت و لە مافی ڤیتۆ بەهرەمەند بێت دەتوانین بڵێین کە نوێنەری هەموو کۆمەڵگایە، دیارە بەو مەرجەی کە هەڵبژاردەی خەڵکی بێت. لە سیستەمی ئەمریکا کە بە شێوەی بەرچاو لە سەر بیری لۆك بناغەی دانراوە، سەرۆك کۆمار نوێنەری خەڵکە لە کاتێکدا کە کۆنگرەش وەك نوێنەری بەرژەوەندی و قازانجی تایبەتی کۆمەڵایەتی دەناسرێت. بە گشتی لە سیستمگەلی سەرۆکایەتی لە بەرانبەر سیستەمی پارلەمانیدا، سەرۆك کۆمار نوێنەری گەل و خەڵك بە حیساب دێت. لە سیستمگەلی دوو مەجلیسیدا مەجلیسی یەکەم زیاتر لە دووەم بە نوێنەری خەڵك دەزانرێت و مەجلیسی دووەم کەمتر لە ژێر چاوەدێریی خەڵکی دایە. دیموکراسیگەلی ئەمڕۆکە چەمکی هۆبزی نوێنەرایەتیی خەڵك لە لایان رێبەر یان حاکمی یەکتا و چەمکی کۆنتری نوێنەرایەتیی خەڵك لە لایان مەجلیسەوە تێکەڵ یەکتری کردووە. لە کاتێکدا هەندێك لە نووسەران، پرەنسیپی نوێنەرایەتییان وەك جێنشینی بێ ئەملا و ئەولا و هەرچەن نابەدڵی دیموکراسیی راستەوخۆ قبووڵ کردووە، هەندێکی ئەمەیان بە چاکتر و سەرتر لەم جۆرە دیموکراسییە زانیوە.

بناغە دارێژانی کۆماری ئەمریکا پێیان وابوو کە نوێنەرایەتی زەمینەی فێرکردنی سیاسیی خەڵك و سەرخستی باسە گشتیەکان پێك دێنێ، لە بەر ئەوەی نوێنەران، وەك

تـاقمێکی بـژاردەی هاووڵاتیـان بـە شـێوەی رێـك و پێکتــر و ژیرانــەتر دانیشتــن و هاوبیـــری دەکـەن. خـەڵك تـەنیا مافـــی هەڵبـژاردنی کاربەدەسـت و داوەری سیاسـییان هەیـە و توانـایی حکوومەتی راسـتەوخۆ بـە سـەر خۆیانـدا نییـە. بـەم حاڵەیشـەوە بـە رای ئـەوان، نوێنەرایـەتی تـەنیا دەسـتەبەری حکوومـەتی دڵخوازنییـە و مەجلیسـی نوێنـەران رەنگـە لاریـی جۆراوجـۆری هــەبێ. بــەم پێیــە ئەمانــە لــە نێــوان مەجلیســی پیـــران و هێـــزی دادوەری و هێـــزی بەڕێوەبەریدا لەگـەڵ خـەڵك مـەودایان دانـاوە و ئیزنیـان پـێ داون تـا لـە کـاتی پێویسـتدا بـە کۆنتـــرۆڵ و تەسـك کردنــەوەی مەجلیســی نوێنــەران، هێـــزی خــەڵکی پارســەنگ بــدەن و کۆنتـرۆڵی بکەن. لـە بەرانبـەردا نووسـەری دیکـەی وەك رۆسـو رەخنـەیان لـە سـەر پرەنسـیپی نوێنەرایـەتی هـەبوو, بـە رای ئـەوان نوێنەرایـەتی مـەودا دەخاتـە نێـوان خـەڵك و نوێنەرانـەوە و لـە ئاکامـدا زۆر جـار لـە نێـوان هـۆگری و بـاوەڕی نوێنـەران و خەڵکـدا مـەودا دروست دەبێـت. بـەم حاڵــەوە، ئـەمڕۆ کــە بــە هــۆی پێشـکەوتنی تکنیکـی پێوەنــدیی گرتنــەوە، پێوەنـدیی نێـوان خـەڵك و حکوومـەت، تـەنیا بـە نوێنەرانـەوە نابەسـرێتەوە. خـەڵکی خۆیـان راسـتەوخۆ بیـــروڕای خۆیـان لـە رێگـای بیـــروڕا دەربـڕین، وتوبێـژی رادیـۆ - تەلـەفزیونی و کەرەسـەی دیکـەی پەیوەندییـەوە بـە حکوومـەت دەگەیـەنن. هەنـدێك تەنانـەت وتوویانـە کـە تەلـەفزیۆن, دیـــموکراسیی ناڕاسـتەوخۆی ئـەمریکای بـۆ دیـــموکراسیی راسـتەوخۆی شـێوە ئەتینایی گۆڕیوە.

## ٤-٣. حکوومەتی کۆماری

لـە بیـــرۆکەی سیاسـیی قەدیـــمدا, چـەمکی حکوومـەتی کۆمـاری لـە بەرانبـەر حکوومـەتی پادشـایەتیدا بـە کـار دەهـات. کۆمـار بـەم مانایـە، حکوومـەتێکی ئـازادبوو کـە تیایدا خـەڵکی بـە دوور لـە هێـزی زۆرەملـی کاروبـاری شـار و وڵاتـی خۆیـان رادەپەڕانـد. بـەم پێیـە نـەك ملکـی تایبـەتیی شـا، بـەڵکو کاروپیشـەی گشـتی «Res publica» خـەڵك بوو. شێوەی سـەرەتایی کۆمـاری, هـەمان دەوڵەتشـاری یۆنـانی بـوو کـە تیایـدا هاووڵاتیـان بـە سـەر خویانـدا حکووومـەتیان دەکـرد. ئـەزموونی زیـاتری حکوومـەتی کۆمـاری، لـە کۆمـاری

رۆمـدا سـەری هەڵـدا. کۆمـار لـەو وڵاتـەدا بـە مەبەسـتی بەرانبـەرکێ لەگـەڵ کاربەدەسـتانی داگیـــرکەری بێگانـــە و مـــەیلی خۆبـــەزلزانی و ئیســـتبدادی نێوخـــۆدا، دەبوایـــە توانـــایی پێویسـتی بـۆ پارێزگـاری لـە خـۆی ببوایـە. بۆیـە لـە ئـەدەبیاتی سـەرەتاییدا پـێ لـە سـەر تایبەتـــمەندیی جـــەنگاوەری کۆمـــار دادەگیـــرا، ئەگـــەر ئـــەم تایبەتـــمەندییە تـــەنیا کەرەسـەیێك بـۆ دیفـاع لـە پرەنسـیپی حکوومـەتی ئـازاد بـوو. هاووڵاتیـانی کۆمـار دەبوایـە بەرپرسـایەتیی نیزامـی و حکوومـەتیان لـە سەرشـان بوایـە. دیفـاع لـە ئـازادی و حکوومـەتی ئـازاد، پێویسـتی بـە چاونەترسـی، وڵاتپـارێزی و جـەنگاوەری هـەبوو. دیـارە لـەو کۆمـارە سەرەتاییانەدا هەموو خەڵکی بە هاووڵاتی حیساب نەدەکران.

لە ئـەتینادا, ژنـان و کۆیلەگـەل و بێگانـان لـە ژمـارەی هاووڵاتیـان بـەدەر بـوون. دوای هـەزار سـاڵ وەك دیتمـان، جـارێکی تـر لـە سـەدەی دوازدەدا حکوومـەتی کۆمـاری و ئەندیشـەی کۆمـاری لــە دەوڵــەت شــارەکانی بــاکووری ئیتالیــا وەك ونیــز و فلــۆرانس زیندووکرایــەوە. لــەو کۆمارگەلـەدا، شـورا و دامـەزراوەی جۆراوجـۆر و پلـەو پایـەی جۆراوجـۆر لـە بـەر دەسـتەبەر کردنی بڵاو کردنـەوەی دەسـەڵات لـە نێـو هاووڵاتیانـدا هاتـە ئـاراوە و بـەو پێیـە بەشـێکی بەرچـاو لـە هاووڵاتیـان دەیـانتوانی لـە بـەڕێوەبردنی کاروبـاردا بەشـدار بـن. بـەم حاڵەیشـەوە کۆمارەکـانی ئیتاڵیـا لـە کۆتـایی سـەدەکانی نێوەڕاسـتدا لەگـەڵ مەترسـی هێرشـی حکوومـەتی سـەڵتەنەتی خۆی و دەرکەوتنی کاربەدەستانی خۆبەزلزان رووبەڕوو بووەوە.

نیکولـو ماکیـاڤیلی تیۆریسـیەنی بـەناوبانگی سیاسـیی چـاخی رێنسـانس ئیلهامـدەری بیـــری کۆمـــاری بـــوو و کەوتـــە بـــاس و لێکدانـــەوەی پێویســـتیی پـــەروەردەکردنی هاووڵاتیـــانی ئازاد و جەنگاوەر بۆ پارێزگاری لـە شـاری خۆیـان و دروسـت کردنـی ئـایینی مـەدەنی لـە بـاتی مەسـیحییەت. لــە بــەر هانــدانی هاووڵاتیــان بــۆ بەشــداری لــە حکوومــەت و پــەیڕەوی و فەرمانبەری لە کاربەدەستان.

یـــەکێکی دیکـــە لـــە پـــارێزەرانی کۆمـــاری، هـــاووڵاتی ئـــازاد و جـــەنگاوەر، نووســـەری ئینگلیسـی جیمـز هرنیگتـون بـوو کـە لـە کتـێبی وڵاتـی ئوقیانوسـیە (١٦٥٦)دا وێنەیـەکی لە شاری دڵخوازی کۆمـاری پیشـانداوە کـە لـەودا هاووڵاتیـانی ئـازاد و جـەنگاوەر بـە سـەرە لـە کاروبـاری بـەڕێوەبردنی حکوومەتـدا بەشـداری دەکـەن. لـە سـەدەی ١٨دا ژان ژاك رۆسـۆ لـە

کتێبی پەیمانی کۆمەڵایەتی (١٧٦٢) خۆیدا، کۆماری دڵخوازی کلاسیکی دیسان زیندوو کردەوە. کۆماری بە دڵی رۆسۆ لە سەر وجودی یاسادانەر وەك نوێنەری ئیرادەی گشتی و بەشداریی راستەوخۆی خەڵك لە بەڕێوەبردنی حکوومەتدا، مەزهەبی مەدەنی «واتە مەزهەبێك کە دەبێتە هۆی پەیوەندیی مەدەنی و گفتدان بە ئیرادەی گشتی کۆمەڵگا» هەستی جەنگاوەرانەی هاووڵاتیانی پێ بەند کرابوو. پەیوەندی هزری کۆماری بە مانای کلاسیکی خۆی و جەنگاوەری و تایبەتمەندیی نیزامی و ئازادەگی و هەستی هاووڵاتی بوون، وەك نیشانەی ئیرادەی چاکەی گشتی، لە بەرهەمی رۆسۆدا بە چلەپۆپە گەیشت. لە بەرانبەردا لە چاخی تازەدا, کۆماری بوون لەگەڵ هەستی بازرگانی و تاکخوازی جووت بوو. بە رای جێرمی بنتهام, فەیلەسووفی قازانجخوازی بەریتانی، کۆمار جۆرێ حکوومەتە کە تیایدا داخوازە تایبەتەکانی خەڵك بەدی دێن و دەبێ لە بەرانبەر ئەو داخوازیانەدا حکوومەت بەرپرس بێت. بەم جۆرە لە سەدەی نۆزدەدا هزری کۆماری, زۆربەی تایبەتمەندییە کلاسیکەکانی خۆی لە دەستدا و بۆ کۆماری لیبراڵ یا بۆرژوازی مودێرن گۆڕا. لێرەدا چەمکی ئازادی نەك بە مانای دیفاع لە دەوڵەتشاری ئازاد و جەنگاوەری و تێکۆشانی گشتی، بەڵکو لە ئازادی و مافی تایبەت لە دەورانی ئاشتیدا خۆی نواند. بەم پێیە هەندێك لە رەخنەگرانی کۆماری لیبراڵی نوێ نیگەرانی ئەوە بوون کە هاووڵاتیان لەم جۆرە دەوڵەتانەدا بە ناوی ئازادی و بە هرەمەندیی لە مافی تاکەوە، گۆشەنشین بن و بکشێنەوە و سەبارەت بە کاروباری گشتی, هۆگریان لە دەست بدەن. هەندێك لە نووسەرانی ئەم دواییانە وەکو هانا ئارنت فەیلەسووفی ئەڵمانی کەوتنە پارێزگاری لە شێوە کۆماری کلاسیك و رەخنەیان لە کۆماری لیبراڵ و سەرمایەداری نوێ گرت. بە بڕوای هانا ئارنت سەرمایەداری, هەستی تاکەکەسی, جێنشینی هەستی گشتیی تاك لە کۆماری ئارمانی و کلاسیکدا کردووە.

### ٤-٤. جیاکردنەوەی هێزەکان

مەبەست لە جیاکردنەوەی هێزەکان، سپاردنی هێزە ئەسڵییەکانی دەوڵەت، واتە هێزی یاسادانان، بەڕێوەبردن و داد بە دامەزراوەی جۆراوجۆر. ئامانجی سەرەکی جیا

کردنەوەی هێزەکان وەك یەکێك لە ستوونەکانی دیموکراسی، پێشگیری لە سەرهەڵدانی ئیستبداد و زۆرەملی و ناوەندخوازی و پاوان کردنی هێزە، یان بە واتاییێکی دیکە دەستەبەر کردنی ئازادییە. سەرچاوگەی ئەم نەزەریەیە دەبێ لە چەمکی حکوومەتگەلی تێکەڵ و فرەرەنگدا بدۆزینەوە کە بۆ یەکەمین جار لە بیری سیاسیی یۆنانییەکانەوە هەڵقوڵی.

بە تایبەت پۆلیپ, مێژوونووسی یۆنانی, پێی وابوو کە لە ڕێگای تێکەڵ کردنی ئوسوڵی حکوومەتی جوراوجۆر واتە، مۆنارشی، ئارسیتۆکراسی و دیموکراسییەوە دەکرێ حکوومەتێکی ئارام و نەگۆڕ دروست بکرێت لە بەر ئەوەی هەر کام لەم ئوسوڵ و توخمانە نوێنەری چینێکی کۆمەڵن. بیرمەندانی سەرەتای لیبرالیزم پێیان وابوو کە یەکێك لە کەرەستەکانی گەیشتنی حکوومەت بە ئامانجەکانی بۆ پارێزگاری لە مافی سروشتی و بناغەیی خەڵك، جیاکردنەوەی هێزەکانی دەوڵەتە. لۆك پێی وابوو کە دەبێ لە نێوان سێ هێزی یاسادانەر، بەڕێوەبەر و فدراتیودا جیاکردنەوە هەبێت. هێزی یاسادانەر دەبێ بە تایبەت لە کاروباریماڵیدا خاوەنی هێزی بێ ئەملا و ئەولا بێ. هێزی بەڕێوەبەر کە لە دەستی شادایە، ئەرکی بەڕیۆبردنی یاسایە، بەڵام دەتوانێ یاساکان ڤیتۆ بکات و هەر وەها لە ژێر چاوەدێری پارلەماندا، بە مەسڵەحەتی خۆی بۆ دابینکردنی چاکەی گشتی هەوڵ بدات. لە تیۆری لۆکدا هێزی داد لە ژێر دەسەڵاتی هێزی بەڕێوەبەر دایە، بەڵام لۆك باسی لە هێزی دیکەی بە ناوی «هێزی فدراتیو»٣وە دەکرد، کە دەبێ ڕێك و پێك کردنی پەیوەندیی دەرەوەی حکوومەت و دۆزی جەنگ و ئاشتی و دیپلۆماسی بەڕێوە ببات. دیارە ئەم هێزە لە کردەوەدا لەگەڵ هێزی بەڕێوەبەر یەکێك بوو، لە بەر ئەوەی هەر دووکیان پێوستیان بە دەست پێ ڕاگەیشتن بە هێزەکانی چەکدار بوو. بەم حاڵەیشەوە گەرچی هێزی بەڕێوەبەر دەبوایە لە ژێر چاوەدێری هێزی داددا بوایە، بەڵام«هێزی فدراتیۆ» بەو شێوە لە ڕێگای یاساوە کۆنترۆڵ ناکرێت و خراوەتە دەستی مەسڵەحەتی کارگێڕەوە، لە بەر ئەوەی ناکرێ دەربارەی کردەوە و ئاکاری هێزە دەرەوەییەکان یاسای نیۆخۆیی دەستکاری بکرێت.

---

3- Fedrative power

بەناوبانگترین راڤەکەری نەزەریەی جیاکردنەوەی هێز، مۆنتسکیۆ بوو کە سیستەمی سیاسیی ئینگلیسی وەك نموونەی دڵخوازی جیاکردنەوەی هێز پیشنیاز دەکرد. لەم سیستەمەدا پارلەمان لە دوو مەجلیس پێکهاتووە، یەکەم مەجلیسی ئەعیان و دووەم مەجلیسی عەوام. هێزی بەڕێوەبەر کە لە دەستی شادایە و شا تەنیا بەڕەێوبەری یاسایە و مافی ڤیتۆی نییە. هێزی داد دەزگای سەرەکی دابین کردنی ئازادی و ئاسایشی هاوولاتیانە. سیستەمی جیاکردنەوەی هێز لە مانای مودێرنیدا بۆ یەکەم جار لە یاسای ئەساسیی ئەمریکادا رەنگی دایەوە. دامەزرێنەرانی کۆماری ئەمریکا سەرەنجی تایبەتیان بەم پرەنسیپە دابوو. جیمز مادیسۆن پێی وابوو کە جیاکردنەوەی هێزەکان ناکرێ شتێکی رەها بێ، بەڵکو دەبێ کەرەسەی چاوەدێر دابنرێ کە هێزکان بە رێژەیی بە کار بێن. بۆ وێنە هێزی بەڕێوەبەر نابی یاسادانان وە ئەستۆ بگرێ بەلام چاکتر وایە لە چوارچێوەی مافی ڤیتۆدا بەشێکی هەبێ تا بتوانێ کۆنگرە کۆنترۆڵ بکات. باشترین رێگای جیاکردنەوە و هاوسەنگ کرانی هێزەکان بە رای مادیسۆن ئەوە بوو کە هەر کام لەو هێزانە خاوەنی کەرەسەی پێوست بۆ بەرنگاری لە بەرانبەر دەستدرێژی دوو هێزەکەی تر دابن. هێز دەبێ لە بەرانبەر هێزدا رابگیرێ تا ناوەندی هێز چێ نەبێ. بۆ دابین کردنی بەڕێوە بردنی پرەنسیپی جیاکردنەوەی هێزەکان لە لایەن کۆنگرەوە وەك ئەرکی سەرەکی حکومەت بە حیساب دێت، دوو مەجلیسی پیران و نوێنەران بە مەبەستی کۆنترۆڵ و چاودێریی یەکتری دروست کران. جیاوازی ئەو دوو مەجلیسە لە باری شێوەی هەڵبژاردنی ئەندامان و هەر وەها لە باری ئیختیاراتەوە بوو (ئیختیاراتی تایبەتی مەجلیسی نوێنەران لە کاروباری مالّی و ئیختیاراتی تایبەتی لە کاروباری دانانی کاربەدەستان بوو) کە ئەمەش هۆی چاودێری ئەم دووەی بە سەر یەکتریدا پێك دەهێنا. هەر وەها لە باری دەستەبەر کردنی جیاکردنەوەوە، هیچ دەورێك بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار لە لایەن کۆنگرەوە دیاری نەکرا و یاسا پەسەندکراوەکانی کۆنگرەش بە شێوەی مەشروت مافی ڤیتۆیان بۆ دیاری کرا.

هەروەها دەورێك بۆ کۆنگرە لە دەستتێوەردان لە مووچە و دەخڵی پوولّی ئەندامانی دوو هێزەکەی تردا دیاری نەکرا. لە سیستمگەلی پارلەمانیدا جیاکردنەوەی هێزکان

گوێرەبییە. پارلەمان یاسادانەر و دەستەی دەوڵەت بەڕێوەبەری یاسایە. بەم حاڵەیشەوە دەستەی دەوڵەت لە لایان زۆرینەی پارلەمانەوە دەنگ وەردەگرێ. سەرەڕای هەموو ئەمانە لە سەدەی بیستەمدا بە سەرنجدان بە دەوری روو لە زیادی هێزی بەڕێوەبەر، هاوسەنگی هێزەکان لە نێوان پارلەمان و دەستەی حکومەتدا لە سەر یەك بەقازانجی هێزی بەڕێوەبەر وەرچەرخاوە. لە ئامریکای سەدەی نۆزدەدا بە گشتی سەدەی زاڵی کۆنگرە بوو. بەڵام لە سەدەی بیستەمدا جیاکردنەوەی موتلّەقی هێز وەبەر رەخنەکەوت.

وودرو ویلسۆن سەرۆك کۆماری ئەمریکا دەلیلی دەهێنایەوە کە جیا کردنەوەی هێزەکان هۆی سەرەکی ناکارامەیی حکوومەت، کەم و کوڕی یاسادانان، لاوازیی چەمکی بەرپرسایەتیی کاربەدەستانی گشتی لای بیروڕای خەڵکی پێك دێنێ. لە سەدەی بیستەمدا بە گشتی بە روو لە زیاد کردنی تایبەکارییەکانی حکوومەت، هێزی دەوڵەتی فیدراڵ رووی لە زیادی کرد و کردەوە، کە تا کاتی خۆی بە بەشێك لە یاسادانان دەژمێردرا، لە لایەن سەرۆك کۆمار و هێزی بەڕێوەبەرەوە جێبەجێ دەبوو.

## ٤-٥. چاوەدێریی هێزەکان بە سەر یەکتریدا

ئامانجی لە بەرچاو گرتنی رێگای جۆراوجۆر بۆ چاوەدێریی هەر سێ هێزی، یاسادانەر، بەڕێوبەر و دادوەر بە سەر یەکتریدا راگرتنی هاوسەنگییە لە نێوانیاندا. رێگای ئەوتۆ دیارە لە یاسای ئەساسیی دیموکراسییەکاندا لە بەر چاو دەگیردرێ. پێویستیی پرەنسیپی جیاکردنەوەی هێزەکان، چاوەدێریی ئەوانە بە سەر یەکتری دا. لە سیستمگەلی پارلەمانیدا کە ئەندامانی هێزی بەڕێوەبەر لە نێو ئەندامانی پارلەماندا دەست نیشان دەکرێن، ئەندامانی دەوڵەت دەکەونە بەر پرسیار و لێپرسینەوەی پارلەمانەوە. لە سیستمگەلی فرەحزبیدا کە لە سەر نوێنەرایەتیی رێژەیی بونیادنراون، سەرۆك کۆمار، رێبەری حیزبی خاوەن زۆرینەی کورسی پارلەمان، وەك سەرۆك وەزیران دیاری دەکات و سەرۆك وەزیریش ئەندامانی کابینەی خۆی لە ئەندامانی پارلەمانی حیزبی خۆی, یان ئەحزابی هاوپەیمان هەڵدەبژێرێ.

بەم جۆرە لە دیموکراسیگەلی پارلەمانیدا ئەندامانی کابینەی حکومەت بە شێوەی بەرچاو لە ئەندامانی پارلەمان پێك دێن. بە پێچەوانەوە لە دیموکراسیگەلی سەرۆکایەتی, یان شێوە ئەمریکی، ئەندامانی هێزی یاسادانەر ناتوانن ئەندامی هێزی دادەوەری بن. لەم جۆرە سیستمگەلەدا ئەندامانی هەر هێزێك، بە شێوەی جیا و جیاواز لە یەکتری، بۆ ماوەی جۆربەجۆر دیاری دەکرێن. لە ئەمریکا ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران بۆ ماوەی دوو ساڵ و لە نێوان ٤٣٥ بازنەی هەڵبژاردنی یەك نوێنەریەوە دیاری دەکرێن، لە کاتێکدا ئەندامانی مەجلیسی پیران بۆ ماوەی شەس ساڵ دیاری دەکرێن و هەر ئەیالەتێك بە بێ لە بەرچاو گرتنی دانیشتوان، دوو نوێنەر دەنێرێتە ئەنجومەنی پیران. سەرۆك کۆماری ئەمریکا لە لایان زۆرینەی ٥٣٨ دەنگی ئەندامانی کالیجی هەڵبژاردنەوە، دیاری دەکرێ کە خۆیان لە لایان دەنگدەرانی ئەیالەتەکانەوە دیاری کراون. لە ئەمریکا کۆنگرە لە ڕێگای دوا چاوەدێری بەسەر دانانی یاسادا سەرەڕای ڤیتۆی سەرۆك کۆمار، چاوەدێریی سەرۆك کۆماریش دەکات. مەجلیسی سەنا دەسەڵاتی تایبەتی سەبارەت بە قبووڵ کردنی پێشنیازەکانی سەرۆك کۆمار بۆ کاربەدەستانی باڵا هەیە. زۆرینەی دوو لە سێی ئەندامانی مەجلیسی نوێنەران دەتوانن سەرۆك کۆمار بخەنە بەر لێپرسینەوە و لە کار لای دەن، دیارە بەو مەرجەی زۆرینەی دوو لە سێی ئەندامانی مەجلیسی سەناش دەنگ بە مەحکووم بوونی سەرۆك کۆمار بدەن. لە لایێکی ترەوە سەرۆك بە هۆی مافی ڤیتۆوە بە سەرکۆنگرەدا چاوەدێری دەکات. گەڵاڵە پەسەند کراوەکانی کۆنگرە دەبێ بۆ ئیمزا پێش کەشی سەرۆك کۆمار بکرێن، گەر سەرۆك کۆمار ئیمزای کردن، گەڵاڵەی پرۆژە دەبێ بە یاسا، جگە لەمە لەگەڵ دەلیلەکانی ڤیتۆی سەرۆك کۆمار، دیسان بە کۆنگرە دەدرێتەوە. ئەگەر هەر دوو مەجلیس، بە زۆرینەی دوو لە سێوە گەڵاڵەی ناوبراو پەسەن بکەن، لەم کاتەدا گەڵاڵە بۆ یاسا دەگۆڕدرێ. سەرۆك کۆمار تەنیا دەتوانێ گشتی بوونی گەڵاڵەی کۆنگرە ڤیتۆ بکات و مافی ئەوەی نییە بەشێکی پەسەند بکات و بەشێکی رەد بکاتەوە. هەر ئەمەش بۆ خۆی مافی ڤیتۆی سەرۆك کۆمار تەسك دەکاتەوە. سەرۆك کۆمار هەموو قازییەکانی فیدراڵ و هەر وەها

قازییەکانی دیوانی باڵا، دەست نیشان دەکات و مەجلیسی سەناش بە دەنگی زۆرینەی ئەندامان پەسەندی دەکەن.

## ٤-٦. پارلەمان و پارلەمانتاریزم

پارلەمان, یان مەجلیسی نوێنەرانی خەڵك کە گرینگترین ئەرکی یاسادانانە دڵی لێدەری دیموکراسییە، گەرچی لە سیستەمی نادیموکراتیشدا پارلەمان هەیە. رادەی پارلەمان لە باری ژمارەی نوێنەرانەوە هاوسەنگییەکی روونی لەگەڵ ژمارەی دانیشتوانی وڵاتدا نییە. نێوەنجی ئەندامانی پارلەمان ١٠٠ تا ٣٠٠ کەسە. پارلەمانی لیختنشتاین ١٥ ئەندامی هەیە. هەندێك لە پارلەمانانی کۆنی ئەورووپا زیاتر لە ٦٠٠ ئەندامیان هەبووە. مەجلیسی نوێنەران لە ولایەتە یەکگرتووەکاندا ٤٣٥ ئەندامی هەیە. بناغەی رەوایی نوێنەرانی مەجلیس ئەو وەکاڵەت و نوێنەرایەتییەیە کە لە لایان ئەو هاووڵاتیانەوە پێیان دەدرێ کە ئەوانیان هەڵبژاردووە. نوێنەران لە باری پلە و پایەوە یەکسانن. پارلەمان بە لانی کەمەوە شوێنی باسکردنی پرسە گشتییەکانە، بەڵام بە گشتی نەهادی یاسادانان و رێکخستن و پەسندکردنی بودجەی وڵاتیشە.

لە سیستەمگەلی سەرۆکایەتی وەك ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نوێنەران خاوەنی دەسەڵاتی بەربڵاون لە باری یاسادانان و پەسەن کردنی بووجەوە لە سیستەمگەلی پارلەمانیدا هێزی بەرێوەبەر لەم بارەوە دەوری تایبەتی هەیە, بەم مانایە کە زۆربەی گەڵاڵەکانی یاسادانان پێشکەش بە مەجلیس دەکات و لە باری پەسەند کردنیانەوە لە پارلەماندا کەم تا زۆر دەور دەبینێ. لە سیستەمگەلی ئەوتۆدا لە لایێکی ترەوە پارلەمان لە هەڵبژاردنی ئەندامەکانی هێزی بەرێوەبەردا دەوری گرنگ دەبینێ. ئەندامانی ئەم هێزە بە گشتی لە نێوان رێبەرانی حزب, یان ئەحزابی دەسەڵاتدار لە پارلەماندا دیاری دەکرێن. لە زۆربەی سیستەمەکاندا پارلەمان بە شێوەی جۆراوجۆر چاودێریی کاری هێزی بەرێوەبەر دەکات. بە لاواز بوونی هێزی پارلەمانەکان لە کاری یاسادانان و رێك و پێك کردنی بووجەدا گرنگی زۆر بە کاری چاوەدێری دراوە.

بناغەی ڕەوایی پارلەمان لە سەر نوێنەرایەتی، لە لایەن خەڵکەوە دامەزراوە. لە هەندێك وڵاتی دیموکراسیدا، وەك ئینگلستان، مەجلیسی دووەم وەك بەشێك لە ئەشرافییەتی کۆن، لە سەر بناغەی نوێنەرایەتی لە لایەن خەڵکەوە دانەمەزراوە. بەڵام لە هەموو دیموکراسییێکدا مەجلیسی سەرەکی، لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە مسۆگەر دەبێ، بەم حاڵیشەوە لە مێژووی دیموکراسیدا پارلەمانەکان بە یەك ڕادە دیموکراتیك نەبوونە. بەربڵاو بوونی چڕی و ژمارەی دەنگدەران و لاچوونی گرێ و لەمپەری جۆربەجۆری ڕێگای دەنگدان، پێویستی بە دیموکراتیکتر کردنی پارلەمانەکان بووە. نزیکەی یەك لە سێی پارلەمانەکانی دنیا لە دوو ئەنجوومەن پێکدێن. نیوەی ئەندامانی مەجلیسی دووەم ڕاستەوخۆ لە لایەن خەڵکەوە دیاری دەکرێن. نیوەی ئەندامانی دیکەیان دادەنرێن یان ناڕاستەوخۆ هەڵدەبژێردرێن. بەم حاڵەیشەوە لابردنی مەجلیسی دووەم بۆچوونی سەرەکی نییە. بەڵکو بۆچوونی پاراستنی مەجلیسی دووەم هەروەها بەهێزە، بەتایبەت لە وڵاتانی فیدراڵ وەك ئەمریکا و ئەڵمان کە مەجلیسی دووەم نوێنەری ولایەتەکانە.

لەگەڵ فرەوان بوونی مافی دەنگدان، پارلەمانەکان دیموکراتیکتر بوونە. لە سەرەتادا و لە زۆربەی وڵاتاندا، مافی دەنگدان تەنیا بە خاوەن داراییەکان درابوو، لە پلەی دواتر مافی دەنگ بە پیاوان بەخشرا، دواتر لەمپەری جنسیەت و ڕەگەزی و ئەتنیکی وەلا نرا، تەنیا لەمپەر و مەرجی سەر ڕێگای دەنگ ئەمڕۆ تەمەنە. بەگشتی تەمەنی دەنگدان ١٨ ساڵییە. لەگەڵ بڵاو بوونەوەی مافی دەنگدان و زیادبوونی دانیشتوان, شێوەی دەنگ پێویستی بە ڕێکخراوە پەیدا کردووە. بە پێی ئوسوول دەنگدەران بە پێی حەوزەی جوغرافیایی دابەش دەکرێت و نوێنەران، نوێنەری ئەو حەوزانەی هەڵبژاردنە.

بەم جۆرە چەمکی کۆنی دابەش بوونی حەشیمەت بە پلە و چین کە لە مەجلیسەکانی پێش چاخی دیموکراسی بەرچاو بوو، وەلا نراوە. هەر وەها حزبە سیاسییەکانی نێو و دەرەوەی پارلەمان لە باری بۆچوونی فیکرییەوە لە سەر حەشیمەتی دەنگدەران ڕێك دەخرێن. تایبەتکارییە ئەسڵییەکانی حزبە سیاسییەکان دیاری کردنی نوێنەرانی هەڵبژاردن، هاندانی دەنگدەران بۆ بەشداری لە هەڵبژاردن، دابین کردنی

بەرنامە و سیاسەتی تایبەت و دەستەبەر کردنی بەرپرسایەتیی نوێنەران سەبارەت بە دەنگدەران. دابەش کردنی سنووری هەڵبژاردن بە پێی وڵاتان جیاوازی هەیە. لە ئەمریکا بازنەگەلی هەڵبژاردن سەرەتا بە پێی حەشیمەت لە نێو وڵایەتەکاندا دابەش دەکرا. دواتر پارلەمانی ولایەت سنووری هەڵبژاردنی مەجلیسی نوێنەران بە جۆرێك دەست نیشان دەکات کە حەوزەکان, حەشیمەتی وەك یەکیان هەبێ و کەمینە نەتەوەییەکان بتوانن بەشی خۆیان لە کورسییەکانی پارلەمان وەدەست بێنن. لە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپایی حەوزەگەلی هەڵبژاردن لە لایەن کۆمۆسیۆنی دادوەر و ناحزبییەوە دیاری دەکرێت. لەم وڵاتانەدا ڕەوتی حەشیمەتی یەکسان بە وردی پەیڕەو ناکرێت.

نزیکە نیوەی دیموکراسییەکانی ئەمڕۆ لە هەر حەوزەیەکی هەڵبژاردنەوە چەند نوێنەر دیاری دەکەن. لە ئاکامدا پارتی جۆراوجۆر دەتوانن بە پێی ڕێژەی نوێنەر، بە پێی ژمارەی دەنگەکانی خۆیان کورسی پارلەمانی وەدەست بێنن. لە چوارچێوەی سیستەمی نوێنەرایەتی ڕێژەییدا ژمارەی حیزبەکان سەر دەکەوێ. زۆربەی وڵاتان بە مەبەستی پێشگیری لە چوونە سەری ژمارەی حیزبە سیاسییەکان، مەرجی وەدەست هێنانی پێنج لە سەدی دەنگیان لە لایەن هەر حیزبێکەوە، پێش دیاری کردنی بەشیان لە کورسی پارلەمان، بە زۆرەملی داناوە.

هەڵبژاردن بۆ پارلەمان لە زۆربەی وڵاتاندا پێویستی بە مەرجگەلێکە. ئامانجی ئەم مەرجانە دەستەبەری توانایی ئەندامانی پارلەمانە لە بەڕێوەبردنی کار و بەرپرسایەتییەکانیان دا. لەو مەرجانە، بە لانی کەمەوە تەمەنی ٢١ساڵ (لە ئەمریکا بۆ مەجلیسی نوێنەران لانی کەم ٢٥ ساڵ و مەجلیسی سەنا لانی کەم ٣٠ ساڵ تەمەنیان پێویستە) ، هاووڵاتی بوون و دانیشتووی وڵات بوون بۆ ماوەی دیاریکراو، نەبوونی پێشینەی خراپی داد و نەبوونی پلە و کاری دەوڵەتی بە پێی وڵاتان.

ئەرکی نوێنەران تەنیا کاردانەوەی داخوازی دەنگدەران نییە، بەڵکو بە سەرنجدان بەوەی کە ئەمانە ئەزموونی پارلەمانی و سیاسی وەدەست دێنن، دەبێ لە دارِشتنی شێوەی داخوازی پرژ و بڵاوی دەنگدەران، دارِشتنی سیاسەت و گەلاڵەی دۆزەکان و بە گشتی وریا کردنەوەی دەنگدەران تێکۆشەرانە بجووڵێنەوە.

### ٤-٧. بنیادی پارلەمان

نوێنەرانی پارلەمان کە بە پێی یاسا لەگەل یەکتری یەکسانن، بە شێوەییێك دەتوانن بە هاوبیری گەلە کۆمەکی بکەن کە لە چوارچێوەی وێنەیەك لە پەیوەندیی بونیادی و ڕێکخراوەییدا جێگیر بن. هەر کام لە پارلەمانگەل لە مێژووی خۆیاندا، شێوەی ڕێکخراوەیی تایبەتی خۆیان وەدەست دێنن و سەرەڕای ئەمەش بە زانیارییەوە بۆ ڕێکخراوەکە ڕێگا چارەی بە کردەوەی تایبەت دیاری دەکەن، بۆیە لە پارلەمانێکدا کە ئەندامان یەکسانن، دابەش کردنی کار و سەر و خواری پلەی هێزێك دەر دەکەوێ کە هاوبیریی مومکین دەکات.

پارلەمان دەبێت بۆ کۆمەڵێك گروپ و قازانج وەڵامدەر بێ و بۆیە بۆ ئەم کارە کۆمیتەی تایبەتی دیاری دەکات. بۆ وێنە مەجلیسی نوێنەرانی ئەمریکا خاوەنی ٢٢ کۆمیتەیە. لە وڵاتانی ئەورووپییدا نێوەنجی ١٠ تا ٢٠ کۆمیتەی پسپۆڕی لە پارلەماندا هەیە. لە پارلەمانی ئینگلستاندا، زۆر جار کۆمیتە بە شێوەی کاتی بۆ پێداچوونەوە بە دۆزێکی تایبەتدا چێ دەبێ و دواتر هەڵیدەوشێننەوە. هەر ئەمەش لاوازیەکی ڕێژەیی پارلەمانی ئینگلیسە لە بەرانبەر هێزی بەڕێوەبەر و ڕێبەرانی حیزب و دەزگای دیوانی دەوڵەت دا. یەکێك لە ئەرکەکانی کۆمیتەکانی پارلەمان, چاوەدێرییە بە سەر کاری وەزارەتەکاندا کە لەوانەیە بە قەد دانانی یاسا، خاوەنی گرینگی بێت. کۆمیتەکانی پارلەمان لە هاوکاری و هاوبیری و پسپۆڕیی دەستەی کارناسی بەهرە وەردەگرن. کۆنگرەی ئەمریکا خاوەنی ٣٠٠٠ ئەندامی دەستەی کارناسییە کە لە بواری جیاجیادا پسپۆڕن.

حیزبە سیاسییەکان لە نێو پارلەماندا خۆیان سازمان دەدەن. ئەندامانی پارلەمان کە سەر بە یەك حزبی سیاسی بن لە نێو خۆیاندا ڕێبەر و سەرۆکی پارلەمان و هەندێ جار، سەرۆکی کۆمیتەکان دیاری دەکەن و دەربارەی ئەو دۆزانەی کە لە پارلەماندا دەخرێنە بەر باس، سیاسەتی تایبەتی خۆیان بەڕێوە دەبەن.

لە ئاکامدا، بۆچوونی ئەندامانی پارلەمان، بونیادی حیزبی بە خۆوە دەگرێ. بونیادی حیزبیانەی بیروبۆچوونەکان لە پارلەماندا لە هەموو دیموکراسییەکاندا، جگە لە ئەمریکا، زۆر بە هێزە. لە کۆنگرەی ئەمریکا نزیکەی نیوەی دەنگەکان بونیادی حیزبییان

هەیە، بەم مانایە کە زۆرینەی نوێنەرانی دیموکرات بە دژی زۆرینەی کۆماری، دەنگ دەدەن، لە دیموکراسییەکانی تردا ئەم ژمارەیە بە ٩٠ لە سەد دەگات. لە سیستمگەلی پارلەمانیدا کاتێك کە دەوڵەت لە حیزبی زۆرینەی مەجلیس پێکهاتبێ، دیسپلینی حیزبیی پارلەمان بە بەهێز بوونی زیاتری دەوڵەت یارمەتی دەگەیێنێ، بە پێچەوانەوە لە سیستەمی سەرۆکایەتی ئەمریکادا کە لەوێ دوو پلەی سەرۆك کۆماری و کۆنگرە لە دەستی دوو حیزبی دیموکرات و کۆمار دایە، هاودەنگی حیزبی لە کۆنگرەدا دەبێتە هۆی لاوازیی دەوڵەت، لەم حاڵەتەدا تەنیا ئامێری دەستڕۆیشتنی دەوڵەت لای کۆنگرە مافی ڤیتۆی سەرۆك کۆمارە.

رادەی دەستڕۆیشتوویی کۆمیتە و حیزبەکان بە سەر بڕیارەکانی پارلەماندا، پەیوەندی بە بۆچوون و پەیڕەوە نێو خۆییەکانەوە هەیە. پەیڕەوی ناوخۆ، شێوەی بەڕێوە چوونی دیمانەی گشتی و شێوەی لابردنی موناقشەی دوو مەجلیسی یاسادانان دیاری دەکات. پەیڕەوی ناوخۆی پارلەمان رەنگە نووسراو و دارێژاو بێ, یان تێکەڵێك لە داب و بایەخی نەنووسراو و رۆژانە لە پارلەماندا بێ. پەیڕەوی نێوخۆیی زۆربەی پارلەمانەکان لە یەکەمینی ئینگلستان وەرگیراون. لە سەر یەك پەیڕەوەکانی پارلەمانی لە ئەساسدا لە سەر سوننەت، مێژوو، داب و نەریت، تاکو دانانی خەت و نیشانی تازە. دەستوور و پەیڕەوی نێوخۆیی پارلەمان لە دابەش کردنی دەسەڵات لە نێوان کۆمیتەکانی پارلەمان، نێوان کۆمیتەکان و هەموو پارلەمان، نێوان زۆرینە و کەمینە و هەر وەها لە دیاری کردنی رێکخستنی لێکۆڵینەوە لە گەڵاڵەکان دەوری کاریگەری هەیە.

یاسادانان بە بڕیاردان لەسەر گەڵاڵەکانەوە دەست پێ دەکات، گەڵاڵەکان لە لایەن ئەندامانی پارلەمان (لە کۆنگرەی ئەمریکا) یان کابینە (لە سیستمگەلی پارلەمانیدا) یا ولایەتەکان (لە سیستەمی فیدراڵیدا) یان دەنگدەران (لە پارلەمانی ئەیالەتی ئەمریکا و سوویسدا) و یان کۆمیتەی پارلەمانی (زۆربەی وڵاتان) پێشکەش دەکرێ. زۆر جار، گەڵاڵەکان دەدرێنە کۆمیتەکان تا دوای لێ ورد بوونەوە و رێکخستنی بە پارلەمانی بدەنەوە. بە پێی بابەت ویرکردن دەربارەی گەڵاڵە، رەنگە بە زۆرینەی ئاسایی ئەندامانی ئەوێ، یان زۆرینەی بەرچاو لە هەموو ئەندامان، یان زۆرینەی سێ لە پێنج،

یـان دوو لـه سـێ، یـان سـێ لـه چـواری ئەنـدامان جێبـەجێ بکـرێ. بـە پێـی ئایینناmـەی نێوخـۆیی، دەنگـدان لەوانەیـە بـە دەنـگ، یـان لـە ڕێگـای دەسـت هەڵبـڕین، یـان هەسـتانە سەر پێ یـان دەنگـی نووسـراوی نهـێنی جێبـەجێ بکـرێ. کاتێـك پارلـەمان لـە دوو مـەجلیس پێکهاتبـێ، ڕەوەنـدی تـەوێرکردن ئـاڵۆزتر دەبـێ و ئایینناmـەی تایبـەت، شـێوە و جـۆری پێکهـاتنی نێوانیـان دیـاری دەکـات. لـە وڵاتـە یـەکگرتوەکانی ئـەمریکادا کۆمیتـەی ڕاوێـژکاریی هاوبەشـی دوو مـەجلیس، بـۆ ڕێـك کـەوتنی ئـەوتۆ لـە بەرچـاو گیـراوە. ئـەم کۆمیتە لەوانەیە زیـاتر لـە ١٠٠ کـەس لـە ئەنـدامانی هـەر دوو مەجلیسـی لـە خـۆ گرتبـێ. لـە وڵاتـانی دیکـەی وەك فەڕەنسـە و کانـادا، گەڵاڵـەی یاسـایی ئەونـدە لـە نێـوان دوو مەجلیسدا ئاڵ و گۆڕ دەکـرێ، تـا دەقێـك لـە لایـەن هـەر دوو لاوە پەسـەند دەکـرێ. لـە بڕێـك لە وڵاتانـدا وەك ئینگلـیس و ئاڵمـان، دوا بڕیـار بـە مەجلیسـی یەکـەم دراوە. وتووێـژی گشـتی سـەبارەت بـە گەڵاڵـەکان لـە پارلـەمان بـە گشـتی لـە سـێ کاتـدا جێبـەجێ دەبـێ، مـاوەی وتووێژ بـە پێـی ئایینناmـەی گشـتی تەسـکە. بـە گشـتی ڕێبـەرانی حیزبـەکان لـە مەجلیسـدا دوای پێکهاتن لـە نێـو خۆیانـدا، مـاوەی کـاتی هـەر ئەنـدامێك لـە وتووێـژدا دیـاری دەکـەن. ئـەرکی سـەرۆکی مـەجلیس پاراسـتنی ڕێـك و پێکـی لـە وتووێـژان و پێشگیـری لـە قسەکردنی بە شێوەی دوور لە ئەدەبە.

لـە زۆربـەی پارلەمانەکانـدا کـات و سـاتێکی دیـاریکراو بـۆ پرسـیار و لێپرسـینەوە لـە سـەرۆك وەزیـر و وەزیرانـی دیکـە لـە بەرچـاو گیـراوە تـا هـەموو خـەڵکی لـە چـۆنیەتی مەسـەلەکە ئاگـادار بینـەوە. لەسـەریەك ڕێکخسـتن و ئایینناmـەی نێوخـۆی پارلـەمان کۆمەڵێك تاکی یەکسان و هاوهێز، بۆ ڕێکخراوەیێکی یەکگرتوو و لەش ئاسا دەگۆڕێ.

گرینگتـرین ئـەو ڕەخنانـەی کـە لـە پارلـەمان دەگیـرێ، بریتیـن لـە: چـۆنیەتی نابەرابـەریی ئەنـدامان، لایـەنگریی ئەنـدامانی لـە بۆچـوونی حیزبـی لـە بـاتی سـنووری لـێ هەڵبـژێردراوی، پەیوەنـدیی نزیکـی نێـوان نوێنـەران و تاقمـە دەستڕۆیشـتووەکان، دیسـان دروسـت کردنـەوەی کـەلێنی قـەومی و کۆمەڵایـەتی لـە پارلەمانـدا، کـەم دەسـەڵاتی لـە ڕاکێشـانی سەرنـجی گشـتی خـەڵك بـە شـێوەی بـەردەوام بـۆ لای کاروبـاری خۆیـان، تایبەتـمەندیی بوروکراتیـك و ئـاڵۆزی بـەردەوامی بونیـادی پارلـەمان، ئاکـاری دوورووانـەی

نوێنــەران لــە پێکهــاتنی خشــکەیی لەگــەڵ نــەیاران لــە لایێــك و رکەبــەری لــە دەورەوە لەگەڵیاندا، لەم لاوە، کەم بوونەوەی دەوری یەکەمی بەردەوامیان، واتە یاسادانان.

### ٤-٨. دیـموکراسیی پارلەمانی و دیـموکراسیی سەرۆکایەتی

سیســـــتمگەلی پارلـــــەمانی و ســــەرۆکایەتی دوو شـــکڵی بەرچـــاوی حکوومـــــەتی دیـــموکراتیکن. لــە سیســتمگەلی ریاســەتیدا، ســەرۆك کۆمــار و پارلــەمان (یــان کــۆنگرە) هەر کـام بـە جیـاوازی بـۆ ماوەیـەکی دیـاریکراو هەڵدەبـژێردرێن. بـە گشـتی کـۆنگرە نـاتوانێ سەرۆك کۆمار لە سەر کار لابـدات، هەرچـەند بـە دەگمـەن ئیمکـانی ئـەوە هەیـە کـە کـۆنگرە سەرۆك کۆمار وەبەر لێپرسـینەوە بــخات. لـە لایێکـی تـرەوە سـەرۆك کۆمـار نـاتوانێ کـۆنگرە هەڵوەشـێنێتەوە. بــە پێچــەوانەوە، لــە سیســتمگەلی پارلەمانیــدا، ســەرۆکی دەوڵــەت (زۆر جار سـەرۆك وەزیـران) لەوانەیـە بـە پێـی نـەهێنانی دەنگـی بـڕوا لـە کـار وەلا بنـرێ. سـەرۆك وەزیریش بـە گشـتی دەتـوانێ پارلـەمان هەڵوەشـێنێتەوە و داوای هەڵبـژاردنی نـوێ بکـات. کـە وابـــوو لـــە سیســـتەمی ســـەرۆکایەتیدا جیاکردنـــەوەی هێزەکـــان بـــە قـــووەتترە. بـــەڵام لـــە سیستمگەلی سەرۆکایەتیدا سـەرۆك کۆمـار راسـتەوخۆ لـە لایـەن خـەڵك یـان ناڕاسـتەوخۆ لـە رێگـای کـالێجی هەڵبژاردنـەوە دیـاری دەکرێـت. بـەڵام لـە سیسـتمگەلی پارلەمانیـدا خـەڵك تــەنیا نوێنــەرانی خۆیــان بــۆ پارلــەمان هەڵدەبــژێرن و نوێنــەرانیش ســەرۆکی حکوومــەت دیـاری دەکـەن. لـە سیسـتمگەلی پارلەمانیـدا سـەرۆکی وڵات (سـەرۆك کۆمـار یـان شـا) هێزی بەڕێوەبردنی نییـە و حکوومـەت لـە دەسـتی سـەرۆکی وڵات یـان سـەرۆك وەزیردایـە. لـە سیسـتمگەلی سـەرۆکایەتیدا لەمپـەر لـە رێگـای دیسـان هەڵبژاردنـەوەی سـەرۆك کۆمـاردا هەیە، بـەڵام لـە سیسـتەمی پارلـەمانیـدا سـەرۆك وەزیـر دەتـوانێ تـا ئـەو کاتـەی حیزبەکـەی، یـــان هاوپارلـــەمانی لایـــەنگری حیزبەکـــەی لـــە پارلەمانـــدا زۆرینـــە بـــن، لـــە دەســـەڵات بـــمێنێتەوە. لـە سیسـتمگەلی سـەرۆکایەتیدا خـەڵکی لـە کـاتی هەڵبـژاردن سەرنـــجیان دەدەنـە کەسـایەتیی بەربـژاری سـەرۆك کۆمـار نـەك بـە سیاسـەت و بەرنامـەی حیزبـی. لـە ئاکامـدا لەوانەیـە کەسـێك لـە هەڵبژاردنـدا سـەرکەوێ کـە هـیچ حیزبێـك نـەبێت لـە

کۆنگرەدا پشتیوانی لێوە بکات و لە کۆتاییدا نەتوانێ کارامەیی پێویست لە خۆی نیشان بدات. بەڵام لە سیستمگەلی پارلەمانیدا، سیاسەتمەدارێك کە بیەوێ پلەی سەرۆك وەزیران وەدەست بێنی, دەبێ لە پشتیوانی بەربڵاوی حیزب, یان کۆمەڵێك حیزبی هاوپەیمان بێ و پشتیوانی حیزبی خاوەن زۆرینە یان کۆمەڵێك لە حیزبەکان لە پارلەماندا بە دەست بێنی. لە سیستمگەلی سەرۆکایەتیدا، سەرۆك کۆمارێك ئەگەر دەنگ نەهێنێ بۆی هەیە بە شێوەی گشتی لە چوارچێوەی تێکۆشانی سیاسی بێتە دەر، بەڵام لە سیستمگەلی پارلەمانیدا، رێبەری شکست خواردووی دەنگ هێنان، رێبەری ئۆپۆزسیۆن بە دەستەوە دەگرێ. لە سیستمگەلی پارلەمانیدا تەنیا پارلەمان لە رەوایی دیموکراتیك بەهرەمەندە و پارلەمان دەتوانێ سەرۆك وەزیر دانێ یان وەلای بنێ. بەڵام لە سیستمگەلی سەرۆکایەتیدا، سەرۆك کۆمار و کۆنگرە هەر دوو لە رەوایی دیموکراتیك بەهرەمەندن. ئەگەر کێشە لە نێوان ئەم دووەدا هاتە ئاراوە، تەنیا رێگا بۆ سەروبەرکردنی ئەم کێشەیە، پرسکردن بە دیوانی عالی, یان دیوانی یاسای ئەساسی. لە ئەمریکا گەر سەرۆك کۆمار لە پشتیوانی بەرچاو لە کۆنگرەدا بەهرەمەند نەبێ، لە بەرێوەبردنی سیاسەتەکانیدا تووشی زۆر تەنگ و چەڵەمە دەبێ و لە هەمان کاتدا ناشتوانێ کۆنگرە هەڵوەشێنێتەوە.

هەندێك سیستەمی دیموکراتیکیش هەن کە نیوەسەرۆکەیەتیان پێ دەڵێن. لەم سیستمانەدا سەرۆك کۆماری هەڵبژاردە و سەرۆك وەزیریش هەیە کە لە لایەن زۆرینەی پارلەمانەوە دیاری کراوە. سەرۆك کۆمار بە گشتی دەپەرژێتە سەر پەیوەندییەکانی دەرەوە و کاروباری دیفاعی و سەرۆك وەزیر کاروباری بەرێوەبەری جێبەجێ دەکات. لەوانەیە سەرۆك کۆمار لە حیزبێك و سەرۆك وەزیر لە حیزبێکی دیکە بێت.

## ٤-٩. رەوەندی دامەزرانی حکوومەت

رەوەندی دامەزرانی حکوومەت, یان بژار کردن و دانانی ئەندامانی هێزی بەرێوەبەر لە بزاڤە بەرچاوەکانی ژیانی سیاسییە لە دیموکراسیی پارلەمانیدا. حکومەت لە دیموکراسیی پارلەمانیدا بە گشتی کابینە یان شورای وەزیرانی پێ دەوترێ. لە سەرووی

دەستەی حکوومــەت، ســەرۆك وەزیــران، یــان ســەدری ئــەعزەم هەیــە. دەســتەی حکوومــەت بــە گشتی حەفتەی جارێـك کۆبوونــەوەی هەیــە. ژمــارەی ئەنــدامانی کابینــە بــە گشــتی ١٠ تــا ٣٠ کەســە و پێکــەوە بڕیــار دەدەن. ئەنــدامانی کابینــەی حکوومــەت بــە شــێوەی تــاك و کــۆ لــە بەرانبەر پارلەماندا بەرپرسن.

پارلــەمان دەتــوانێ بــە دەنگــی بــێ بڕوایــی لــە کاریــان دابــەزێنێ. لــە هەنــدێ وڵاتــان، هەنــدێ لــە ئەنــدامانی کابینــە بەرپرســی هــیچ وەزارەتێــك نیــن. لــە دیــموکراسیی پارلەمانیدا دامەزرانی کابینەی حکوومەت لە بەر سێ مەبەستی ئەسڵی دەکرێ:

یەکەم: دیاری کردنی وەزیران لە بەر چاوەدێری بە سەر دەزگای دیوانیدا،

دووەم: داڕشتنی بەرنامە، سیاسەت و بۆچوونی حکوومەتی

سێیەم: دیاری کردنی پشتیوانان و رکەبەرانی حکوومەت لە پارلەماندا.

رەوەنــدی دامــەزرانی کابینــەی حکوومــەت ئەمڕۆکــە لــە ئەســتۆی ئــەحزابی سیاســییە. لــە سیســتمگەلی دوو حیزبییــدا، حیزبــی ســەرکەوتوو بــە شــێوەی پــاوانی دەکەوێتــە دامــەزرانی کابینــەی حکوومەتــەوە. لــە سیســتمگەلی فرەحیزبییــدا، بــە تایبــەت ئەگــەر هــیچ حیزبێــك زۆرینەی دەنگــی وەدەســت نــەهێنابێ، هــۆی بەهرەمەنــدیی هێــزی پــاوانی لــە نێــو دەچــێ. بــەو پێیــە کــە چــەند حیــزب لــە دەســەڵاتدا بەشــدارن و حیزبــی ســەرتر چ رادە لــە دەنگــەکانی وەدەست هێنــاوە، جۆرێــك کابینــەی حکوومــەت پێــك دێ. لــە کابینــەی هاوپەیــماندا دوو یــان چەند حیــزب بەشــدارن. بــەم حاڵەیشــەوە لەوانەیــە حیزبــی تــر، بــە بــێ ئــەوەی کــە لــە هێــزی بەڕێوەبــەردا بەشــدار بــن، لــە کابینــە پشــتیوانی بکــات. ئــەحزابی پشــتیوان بــە گشــتی قورســایی و گرینگــی ئــەوتۆیان بــۆ ئەندامــەتی لــە کابینــەدا نییــە. هاوپەیــمانیی پشــتیوان لەوانەیە بە پێی سیاســەت و مەســەلەی جۆراوجــۆر لــە حیزبــی جــۆر بــە جــۆر پێــك بێــن کــە لــەم کاتــەدا پێــی دەڵــێن هاوپەیــمانیی کــاتی، یــان پارلــەمانی. بــەم پێیــەش کــە کابینــەی حکوومەت لە پشــتیوانی زۆرینــەی پارلــەمان بەهرەمەنــد بــێ یــان نــە جۆرگــەلێك لــە کابینــە پێك دێ.

کابینــەی حکوومــەتێك کــە لــە پشــتیوانی زۆرینــەی پارلــەمان بەهرەمەنــد بــێ یــان نــا حکوومــەتی زۆرینــەی پــێ دەڵــێن. بێجگــە لەمــە حکوومــەتی کەمینــەی پــێ دەوتــرێ.

حکوومەتەکانی کەمینە بە گشتی دەوامیان لە حکوومەتی زۆرینە کەمترە. هاوپەیمانییەك کە هەموو حیزبەکان، یان حیزبە گەورەکان بگرێتەوە هاوپەیمانیی گەورەی پێ دەڵێن. هاوپەیمانیی لەم شێوە زۆرتر لە هەل و مەرجی شەڕ و قەیراندا پێك دێ. کابینەی کاتی کە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری رۆژانە لە ماوەیێکی کورتدا دادەمەزرێت کە وت و وێژ بۆ دامەزرانی کابینەی حکوومەتی لە ئارادایە، حکوومەتی سەرپەرشتی پێ دەڵێن. جاری وایە هەر بەم مەبەستە سەرۆك کۆمار کابینەیێك پێکهاتوو لە کەسانی نائەندامی حیزبە سیاسییەکان پێك بێنێ.

لە سیستمگەلی پارلەمانیدا، سەرۆکی وڵات سەرەتا کەسێك بە ناوی بەربژار بۆ پۆستی سەرۆك وەزیری دیاری دەکات. هەر چۆنێکی بێ رێبەرانی حیزبەکان لە دەست نیشان کردنی بەربژاردا دەوری گرینگ دەبینن. هەندێ جار پارلەمان بۆ خۆی راستەوخۆ سەرۆك وەزیر دیاری دەکات، لە کاتێکدا یەکێك لە حیزبەکانی پارلەمان خاوەنی زۆرینەی متمانە پێ کراو بێ، سەرۆکی وڵات زۆر جار رێبەری ئەو حیزبە بانگهێشتن دەکات بۆ ئەوەی کابینەی حکوومەت پێك بێنێ. جگە لەمانە زۆر جار وتووێژی درێژخایەن و ئەستەم بۆ دروست بوونی کابینە دێتە ئاراوە. لەوانەیە کەسێك کە بەرپرسایەتی ئەو وتووێژانە وە ئەستۆ دەگرێ لەوانەیە گەر لە یەکێك لە وتووێژەکاندا سەرکەوێ خۆی ببێتە سەرۆك وەزیر. لە حاڵەتێکدا کە وتووێژی سەخت و دژوار لە پێشدا بێ، سەرۆکی وڵات تەنیا کەسێك بە ناوی «پەیامنێر» یان پەیوەندیدەری وتووێژ هەڵدەبژێرێ. کەسانی ئەوتۆ زۆر جار لەگەڵ رێبەرایەتی حیزبەکان پەیوەندیی نزیکیان هەیە, یان زۆر دەستیان دەڕوات. بەم حاڵەیشەوە لەوانەیە «پەیامنێران» تەنیا بە رواڵەت دەوری وا ببینن و لە حاڵەتێکدا کە لە وتووێژان سەرکەون خۆیان کابینەی حکوومەت دروست بکەن. لە حاڵەتی شکستی وتووێژدا، سەرۆکی وڵات کاری دامەزرانی کابینە بە کەسانێکی تر دەسپێرێ کە دەیان ناسێ. سەرۆك وەزیری تازە دوای هەڵبژاردن، یان دیاری کردنی دەبێ تاقمێك بۆ دروست کردنی کابینە پێك بێنێ و لە هەمان کاتدا سیاسەتەکانی دارێژێ و بیانناسێنێت. لە کۆتاییشدا کابینەی نوێ دەبێ لە لایەن سەرۆکی وڵاتەوە تەئید بکرێ. هەندێ جار ئەندامانی کابینە پێویستە تەئیدی پارلەمان

وەدەست بێنن. جاری وا هەیە خودی سەرۆك وەزیری بەربژار لەگەڵ ئەندامانی کابینەکەی دەبێ لە لایەن پارلەمانەوە تەئید بکرێن. زۆر جار لە دیموکراسییە قەدیمییەکاندا پێویستی بەم تەئیدانە نەبوو.

لەو وتوێژانەدا کە حکوومەتی هاوپەیمانی لێ دەکەوێتەوە، دوو باس زۆر گرینگن: یەکەم پێکهاتەی حکوومەتی و دووەم سیاسەت و بەرنامەکانی.

زۆر جار بەرپرسان و رێبەرانی حیزبەکان لەم وتووێژانەدا بەشدار دەبن و لە چوارچێوەی گشتیی سیاسەتەکانی حیزبی خۆیاندا دەکەونە نان بە قەرزدان و سازش لەگەڵیاندا. لە درێژەی ئەم وتووێژانەدا، زۆر جار حیزبە سیاسییەکان یەکیەتی خۆیان لە بەرانبەر رکەبەراندا دەپارێزن و لە کێشەی نێوخۆیی خۆ دەپارێزن. لە حاڵەتێکدا کە دوا تەئیدی دامەزرانی حکومەت لای پارلەمان مسۆگەر بێ، سازش و سیاسەتی پەیڕەوکراو، بەسراوە بە چوارچێوەیێك دەبێ کە سەرنجی پارلەمان بۆ لای خۆی رابکێشێ. لەو سیستمانەدا کە ژمارەی حیزبەکان زۆرن، وتوویژ بۆ هاوپەیمانیی درێژخایەن دەبێ و بە شێوەی سەرە، لە نێوانی حیزبە جیاجیاکاندا روو دەدات. دامەزرانی کابینەی حکومەتی هاوپەیمانی پێویست ناکات کە دوای هەڵبژاردنی گشتی بێ، بەڵکو لەوانەیە دوای دەست لە کار کێشانەوەی حکومەتی پێشوو، پێویستی پەیدا کردبێ. لەم جۆرە حاڵەتانەشدا لەوانەیە لە ماوەی تەمەنی پارلەمانێکدا چەندین هاوپەیمانی دروست ببێ. هەروەها لەوانەیە ئەو کابینەی حکومەتە کە دامەزراوە و خەریکی بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتە، بە بێ گۆڕانکاری بنەڕەتی لەگەڵ هەندێك لە حیزبەکان هاوپەیمانی دامەزرێنێ. لە حکومەتی هاوپەیماندا، لە کاتی دابەش کردنی وەزارەتەکاندا، پلەی سەرۆك وەزیری بە گەورەترین حیزب دەدرێ. ئەو حیزبگەلە کە لایەنی ئایینییان بە هێزە، زۆر جار هۆگری وەزارەتی پەروەردە و فێرکردن و کاروباری کۆمەڵایەتین. حیزبە پارێزوان و راستیخوازەکان لە راستیدا حەزیان لە پۆستی وەزارەتی دارایی و ئابوورییە. حیزبە رادیکاڵ و چەپەکان هۆگری وەزارەتی کار، ئاسایشی کۆمەڵایەتی و دەرمان و لەش ساخین. لە باری بەردەوامی و پتەوی سیاسییەوە، حکومەتی یەك حیزبی و زۆرینەیی دەوامیان لە حکومەتی هاوپەیمانی زیاترە. لە نێوان حکومەتی هاوپەیمانیشدا

«هاوپەیـــمانیی تـەواو» بناغـەی پتـەوتری بـۆ کابینــەی حکومــەت هەیـە تـا «هاوپەیـــمانیی زیادی» و «هاوپەیـمانیی کەسری» «سەرنج بدەنە باسی دروست کردنی هاوپەیـمانی».

### ٤-١٠. کابینەی حکومەت

پێشینەی دامــەزراوەی کابینــە، یـان دەسـتەی حکومــەت بـۆ خـدەی شـاکانی ئـەورووپا لــە سەدەکانی نێوەڕاستدا دەگەڕێتــەوە کـە یاریـدەدەریان لـە سـێ چیـــن، یـان سـێ پلـەی ئەسـڵی، ئەشـراف، پیــاوانی ئــاییني و عەسـكەری بــە مەبەســتی دەســتەبەر کردنــی هێــزی خۆیــان هەڵدەبـژارد. لـە ئاکـامی جێگیــر بـوونی سیاسـەت و بڵاوبونـەوەی قەڵـەمبازی نـوێ، هێـدی هێـدی سیاسەتــمەدارانی پیشــەیی جێگـای یاریـدەدەرانیان گرتــەوە. لــە دەورانــی نوێــدا بــە جیابونـەوەی سـەرۆکی وڵات «بـۆ وێنــە شـا یـان سـەرۆك کۆمـار» لـە سـەرۆکی حکومــەت ، کابینــە وەك دەســتەی بەڕێوەبــەری توانــایی ســەرۆکی حکومـــەت ، لـــە هـــەر جێگاییـــەك نەهادینــە بــووەوە. دیــارە لــە بــڕێ وڵاتــی وەك ئــەمریکا، ســەرۆکی وڵات و حکومــەت هــەر یـەکن. جگـە لەمـە، لـە یاسـای ئەساسـی ئـەو وڵاتـەدا هـیچ ناوێـك لـە کابینـەی حکومـەت نەهاتووە. لە ئاکامدا سەرۆك کۆمـار توانـایی خـۆی بـە شـێوەیێك بـە وەزیرانـی نابەخشـێ کـە هۆی دەسەڵاتی بە کۆمەڵ و نەهادی ئەوان پێکبێنێ.

شـێوەی وەرگــرتنی وەزارەت یـا ئەنـدامی کابینــە لــە وڵاتــانی جۆراوجــۆردا جیــاوازە. لــە فەڕەنسـە و ئـەڵمان و ژاپۆنـدا ئەنـدامانی کابینـە بـە گشـتی لـە سـەرەتا کارمەنـدی رەســـمی دەوڵـــەتن و دواتــر وەك وەزیــر یـــان ئەنـــدامی کابینـــە دەچـــنە پـــۆلی سیاسەتـــمەدارانی پیشــەییەوە. لــە بەرانبــەردا لــە ســوننەتی سیاسـیی ئینگلیســیدا، وڵاتــانی وەك ئینگلــیس، کانــادا و ئوســتــرالیا، ئەندامــەکانی کابینــە پێشتــر کارمەنـدی رەســمی دەوڵــەت نیـــن و تــەنیا وەك سیاسەتـــمەداری پیشــەیی دێنــە کابینــەوە. لــە ئــەمریکا تێکەڵاوییــەك لــەم دوو شـێوەیە بــەڕێوە دەچــێ. وەزیـران و ئەنـدامانی کابینـە خـاوەن پلـەی ئیـداری نیـــن و گەرچـی لەوانەیـــە بیانبـــێ، پیشتـــر وەك فەرمانـــدار یـــان ئەنـــدامی مەجلیســی یاســادانان لــە ئەیالەتەکانــدا کاریــان کردبــێ، بــەڵام بــە گشــتی وەك سیاسەتــمەداری پیشـەیی سـەر

هەڵدەدەن و دیارە لەم بۆنەیەدا لە مێژووی خزمەتکاری خۆیشیان کەڵك وەردەگرن. کە وا بوو پەیوەندیی پلەی سیاسی و پلەی ئیداری شتێکی لاوازە.

زۆربەی کابینەکان بە جۆرێك پیشاندەری هێزی حیزب و تاقمی سەر دەسەڵاتن. ئەو رژیمانەی کە پاڵپشتییان هێزی نیزامییە، روونە هەندێ وەزارەتی گرنگ بە سوپا دەسپێرن. لە وڵاتێکی وەك ئینگلستاندا، ئەو حیزبەی کە خاوەنی زۆرترین کورسییە لە مەجلیسی عەوامدا، کابینە چێ دەکات. بەڵام گەر خاوەنی زۆرینەی مەجلیس نەبێ لەوانەیە «حکوومەتی کەمینە» دروست بکات. لەم حاڵەدا حیزبە بچکۆلەکان بێ ئەوەی چاوەڕوان بن ئەندامیان لە کابینەدا هەبێ، پشتیوانی لە حکومەت دەکەن. لە حاڵەتێکدا حیزبە گچکەکان خوازیاری ئەندامەتی لە کابینەدا بن «حکوومەتی هاوپەیمانی» پێك دێت. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرۆك کۆمار هەوڵی ئەوەیە کە وەزیرانی هەر کابینەیێك، بە دڵی تاقمانی دەسترۆیشتووی ئەو بوارە بێت. بۆ وێنە وەزیری خەزانەداری دەبێ جێگای پەسنی تاقمەماڵی و ئابوورییە گەورەکان بێ. هەر وەها سەرۆکی حکومەت زۆر جار لە دانانی کابینەی خۆیدا سەرەنج دەداتە بونیادی ئەتنیکی و ناوچەیی وڵات و هەر وەها دەوری ژنان لە بەرچاو دەگرێ.

### ٤-١١. دروست کردنی هاوپەیمانی

هاوپەیمانی، کۆمەڵێ گروپ یان حیزبی سیاسی کە ئامانجی هاوبەشیان هەیە و سامانی خۆیان بۆ گەیشتن بەو ئامانجە بە کاردێنن و دەسکەوتەکانی هاوپەیمانێتی لە نێو خۆیاندا بەش دەکەن. هاوپەیمانی لە کایەی سیاسی جۆربەجۆر، وەك لە دوڕ مەجلیسی یاسادانان، هێزی بەڕێوبەر و لە نێوان دەوڵەتانی سەربەخۆدا دروست دەبێت. گرنگترین جۆری هاوپەیمانیی لە باسی دیموکراسیی پارلەمانیدا، هاوپەیمانیی حیزبەکانە لە نێوخۆی هێزی بەڕێوەبەر دا. تەنیا لە دیموکراسیی پارلەمانیی فرەحزبیدا چەمکی هاوپەیمانیی بەم مانایە راست دێتەوە. لە سیستمگەلی دوو حزبی، وەك ئینگلستان و ئەمریکا، کە لەوێدا یەکێك لە دوو حیزبە کە زۆر جار خاوەنی زۆرینەی

کورسی پارلەمانە، پێویستێك بۆ دامەزرانی هاوپەیمانیی نامێنێتەوە. لەوانەیە هیچ حیزبێك زۆرینەی کورسی وەدەست نەهێنا بێ، لەم حالەدا بەو پێیە کە هەر چۆنێکی بێ لە دیموکراسیی پارلەمانیدا ئەبێت زۆرینەی ئەندامانی پارلەمان لە سیاسەتەکانی هێزی بەڕێوەبەر پشتیوانی بکەن، پێویستیی دروست کردنی هاوپەیمانیی لە نێوان نوێنەرانی چەند حزبێ لە پارلەماندا دروست دەبێت. کاتێك ئەندامانی کابینەی حکومەت هەموو سەر بە حیزبێك بن، بەلاَم لە پارلەماندا لە پشتیوانی هاوپەیمانێك لە ئەندامانی هەمان حیزب و حیزبی دیکە، یان نوێنەری سەربەخۆ بەهرەمەند بن، بە حالەتی ئەوتۆ «هاوپەیمانیی پارلەمانی» دەڵێن و ئەمەش لە «هاوپەیمانیی بەڕێوەبەر» جیایە کە لەودا کابینەی حکومەت لە چەند حیزبێ پێکهاتووە. لەو سیستمانەدا کە خاوەنی زیاتر لە چوار حیزبی پارلەمانیین، چەندین جۆر هاوپەیمانیی لەوانەیە دروست ببێت.

بەلاَم گەر هاتو هاوپەیمانیی سەرەتا لە وەدەست هێنانی دەنگدا سەرنەکەوت، لەوانەیە حیزب یان حیزبگەلی تری بۆ دەعوەت بکرێ. ئەم حیزبانەش لەوانەیە دەعوەتەکە قەبوڵ بکەن یان نەیکەن. ڕەوەندی لێگێڕانەوە سەرەتا تا ئەو کاتە درێژەی دەبێ کە نیازێك بۆ دەعوەتی تر نەمێنێ, یان حیزبێك نەمابێ کە دەعوەت نەکرابێ. دیارە هەر کام لە ئەندامانی هاوپەیمانیی سەرەتا، خاوەنی مافی ڤیتۆن لەوەی کە ئەندامی دیکە وەربگرن.

هاوپەیمانیی بەڕێوەبەر لەوانەیە «هاوپەیمانیی زۆرینە» یان «هاوپەیمانیی کەمینە» بێ. «هاوپەیمانیی زۆرینە» لە پشتیوانی زۆربەی ئەندامانی پارلەمان بەهرەمەندە، لە حالێکدا «هاوپەیمانیی کەمینە» پشتیوانییەکی ئەوتۆی نییە. «هاوپەیمانیی کەمینە» لە ولاَتانی وەك دانیمارك، نەرویج، سوێد، ئیتالیا، فەڕەنسە و ئیسپانیادا باوە. بە ڕواڵەت دیموکراسیگەلی پارلەمانی پێوستیان بە هاوپەیمانیی زۆرینەیی هەیە.

لە بەر ئەوەی حکومەت دەبێ بتوانێ بەردەوام لە سەر دەنگی زۆرینە، لە بەرانبەر دەنگی بێ بڕواییدا حیساب بکات. بەم حاڵەیشەوە جاری وایە ئەو حیزبانەی لە

حکومەتدا ئەندامیان نییە، لە پارلەماندا پشتیوانی لە حکوومەت دەکەن. بەم جۆرە «هاوپەیمانیی کەمینە» دەتوانێ سەرەڕای روالّەت، لە پشتیوانیی زۆرینەیی پارلەمان بەهرەمەند بێ، هەرچەند لەوانەیە ئەم زۆرینەیە ناپتەو و بگۆڕ بێ. هاوپەیمانیی کەمینەیی هەر چۆنێکی بێ ناپتەوتر لە هاوپەیمانیی زۆرینەییین. هەر چەند لە دیموکراسیەکانی ئەمڕۆدا زۆر بەرچاون.

هەر وەها هاوپەیمانییەکان لە باری ژمارەیشەوە بە جۆرێکی دیکە دابەش دەکرێن. «هاوپەیمانیی تەواو»، هاوپەیمانییێکە کە بە رادەی پێویست ئەندامی هەیە، یەعنی ئەندامی زیادی نییە گەر بە جێی بهێلّن، هاوپەیمانیی هەلّوەشتێتەوە. زۆر جار هاوپەیمانیگەلی لانی کەم، هەمان جۆری هاوپەیمانیین کە زۆرینەی دەنگەکان لە مەجلیسی یاسادانان وەدەست دێنن. «هاوپەیمانیی زیادی» هاوپەیمانییەکە کە ئەندامانی زیاتر لە رادەی پێویست بن و «هاوپەیمانیی ناتەواو» هاوپەیمانییەکە کە ئەندامانی کەمتر لە رادەی پێویست بن. «هاوپەیمانیی گەورە» هاوپەیمانییەکە کە لەودا هەموو حیزبەکانی پارلەمان بەشدارن. هاوپەیمانیی ئەوتۆ زۆرجار لە کاتی قەیراندا دروست دەبن، لە زانستی سیاسەتدا، پێشبینی ئەوەی کە لەوانەیە کامە حیزب لە هاوپەیمانیدا بەشداری دەکەن، باسی دوور و درێژی لە تیۆری هاوپەیمانیدا هێناوەتە گۆڕێ. لە تیوریەکانی کۆندا زۆر پێ لە سەر «ئەندازە»، یان دەوری ژمارەی حیزبەکان لە دامەزرانی هاوپەیمانیدا دادەگیرا، لە کاتێکدا لە تیۆری تازەتردا لە سەر هۆی چۆنیەتی هاودەنگی، یانی نزیکی فیکری و ئایدیۆلۆژیایەکی حیزبەکان زیاتر پێداگیراوە.

هەرچۆنێکی بێ هۆکاری جۆراوجۆر وەك یاساگەلی هەلّبژاردن، شێوە کردەوەی پارلەمان، شێوە بڕیاردانی کابینەی حکومەت، هاودەنگی فیکریی حیزبەکان و گرینگی ژمارەی ئەوان لە سەر دامەزرانی هاوپەیمانیی کاریگەرن.

## ٤-١٢. شێوەکانی تەوێر کردن لە دیموکراسییەکاندا

لە دیموکراسیدا تەویری سیاسی زۆر جار بە شێوەی دەستەجەمعی بەڕێوە دەچێ و لە نێو پارلەمان، کابینە و کنوانسیۆنی حیزبیدا بەڕێوە دەچێ. یەکێك لە شێوەکانی زۆر ئاسایی و ئەساسی لە تەوێردا، دەنگ وەرگرتنە. دەنگ وەرگرتن بۆ بڕیار وەرگرتن، شێوەی جۆراوجۆری هەیە. ساناترین شێوەی دەنگ وەرگرتن کاتێکە کە هەموو دەنگدەران خاوەنی مافی دەنگی یەکسان بن و هەڵبژاردن تەنیا لە نێوان دوو شەقڵی دیاریکراودا بێ و زۆرینەی سانای دەنگەکان بۆ تەویر وەرگرتن تەواو بێت. لە هەل و مەرجی جیاوازدا، لەوانەیە لە باتی زۆرینەی سانا، زۆرینە موتڵەق یەعنی نیوە بە ئیزافەی یەك دەنگ پێویست بێ. دۆخی ئالۆزتر کاتێکە کە زۆرینەی تەواوتری وەك ٢/٣ یان ٣/٤ دەنگەکان پێویست بێ. هەر وەها لەوانەیە شەقڵەکانی هەڵبژاردن زیاتر لە دوو بێ. بۆ وێنە کاتێك سێ شەقڵ لە ئارادا بێ، لەوانەیە زۆرینەی سانا بۆ دیاری کردنی یەك جار رون و پێویست بێ و دەنگ وەرگرتن لە یەك جاردا وەردەگیرێ. بەڵام کاتێك کە زۆرینەی موتڵەق پێویست بێ و ئەگەر هیچ کەس لە سێ هەڵبژاردنەکانەوە زۆرینەی پێویست وەدەست نەهێنێ، ئەو دوو هەڵبژاردەی کە زۆرترین دەنگیان وەدەست هێناوە، لە بەشی دواتری دەنگ وەرگرتندا، لە بەرانبەر یەکتریدا قەرار دەگرن. لەوانەیشە تەویرەکان لە ئەساسدا وێکڕا وەرگیرێ. ئەم وەزعە لە کاتێکدا بە کردەوە دەگاتە ئەنجام کە هەموو ئەندامان لە دیاری کردنی ئاکامدا وەك یەك دەستیان بڕوات. دواییین ئەندامی دژ لە هەل و مەرجی ئاوادا خاوەنی دەسەڵاتێکی بەرچاو دەبێ، بە وتەیێکی دیکە خاوەنی مافی ڤیتۆ دەبێ.

## ٤-١٣. بەرپرسایەتیی حوکمڕانان و کاربەدەستانی سیاسی

لە دیموکراسیدا کاربەدەستانی گشتی، بەرپرس و وەڵامدەری ئەو تەویر و کردەوانە دەبن کە گرتوویانە و کردوویانە. بێ بەرپرسایەتیی, دیموکراسی

نامومکینــه. بــەم پێیــە روونــە کــە هــەموو خــەڵکی دەتــوانن لــە کــار و کــردەوەی کاربەدەستان بکۆڵنــەوە. بــە تایبــەت لــەو کاربەدەســتانەی کــە خــەڵك هــەڵیان بــژاردوون و دەبێ وەڵامدەری خــەڵکی بــن. ســەرەڕای ئەمــەش کاربەدەســتانی ناهەڵبــژاردەیش بــە شــێوەی جۆراوجۆر بە بەرپرسیی تەویرەکانیان دادەنرێن.

### ٤-١٣-١. بەرپرسایەتیی کاربەدەستانی هەڵبژێردراو

کــورت بــوونی کــاتیی ئــەو پلەیــەی کــە هەڵبــژێردراوان وەریــان گرتــووە و پرەنســیپی کێبــەرکێی هەڵبــژاردن، پاڵپشــتی بەرپرســایەتیی کاربەدەســتان لــە بەرانبــەر خەڵکــدا دەبێ. بەم حاڵەیشەوە لەم بوارەدا لەمپەر و کۆسپ هەیە:

یەکەم: خــەڵك بــەردەوام لــە رووی زانســت و زانیــاریی تــەواو ســەبارەت بــە بەربــژاران و هــەل و مــەرجی رۆژانــەی سیاســەت، لــە هەڵبژاردنــدا بەشــداری ناکــەن.لــەم حاڵەتــەدا هەڵبــژاردن و هەڵبــژێراوی کاربەدەســتان پێویســتی دەســتەبەر کردنــی بەرپرســایەتیی ئەوان لە بەرانبەر هاووڵاتیاندا ناکات.

دووەم: نابەرپرسایەتیی کاربەدەســتان لــە بەرانبــەر خەڵکیــدا بــەو مانایــە نییــە کــە بــۆ جارێکی دیکــە هەڵنەبژێرنــەوە، لــە بــەر ئــەوەی زۆر جــار کــەڵك وەرگــرتن لــە پــوولی رژاو لــە هەڵبژاردنــدا دەتــوانێ کۆســپی ئــەوتۆ پووچــەڵ کاتــەوە. ســەرەڕای ئەمــەش هەرچــەندە کێبــەرکێی هەڵبــژاردن تونــدتر بــێ، ئیمکــانی بــە بــەرپرس زانــینی کاربەدەســتانی هەڵبــژێردراو زیــاتر دەبــێ. بــەم حاڵەیشــەوە و تەنانــەت لــە هــەل و مــەرجی رکەبــەری تەواودا، لە حاڵەتێکــدا کــە هاووڵاتیــان دەنــگ بــە حیــزب بــدەن «نــەك بــە بەربــژارێك بــە ناوی کەس یــان تــاك» لــەم حاڵەتەشــدا بەرپرســایەتی تــاکیی کاربەدەســتان تووشــی لێڵــی دەبێ. هەر وەها رەوەنــدی بڕیــار وەرگــرتن لــە حکوومەتــە نوێکانــدا زۆر ئــاڵۆزە و بــەم پێیــە ناکرێت بە ئاسانی کەسانی تایبەت بە بەرپرسیی کاروباری تایبەت لە قەڵەم بدرێ.

### ٤-١٣-٢. بەرپرسایەتیی کاربەدەستانی ناهەڵبژێردراو

یـــەکێك لـــە ڕێگـــەکانی دروســـت کردنـــی هەســـتی بەرپرســـایەتیی لـــەکن کاربەدەســتانی ناهەڵبــژێردراوا کــەڵك وەرگرتنــە لــە بیـــروڕای گشــتیی. کاربەدەســتانی ئــەوتۆ، بیـــروڕای گشــتی وەك پێوانــەیێك بــۆ خۆشەویســتی و ڕەوا بــوونی خۆیــان لــە بەرچاو دەگرن و لە تەویر کـردن سـەبارەت بـە کاروبـاری گشـتیدا چـاوی لـێ نـابڕن. لـە دیـــموکراسیگەلدا ئـەو کاربەدەسـتانەی کـە لای بیـــروڕای گشـتی جێـی مشـت و مـڕن دەخرێنـە بـەر لێپرسـینەوە. بـە گشـتی بیـــروڕای گشـتی کەرەسـەیێکی گرنگـی چـێ کردنـــی هەســـتی بەرپرســـایەتیی کاربەدەســـتانی سیاســـی و چـــاك کردنـــی سیاســـی و تەوێر کردنە.

ڕێگەیـەکی تـر لـەو ڕێگایانـەی کـە هەسـتی بەرپرسـایەتی لـە لای کاربەدەسـتان دروسـت دەکـات، دانـانی چوارچـێوە و یاسـای چـاوەدێرییە بـە سـەر ئاکـار و ڕەفتـاری ئـەخلاقی و کۆمەڵایـەتی کاربەدەسـتان دا کـە ئەگـەر ژێرپێیـان خسـت تـەمێ دەکـرێن. هــەر وەهــا کاربەدەســتانی سیاســی بــە گشــتی دەبــێ زانیــاری لــە ســەر مــاڵ و دارایــی خۆیــان پــیش وەرگــرتنی پلــە ڕاگــەیێن و ئــەو زانیارییــە لــە درێــژەی کــارگێڕیی خۆیــان لـەو پایەیـەدا تـازە کەنـەوە. گریـــمانەی ئەساسـی لێـرەدا ئەوەیـە کـە وەرگـرتنی پلـە و پایە لـە حکومـەتی دیـــموکراتیکدا، نابـێ ببێتـە ئامێرێـك بـۆ قازانـــجی شەخسـی و کەڵەکە کردنی دارایی.

لە هەندێك لـە دیـــموکراسییەکاندا هاووڵاتیـان بـە پێـی یاسـای ئـازادیی زانیـاری، مافـــی خۆیانـــە زانیـــاری پێویســـت لـــە مـــەڕ ژیـــانی گشـــتی و پیشـــەی کاربەدەســـتان وەدەسـت بێـنن. بـە تایبـەت دوای دزەکردنـــی هـــەواڵی گەنـدەڵی و ڕوورەشـیی مـاڵی و ئەخلاقی بۆ دەرەوەی شوێنە حکوومەتییەکان، کەڵك وەرگرتن لەم ئامێرە زۆر باوە.

هــەر وەهــا لــە زۆر دیـــموکراسیدا، سەرچـاوەی ڕەسمـی بـۆ پیاچـوونەوە بـە دەنـگ هەڵبـــڕین و شـــکایەتی هاووڵاتیـــان بـــە دژی کاربەدەســـتانی دەوڵـــەتی دامـــەزراوە.

سەرچاوەی ئەوتۆ بۆ یەکەم جار لە سوێد لە سەرەتای سەدەی ١٩دا دامەزرا و نێوی سوێدی ئەو ombudsman (چاوەدێر و کارگێڕ) کە لە رۆژئاوا هەر بەو نێوە باوەوە دەیناسێنن.

لە هەندێ دیموکراسیدا، حکوومەت ناوەندێکی بۆ راڤە و لێکدانەوە و رەخنە و وردبوونەوەی سیاسەتە گشتییەکان داناوە. هاوولاتیان دەتوانن لە ئامار و زانیاری ئامادە کراوی ئەم ناوەندانە کەڵك وەرگرن. هەر وەها لە هەندێ دیموکراسیدا رێگەگەلێك لە بەرچاو گیراوە تا هاوولاتیان و نوێنەرانی ئەوان بتوانن کاربەدەستانی هەڵبژێردراوی خۆیان لە سەر کار لابەرن. ریفراندۆم و جوولانەوەی پرۆتستۆی هاوولاتیان سەبارەت بە لێپرسینەوە و فەساد وخراپ کەڵك وەرگرتنی کاربەدەستان کاریگەرە. بەم شێوەیە رووناك بوونی بازنەی سیاسەت لە رێگای دەستەبەر کردنی هەستی بەرپرسایەتیی کاربەدەستان بە شێوەی جۆراوجۆر لە دیموکراسیدا دابین دەکرێ و لە راستیدا خۆ بە بەرپرس زانینی کاربەدەستانی سیاسی لە بەرانبەر خەڵکدا، گرینگترین پێوانە و هەوێنی دیموکراسییە.

رێگایەکی باوی چاوەدێریی پارلەمان بە سەر هێزی بەڕێوەبەردا، لێپرسینەوە، لە کار لابردنی کاربەدەستانی حکومەتە بە هۆی کاری نایاسایی کاربەدەستانەوە. رەوەندی لێپرسینەوە زۆرجار لە مەجلیسی نوێنەرانەوە دەست پێدەکا و دەگاتە دادگاییکردن و تەنانەت مەحکووم کردنی کاربەدەست لە مەجلیسی بالاّ (پیران)دا. پێشینەی ئەم کارە بۆ کردەوەی پارلەمانی ئینگلستان لە سەدەی چواردەدا دەگەڕێتەوە کە وەك کەرەسەی چاوەدێری بە سەر هێزی وەزیرانێك کە شا، دای نابوون، دیاری کرابوو. لە زۆر ولاّتان سەرەڕای ئەوەی لێپرسینەوە رێگای یاسایی هەیە، زۆر جار هەڕەشەی لێپرسینەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کاربەدەست دەست لە کار بکێشێتەوە و ئەمەش ئەبێتە هۆی ئەوە کە لێپرسینەوە نەیێتە ئاراوە.

لە ولاّیەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، سەرۆك کۆمار، جێگرانی و ئەندامانی کابینەی حکومەت لەوانەیە بە تاوانی «خەیانەت، بەرتیلخۆری و تاوانی گەورە» لێپرسینەوەیان

لەگەڵ بکرێ و لە سەر کار لاببرێن. مەجلیسی نوێنەرایەتی لەم بارەیەوە مافی تایبەتی هەیە. دوای ئەوەی کە مەجلیسی نوێنەران بە دەنگی زۆرینە کاربەدەستانی هێزی بەڕێوەبەری خستە بەر لێپرسینەوە، مەجلیسی سەنا ئەو کاربەدەستانە دادگایی دەکات، حوکمی مەحکووم کردن پێویستی بە دەنگی زۆرینەی دوو لە سێی نوێنەرانی سەنایە.

# کردەوەی دیموکراسی: حیزب و هەڵبژاردن

گەر قبوول بکەین کە دیموکراسی لە کردەوەدا بە مانای بەشداری و کێبەرکێی سیاسیی ئەژمارێك لە گروپ و سازمانی ڕێکخراو بە مەبەستی وەدەست هێنانی هێز و بەڕێوەبردنی وڵات بە پێی سیاسەت و بۆچوونی هەر کام لەو گروپانەیە، لەو حاڵەدا حیزبە سیاسییەکان و هەڵبژاردن کاکڵە و چەقی ژیانی دیموکراتیك پێك دێنن. لەم وتارەدا لە ڕەوەندی دیموکراسی دەکۆڵینەوە و باسە گرینگە بەرچاوەکانی وەك بەشداریی سیاسی، حیزب و هەڵبژاردن، سیستمگەلی حیزبی و هەڵبژاردن و گروپی دەسترۆیشتوو و بیروڕای گشتی بە کورتی دەدوێین.

## ٥-١. بەشداریی سیاسی

بەشداریی خەڵك لە سیاسەتدا بە هەر شێوەیەکی مانادار بۆ پێگەیشتنی دیموکراسی پێویستە, گەرچی ناتەواویشە. ساکارترین شێوەی بەشداریی سیاسی, دەنگدانی هاووڵاتیان بە حیزب و تاك و سیاسەتەکانیانە. شێوەکانی تری بەشداریی سیاسی بریتین لە تێکۆشانی هەڵبژاردن، شێوەی کارتێکردن لە سیاسەتمەداران، دامەزرانی گروپی دەسترۆیشتوو و حیزبی سیاسی و هتد. بەشداریی لە ڕێگای مافی دەنگدانەوە لە ڕۆژئاوا لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە پەرەی گرت. لە سەرەتا لە ئەمریکا مافی دەنگدان بۆماڵکان، پیاوان و سپیپێستان تەسك کرابووەوە. لە زۆربەی وڵاتانی ئەورووپایی, بەشداریی سیاسی و مافی دەنگدان دوای شۆڕشەکانی ساڵی ١٨٤٨وە پەرەی ئەستاند. لە زۆربەی ئەو وڵاتانەدا مافی دەنگدانی گشتی لە سەرەتای دەیەکانی سەدەی بیستەمدا بەخشرا. بەم حاڵەیشەوە مافی دەنگدانی ژنان لە زۆر وڵاتان دێرتر پێگەیشت. لە ئینگلستان لە ١٩٧٨، لە ئەمریکا ١٩٢٠ ، لە فەڕانسە ١٩٤٦ و لە سوویس لە ساڵی ١٩٧١ ژنان مافی دەنگدانیان پەیدا کرد. لە ئەمریکا نیوەی دانیشتوانی ڕەشپێستان تا ساڵی١٩٦٥ نەیاندەتوانی لە مافی یاسایی خۆیان لە دەنگداندا کەڵك وەرگرن. بەشداریی سیاسی بە بێ ڕکەبەریی سیاسی، بەشداریی دیموکراتێکی پێ ناڵێن. لە زۆر وڵاتان دوای ڕووخانی دیموکراسی، مافی دەنگ هێما لە پێ نەکەوتبوو. لە زۆر سیستەمی تۆتالیتاردا، زۆربەی هەرە

زۆری خەڵك لە هەڵبژاردندا بەشدرای دەکەن و دەسەلآت لە دەستی یەك حیزب یان گروپێکدا دەمێنێتەوە. سیستمگەلی زۆرەمل و دیکتاتۆریی جۆراوجۆر بە شێوەی جۆراوجۆر خەڵکی بۆ دەنگدان رادەکێشن. لێکۆڵینەوە لە بەشداریی خەڵك لە هەڵبژاردن و دەنگدان لە شێوەکانی تری بەشداریی ئاسانترە و زانیاریی رەسمی زیاتر لەو بارەوە وەدەست دەکەوێ. لە زۆربەی دیموکراسییەکاندا، شان و شکۆی هاووڵاتی بوون بە دەنگدانەوە بەستراوە، و بیانییەکانی دانیشتووی وڵات مافی دەنگدانیان نییە. لە ئەمریکادا, هاووڵاتیەتی بۆ دەنگدان لە چاوی یاسای ئەساسیەوە پێویست نییە, بەڵام ولایەتەکان لە کردەوەدا لە بەرچاوی دەگرن. رادەی بەشداریی کەسانی خاوەن دەنگ لە دیموکراسییەکاندا وەك یەك نییە. لە ئەمریکا نزیکەی ٥٨ لە سەدی دانیشتوانی خاوەن دەنگ لە هەڵبژاردنی ساڵی ١٩٩٢دا بەشداریان کرد. بە بڕوای هەندێ کارناس یەکێك لە هۆیەکانی بەشداریی کەمی خەڵك لە هەڵبژاردندا، ناونووسیی بۆ دەنگدان لە پێش هەڵبژاردن دایە. لە زۆربەی دیموکراسییەکاندا ناونووسی پێویستە. هۆیەکی دیکە بەشداریی لە هەڵبژاردنی جۆراوجۆر دایە، هەرچێ ژماری زۆرتر بێ بۆی هەیە لە بەشدرای یەکێکیاندا بڕواتە سەرەوە. لەسەریەك خەڵکی ئامریکا زێدەتر لە هەموو دیموکراسیێك, هەلی دەنگدانیان هەیە. لە زۆربەی زۆری دیموکراسییەکاندا دەنگدان ئازادە. تەنیا لە ژمارەیێکی کەمی وڵاتان دەنگدان زۆرەملێیە, یان دەنگنەدان سزای هەیە. لە ئوستralیا و بلژیك ئەو کەسانەی کە دەنگ نادەن سزا دەدرێن. لە ئیتالیا لە سەر پێناسەی ئەو کەسانەی کە دەنگ نادەن دەنووسن «دەنگی نەداوە» کە جاری وایە بۆ خزمەتی ئیداری یان کەڵك وەرگرتن لە بەهرەی دەوڵەتی, سەرئیشەیان بۆ دروست دەکات. یەکێکی تر لە هۆیە کاریگەرەکانی رادەی بەشداریی, خودی سیستەمی حیزبیە. هەرچی رکەبەری زیاتر بێ، بەشداریی زیاتر دەبێ. کاتێك یەك حیزب بەردەوام لە هەڵبژاردندا سەرکەوێ، بەشداریی دادەبەزێ. هەر وەها سیستەمی هەڵبژاردنی نوێنەرایەتیی رێژەیی زیاتر لە سیستەمی زۆرینەیی، خەڵك و گروپی جۆراوجۆر بۆ بەشداریی هان دەدەن. تەتانەت رۆژی هەڵبژاردنیش لە رادەی بەشداریدا کاریگەرە. لەو وڵاتانەی کە رۆژی هەڵبژاردنی گشتی دەکەوێتە رۆژی پشوو دان، بەشداریی خەڵك زیاتر لەوەیە کە لە رۆژی کاردا بێت.

هەر وەها بە پێی ئەو دیاردانەی لە بەر دەست دان لەو وڵاتانەی کە پارلەمان یەك مەجلیسیە زیاتر لەو وڵاتانەی کە پارلەمانەکەیان دوو مەجلیسی هەیە، بەو دەلیلەی پارلەمانی یەك

مەجلیسی بە تەنێ دەوری دیاریکراو لە دوارۆژی سیاسیی وڵاتدا دەبینێ. هۆکـاری کۆمەڵناسـییش دیارە لە رادەی بەشداریی کاریگەرە. ورد بوونەوە لەم هۆیانە بە تایبەت لەو وڵاتانەی کە بەشداریی گشتی لەواندا لە خوارەوەیە «وەك ئەمریکا» ئاکامەکان مانادارتر دەبـن، لـە بـەر ئـەوەی کاتێـك بەشداریی بەر بڵاوە جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان تاقمە کۆمەڵایەتییەکاندا نادۆزرێتـەوە. بـە پێـی خوێندنەوەی دیـموکراسییەکانی رۆژئاوا و لە نێوان تاقمـەکانی کۆمەڵایەتیـدا، پیـاوان زیـاتر لـە ژنان، زۆرینەی ئەتنیکی زیاتر لە کەمینەی رەگەزی، چینی دەوڵەمەند و نێوەنـجی زیاتر لە چـینی خوارەوە، کەسانی خێزاندار و دانامەخستوو زیاتر لە کەسانی سەڵت و لاو، کەسـانی خـاوەن پلـەی بەرزی خوێندن زیاتر لە وانەی کەمیان خوێندووە و ئەو کەسانەی کە هەستی پێناسـەی حیزبییـان هەیە زیاتر لە کەسانی دیکە لە هەڵبژاردن بەشداری دەکەن.

گەرچی بە رواڵەت رادەی بەشداریی، دیـموکراسی تۆکمە و پتـەو دەکـات، بـەڵام هەنـدێ لـە خاوەنرایان لەم بارەوە دوو دڵن. بە رای ئەوان ئەو کەسانەی کە دەنگ دەدەن زیـاتر لەوانـەی دەنـگ نادەن بە ئوسووڵی دیـموکراسی پێبەندن، کەسانێك کە دەنگ نادەن زۆر بڕوایـان بـە دیــموکراسی نییـە. بۆیـە هانـدان و رێخسـتنی کەسـانی ئـەوتۆ بـۆ بەشـداریی سیاسـی لەوانەیـە بـۆ حـاڵی دیـموکراسی باش نەبێ. یەك جار لە وڵاتی ئاڵمان لە ساڵی ١٩٣٣ بەشداریی بێ وێنـە سیاسـی و بووە هـۆی لـە نـاوبردنی دیــموکراسی و سـەرکەوتنی فاشـیزم. سـەرەڕای ئەمـەش سـەرکەوتنی نازییەکان تەنیا ئاکامی زۆربوونی بەشداری نەبوو. بـەڵکو گـۆڕانی لاینگـری دەنگـدەرانی حیزبـی پێشوو لەم بارەوە کاریگەر بوو. بەربڵاوی بەشداریی گشتی لەوانەیە نیشانەی هۆگری بە ئوسـووڵی دیـموکراسی نەبێت، بەڵکو پیشاندەری هەستی ناکامی و پەریشانی و داوای گۆڕانکاریی بنـەڕەتی بێت. کە وابوو لە هەل و مەرجی تایبەتیدا لەوانەیە پەرەسەندنی بەشداریی بە زیانی دیـموکراسی تەواو بێت.

بەشداریی لە ژیانی سیاسیدا بۆ تاکگەل نرخی هەیە و پێویستی بە کات، هێز و سامان هەیە. دیارە هەرچی نرخی بەشداریی کەمتـــر بێـت، رادەی دەڕواتـە سـەر. لـە سیسـتمگەلی داخـراو و نادیـموکراتیك زۆر جار تاکگەل بۆ بەشداریی راستەقینە لە سیاسەتدا تووشی نرخـی گـران دەبـن. گەرچی بەشداریی لە سیاسەتدا لە تئۆریە کلاسییەکانی دیـموکراسی وەك جۆرێك چاکەی مەدەنی لە قەڵەم دراوە، بەڵام ئەمە تەنیا هەستی بەر پرسایەتیی مەدەنی نییـە، بـەڵکو زۆر جـار دەلیلـی

تری هەیە. وەدەست هێنانی قازانــجی ئابووری یەکێك لەو دەلیلە گەورانەیە. کردەوەی دیــموکراسی لە سیستەمی سەرمایەداریدا ناتوانێ لە ژێر کاریگەریی رۆحی قازانــجخوازانەدا نەبێت. سەرەڕای ئەمانەش دلەڕاوکەی بەشداریی سانا نییە و زۆر جار تێکــەڵ و ئــالۆزە. کــەوابوو تێکــەڵاوییێك لــە قازانــجخوازی، هێزخوازی، وەدەست هێنانی پلە و پایــەی کۆمەڵایــەتی و هەســتی ئەمنیــەتی بــۆ بەشداریی سیاسی لێك دەئالۆزێن.

## ٥-٢. گرووپی دەسترۆیشتوو و گرووپی بەرژەوەندخواز

یەکێ لە رەهەندەکانی بەشداریی رێکخراوەیی لە دیــــموکراسیدا گرووپگــەلی دەسترۆیشــتوویە. گرووپی دەسترۆیشتوو و بەرژەوەندییخواز ئەو گرووپانەن کە کار لە سەر بڕیارەکانی دەوڵەت دەکەن لە بەر ئەوەی قازانــجی ئەوان بپارێزێ. شەرت نییە ئەم گرووپانە بۆ کارتێکردن لە کاروبــاری دەوڵــەت دروست بووبن، بەڵکو تایبەتکاری و ئامانــجی کۆمەڵایەتی و ئابووریی تایبەت بە خۆیــان هەیــە. بەڵام لە پەنای ئەمەشدا کار لە تەوێرەکانی دەوڵەت دەکەن لە بەر ئەوەی ئامانــجەکانیان جێبەجێ ببێت. هەندێ لە خاوەنڕایان, گرووپی بەرژەوەندخوازو دەسترۆیشتوو بە کەرەسەی دیــموکراسی و هۆی بەردەوامی دەزانن. لە بەرانبەردا هەنــدێکی دیکــە قامــك بــۆ لایەنــە خراپــەکانی ئــەم کــارە بــۆ دیــــموکراسی رادەکێشــن. لــە روانگــەی پاڵپشــتانەوە، گرووپگــەلی دەســت رۆیشــتوو بــۆ خۆیــان بەرچاوترین پێناسەی کۆمەڵگای کراوە و ئازادن و بە رەهەندی دەنگدانــەوەی ئامــانج و قازانـــجی گشتی لە باری ژیانی سیاسییەوە لە قەڵەم دەدرێن. هەموو یاسا دیــموکراتیکەکان، ئــازادیی تــاك لە تاقمی دڵخوازی خۆیاندا رەوا دەزانن. بە بێ ئەم تاقمانە تاك بە تەنێ ناتوانێ لە مافــی خۆی لە هەمبــەر دەزگــای بــەربڵاوی دەوڵەتــدا پارێزگــاری لــە خــۆی بکــات. گرووپگــەلی خاوەنبــەش و دەسترۆیشتوو ئاوێنەی سروشتیی جۆرواجۆری و ئالۆزی بونیادی کۆمەڵایەتی و ئــابووری و هــەبوونی چیــن و حەزی جۆراوجۆرن لە کۆمەڵگایەدا. کۆمەڵگای مەدەنی وەك بنەڕەتی ژیانی دیــــموکراتیك بە بێ تاقمی دەسترۆیشتوو و خاوەن بــەش مومکیـــن نییــە. تاقمگــەلی دەسترۆیشــتوو سەرچــاوەی زانیاریی سیاسەتــمەدارن و خاوەن تەوێرانیش هەن. لەم روانگەیەوە ئەم گرووپانــە دەورێکــی بەرچــاو لە «کۆمەڵایەتی کردن»ی سیاسەتدا دەبیـــنن. یــەك لــە رەهەنــدەکانی دەســت پــێ راگەیشتـــن و

پەیوەندیی خەڵك لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتیدا هەر ئەم تاقمگەلەن. لە لایێکی ترەوە هەر ئەم گروپە دەسترۆیشتووانە زانیاریی پێویست بۆ کەسانی خۆیان دابین دەکەن. بەم شێوەیە گروپگەلی دەسترۆیشتوو لە نەهادە دیموکراتیکەکان، واتە حیزبە سیاسی و پارلەمانەکان، پشتیوانی دەکەن.

رەخنەیەك کە لە تاقمگەلی دەسترۆیشتوو دەگیرێ، ئەوەیە کە ئەمانە تەنیا بە شوێن قازانجی خۆیانەوەن و ئەم قازانجە جاری وایە لەگەڵ قازانجی گشتیدا یەك ناگرتەوە. بەلام داوەری کردن بە هاوئاهەنگی قازانجی تایبەتی و گشتی شتێکی ئەستەمە: بەم پێیە رەخنەی ئەوتۆ جێگای قسەو باسە. سەرەڕای ئەمەش هەموو تاقمە دەسترۆیشتووەکان تەنیا بە شوێن سەرخستنی قازانجی چینی خۆیانەوە نین، بەڵکو زۆر روونە گەلێك تاقمی تێکوشەر لە بەستێنی ژینگە، لەشساغی، فەرهەنگ و... هتد. هەن کە بە دوای قازانجە گشتییەکانەوەن. هەر چۆنێکی بێ لە ژیانی دیموکراتیکدا رێکخستنی هەموو قازانج و بایەخەکان نەك شتێکی دژوار بەڵکو نامومکینە.

ئابووریزانانی کلاسیك لە لایێکی ترەوە دەڵێن کە شوێن قازانجی تایبەتی کەوتن لە خۆیدا بە مانای دابین کردنی قازانجی گشتییە، بەم پێیە ناکرێت بە بیانووی پێشگیری لە شوێن کەوتنی قازانجی تایبەتی و لەم رێگایەوە زەربە لێدان لە کۆمەڵ، ئازادی تەسك بکرێتەوە.

لە سونەتی دیموکراسی ئەمریکاییدا، جیمز مادیسۆن لایەنگری لانی سەری ئازادی بۆ تاقمگەلی دەسترۆیشتوو بوو. هەر بەم بۆنەوە هەندێ لە نووسەران بە دیموکراسیی ئەمریکی دەڵێن، دیموکراسیی مادیسۆنی. لە ئەمریکا تاقمگەلی دەسترۆیشتوو لە سیاسەتدا دەوری گەورە دەبینن. بەم حاڵەیشەوە لە هەندێ دیموکراسیدا، دەوڵەت بە مەبەستی دابین کردنی رکەبەریی ئابووریی بازاڕی ئازاد و ئازادیی سیاسی، رێ و شوێنی بۆ تەسك کردنەوەی تێکۆشانی تاقمگەلی دەسترۆیشتوو داناوە.

لە هەندێ ولاتان رێ و شوێنی سەخت بۆ نێونووس کردنی گروپی دەسترۆیشتوو لە ئارادایە و بۆ پێشگیری لە بەهێز بوونی لە رادەبەدەری ئەم تاقمگەلە، هەوڵ دەدرێ حیزبە سیاسییەکان بەهێزتر بکرێت. پێشنیازێك کە لەم بارەوە لە ئەمریکا هاتووەتە گۆڕێ ئەمەیە کە پەیوەندیی ئەندامانی کۆنگرە و حیزبە سیاسییەکان لێك نزیك بکرێتەوە، بەم مانایە کە ئەندامانی کۆنگرە بە پێی حەزی حیزبی خۆیان و بە پاڵپشتی حیزب هەڵبژێرێن. لە کاتی ئێستادا ئەندامی کۆنگرە

له حیزبی سیاسیی جیاوازن، له بەر ئەوەی حیزب بۆ دیاری کردنی بەربژار کۆنتـــرۆڵی هەڵبــژاردن ناکات. له ئاکامدا ئەندامانی کۆنگره لەگەڵ گروپی دەسترۆیشتوو پەیوەندیی نزیکیان هەیه و بــەو شێوەیه پێبەندی بۆچوونەکانی حیزب نیــن.

## ٥-٣. حیزبه سیاسییەکان

حیزب گرینگتـــرین ڕێکخراوەی دیــموکراسی هاوچەرخە. به بۆچوونی زۆر کەس لــه خاوەنڕایــان له دیماهیدا دیــموکراسی شتێك زیاتر له کێبەرکێی حیزبی نییه. هەڵبژاردن بێ کێبەرکێی حیزبــی بێ مـانایه. بەم ئیعتباره که حیزب له ڕاستیدا خۆی له سەر چەمکی کێبــەرکێ بەنــدە. تــەنیا لــه سیستەمی دوو حیزبی, یان چەند حیزبیدا چەمکی حیزب مانا پەیدا دەکات، سیســتمگەلی یــەك حیزبی, بەسیستمگەلی ڕکەبەری و دیــموکراتیك حیساب نایێن. چەمکی حیزب به مانای دروستی وشه، له سەرەتای سەدەی نۆزدەدا له ئەمریکاوه ســەری هەڵــدا. دوای ئــەوەی کــه دامــەزراوەکانی یاسادانان به تەواوی جێگیــر بوون و بەشێکی زیاتر له خەڵك مافــی دەنگــدانیان وەدەســت هێنــا, تێکۆشانی حیزبی وەك شتێکی بێ ئەملا و ئەولای لێهات. له ئینگلستان چاکســازیی هەڵبــژاردنی ساڵگەلی ١٨٣٣ و ١٨٦٧ به ڕوونی حیزبەکانی هێنایه مەیدانی سیاسەتەوە. حیزبــه مودێرنــەکان تەنیا دارودەستەی نێو پارلەمان نەبوون, بەڵکو له دەرەوەی پارلەمانیش خاوەنی ڕێکخراو و ئەنــدام بوون. بەم حاڵێشەوه زۆربەی حیزبه مودێرنەکان لــه نێوخــۆی پارلەمانــەوە دروســت بــوون و بــڵاو بوونەوەی مـافــی دەنگدانی گشتی، بەستێنی تێکۆشانی ئەوانی له دەرەوەی پارلەمان بەهێزتر کــرد. هەندێك حیزبیش له دەرەوەی پارلەمان پێڕەوکه بوون و وەك تــاقمی دژی کاربەدەســتان، خوازیــاری بەشداریی له دەسەڵاتدا بوون. گرینگتــرین ئەم حیزبانه، حیزبه کرێکاری و سوسیالیستەکان بــوون که ئەمەش له پەرەسەندنی مـافــی دەنگی گشتیدا دەوری بینیوه. بەناوبانگتــرین پێوانه بۆ پۆلیــن کردنی حیزبه سیاسییەکان، پێوانەی ئایدیۆلۆژیای که بەو پێیه حیزبەکان لەســەریەك لــه ڕاســتی توندڕەوەوە تا چەپی توندڕەو دابەش و دیاری دەکرێن. چەمکی ڕاست و چەپ ئامــاژه بــه دوو باســی بنەڕەتی دەکەن: یەك لەمانه پاراستــن, یان گۆڕینی پەیوەندییەکانی ئابووری, یــان بــه مانایــەکی دیارتر، دەست وەرنەدانی دەوڵەت له ژیانی ئابووریدا له بەر پاراستــن یان دابین کردنی عەداڵــەتی

کۆمەڵایەتییەوەیە، و دووەم ساختاری هێز و سیستەمی سیاسی واتە سیستەمی سیاسیی دیموکراتیك یان پاوانخوازەوەیە. بەم پێیە حیزبە سیاسییەکان بە سەر چوار دەستەدا دابەش دەبن.

١) حیزبە سیاسییە راستڕەوە دیموکراتییەکان: وەك حیزبی لیبراڵ و پارێزگار و دیموکرات مەسیحی

٢) حیزبە سیاسییە چەپە دیموکراتییەکان: وەك حیزبی سوسیال دیموکرات و حزبی کرێکاری

٣) حیزبە سیاسییە پاوانخوازەکان: وەك حیزبە فاشیست و ناسیۆنالیستەکان.

٤) حیزبە چەپە پاوانخوازەکان: وەك حیزبە کمۆنیستەکان.

حیزبە سیاسییەکان بە گشتی لە سێ روانگەوە موتاڵا دەکرێن:

یەك: حیزب بەو جۆرەی کە لە زەمینەی حکومەت و پارلەماندا وەك کۆمەڵێك لە کاربەدەستانی گشتی دەردەکەوێت.

دوو: حیزب بە جۆرەی کە لە دەرەوی پارلەمان وەك رێکخراوەیەك بۆ تێکۆشانی هەڵبژاردن دەردەکەوێ.

سێ: حیزب بەو جۆرەی کە وەك کۆمەڵێك ئەندام و لایەنگر و دەنگدەر لە زەمینەی هەڵبژاردندا دەردەکەوێ.

لە روانگەی یەکەمدا، جاری هەوەڵ حیزبە سیاسییەکان بە شێوەی گروپ و دەستەی رێکخراوەیی لە پارلەمان, یان هێزی بەڕێوەبەردا دەرکەوتن. لە زۆر لەو حیزبانەدا کە مێژووی کاری ئەوتۆیان هەیە، هێشتا بەشی پارلەمانیی حیزب، بەشی دەسەڵاتدار و بەرچاوی حیزبە. حیزبە پارلەمانییەکان وەك ئامێرێك بۆ رێکخستنی هەوڵ و تەقالای نوێنەران و دروست کردنی رەهەندی پەیوەندی گرتن و زانیاری بەکاردێنن. تایبەتکاریی حیزب لە بواری تەویر کردن دەربارەی سیاسەتەکانی دەوڵەت، بەڕێوە بردنی ئەو سیاسەتانە و بەکارگرتنی هێزی سیاسییە. هێزی بەڕێوەبەر لە حکومەتی دیموکراسیدا بە بێ هەبوونی حیزب نامومکینە. حیزبە سیاسییەکان بە شێوەی بەرچاو جێنشینی پارلەمان و کابینەی حکومەت لە کاروباری سیاسەت داناندا دەبن. بەرنامە و سیاسەتگەلی حکوومەت زۆر جار لە لایەن کۆنوانسیۆنی حیزبەکانەوە دیاری دەکرێ. رادەی پێویستی ئەندامانی حیزب لە پارلەماندا، لە سیستمگەلی جۆراوجۆردا جیاوازی هەیە. لە کۆنگرەی ئامریکادا پێویستیی حیزبی لە دەنگداندا لە زۆربەی پارلەمانە ئوروپاییەکان کەمترە. زۆر لە حیزبگەل, خاوەنی قۆڵ و لایەنی ئایدیۆلۆژیایەکی نێوخۆیین کە لەمپەری یەکیەتی ئەوانە. قۆڵە حیزبیەکان زۆر جار دیاریکراو و رێکخراون و لە سەر قازانجی گروپی جۆراوجۆر پێبەندن. لە کاتێکدا بۆچوونەکانی حیزب، زۆر جار رێك نەخراو و ئایدیۆلۆژیایەکن.

تێکۆشانی حیزبگەلی دەرەوەی حکوومەت و پارلەمان دیارە بە پێی حیزب و وڵات جیاوازی هەیە، حیزبەکان لەم بوارەدا شێوەی ڕێکخراوەیان چوون یەك نییە. ئەو حیزبانەی کە لە نوێنەرانی پارلەمان و هەندێ کەسایەتی ژێهاتی و سەر بە دەرەوە پێکهاتوون و ئەندامیان لە دەرەوەی پارلەمان نییە، حیزبی «کادر»یان پێ دەڵێن. ئەو حیزبانەی کە لە دەرەوەی پارلەمان ڕێکخراو و ئەندامی بەربڵاویان هەیە حیزبی «تودەیی»یان پێ دەگوترێ، زۆر جار حیزبگەلی توودەیی هەوڵ دەدەن لە ڕێگای دامەزرانی شوێن و ناوەندی جۆرواجۆری فەرهەنگی، ئایینی و فێرکاری و.. هتد وە بە ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەندامانی خۆیان وزە ببەخشن. حیزبگەلی دیموکرات مەسیحی، سوسیال دیموکرات و کمۆنیست لە ئەورووپادا زۆر جار ڕێکخراوە و تێکۆشانی ئەوتۆیان هەیە. تێکۆشانی ئەو حیزبانەی کە لە ڕاستیدا لە دەرەوەی پارلەمان دروست بوونە بە شێوەی بەرچاو لە دەرەوەی پارلەمان بەرچاو دەکەوێ. حیزبگەلی کرێکاری و سوسیال دیموکرات زۆر جار لە ڕێگای سەندیکای کرێکارییەوە ئەندامیکی زۆر لەخۆ کۆدەکەنەوە. سەندیکاگەلی کرێکاری و ڕێکخراوەی وەك ئەمان، یارمەتی بەربڵاوی وەك زانیاری، فێرکاری و وە خۆکەوتنی سیاسی و... هتد، بۆ حیزبەکان دابین دەکەن. جگە لەمانە زۆر جار ئەندامان مافی ئەندامەتی بە حیزب دەدەن، گەرچی بەم زووانە بە بڵاو بوونەوەی یارمەتیی گشتی بۆ حیزبە سیاسییەکان، دەوری ماڵی ئەندامەکان کەمڕەنگ بووەتەوە. حیزبگەلی سیاسیی میللی بەردەوام پێویستیان بە تێکۆشەری حیزبی هەیە تا تێکۆشانی جۆراوجۆر لە زەمینەی ڕێکخراوەیی و وەخۆ کەوتن و... هتد بەڕێوە ببەن. ئەم تێکۆشەرانە زۆر جار بۆ تێکۆشانیان، هاندەری ماڵی و ئایدیۆلۆژیاییان هەیە.

گرینگترین تێکۆشانی حیزبەکان لە بواری هەڵبژاردن و بە دەست هێنانی دەنگدایە. کەسانی تێکۆشەر لە باری سیاسییەوە بۆ خۆیان پێناسەی حیزبی دەبیننەوە و سەبارەت بە حیزبێکی تایبەت دڵگیری پەیدا دەکەن و ئەم هۆگری و ئەندامەتییە لە سەر ئاکاری هەڵبژاردن و دەنگی تاکگەل ئێکجار کاریگەرە.

هۆی جۆراوجۆری وەك پەیوەستیی چینایەتی، ئایینی، ئەتنیکی و... هتد بە نۆبەی خۆیان بونیادی بۆچوونی تاکگەل سەبارەت بە حیزبەکان دەگۆڕن و دەبنە هۆی پێناسەی حیزبی. حیزبە سیاسییەکان زۆر جار لە سەر ئەساسی بونیادی کەلێنی کۆمەڵایەتی پێکهاتوون، سیاسی بوونی کەلێنەکان, هۆی دروست بوونی حیزب و پێناسەی حیزبی لە سەر تەوەرەی کەلێن دەبن. لە

مێژووی ئەورووپا دوو گۆڕانکاری گەورە بوونەتە هۆی کەلێنی کۆمەڵایەتی کە لە سەر ئەم کەلێنانە حیزبی سیاسی دروست بوون یەکەم شۆڕشی نەتەوەیی و دووەم شۆڕشی پیشەسازی. شۆڕشی نەتەوەیی لە سەدەی شانزدە بە دواوە, بووە هۆی سەرهەڵدانی زمان و فەرهەنگی جیاواز و شەڕ و تێهەڵچوونی نێوان دەوڵەت و کلێسا. لە زۆر وڵاتان حیزبە سیاسییەکان لە سەر ئەم کەلێنانە پێیان گرت. شۆڕشی پیشەسازیش هۆی کەلێنی چینایەتی و کەلێنی شار و لادێی پێکهێنا کە ئەمەیش لە جێگای خۆیدا لە سەر دروست بوونی حیزب شوێنی بەرچاوی دانا. سەرجەمی ئەم کەلێنانە لە گەشەی پێناسەی حیزبی تاکگەلدا کاریگەر بوونە و بە سەرەنجدان بە پتەوی و درێژەکێشانی ئەو کەلێنگەلە، پێناسەی حیزبیش لە پتەوی و قایمی وەك یەك بەهرەمەند بوونە.

لە سەدەی بیستەمدا دەرکەوتنی ئالیشەی نوێ وەك هەستی ترسی کاربەدەستان و نەهادگەلی کلیسایی و ئایینی لە بەرانبەر پەرەسەندنی فەرهەنگی نوێدا، بەهێز بوونی هەستی قەومی و ناوچەیی، بڵاو بوونەوەی کۆچبەری نێونەتەوەیی و دۆزی ژینگە، بووەتە هۆی سەرهەڵدانی حیزبی ئایینی و قەومی نوێ, هەر وەها حیزبی دژی کۆچبەری و «حیزبی سەوز».

هەندێك لە نووسەرانی دیکە دروست بوونی حیزب لە مێژوودا بە بەرهەمی «قەیرانی گەشەسەندن» و هەوڵ بۆ وەڵام دانەوەی دەزانن. قەیرانی پێناسە، مەشروعییەت، بەشداری و دابەش کردنی ئابووری دەبێتە هۆی دروست بوونی کەشی ئایدیۆلۆژیایەکی و حیزبەکان زۆرجار ئەم کەشانە دەقۆزنەوە. بۆیە بە درێژایی مێژوو حیزبە ئایینی و سکۆلارەکان لە سەر تەوەرەی قەیرانی پێناسە، حیزبگەلی کۆماریخواز و سەڵتەنەتخواز, لە سەر تەوەرەی قەیرانی مەشروعیەت، حیزبگەلی پارێزگار و لیبرال, لە سەر تەوەرەی قەیرانی بەشداری, حیزبە سوسیالیست و کمونیستەکان لە سەر تەوەرەی قەیرانی دابەش کردنی ئابووری پێ دەگرن. پارلەمانەکانیش کە ناوەندەکانی سەرەتایی پێکهاتنی حیزبەکانن لە وەڵام بە قەیرانی مەشروعیەتدا دەرکەوتن.

## ٥-٤. سیستمگەلی حیزبی

کۆمەڵە حیزبێك کە لە هەڵبژاردنـدا بەشداری دەکەن و دەچنە پارلەمانەوە و حکومەت بە دەستەوە دەگرن، سیستەمی حیزبیی وڵاتێك لە قەڵەم دەدرێن. لە رەوەندی

دیـــموکراتیزاسیۆندا زۆر جــار گــەلێك وردە حیــزب ســەر هەڵــدەدەن و لــە حاڵەتێکــدا کــە دیـموکراسی جێگیـر دەبـێ ئـەو وردە حیزبانـە لـە نێـو سیسـتەمیکی روونتــر و پتـەوتر رێـك دەکــەون، وەك پێشتـــر ئاماژەمـــان پێکــرد تـــەنیا سیســـتمگەلی حیزبیـــی کێبـــەرکێیی، بەدیـــموکراتیك دێتـە ژمـاردن. سیسـتەمی یـەك حیزبـی و نارکەبـەری نـاتوانرێ بـە ئەساسـی دیـموکراسی لە قەڵەم بدرێ.

لــە پۆلیـــن کردنـی سیســتمگەلی حیزبییــدا، دەبـێ چـەندین هـۆ لـە بەرچـاو بگیـــرێ: یەکـەم فرەیـی حیزبـەکان، دووەم ئەنـدازە و بـەربلاویان لـە بـارەی پشـتیوانیی دەنگـدەرانیان و حوزوریــان لــە پارلــەمان و حکومەتـدا. سـێیەم، تـەوەرە سـەرەکییەکانی رکەبـەری نێــوان حیزبــەکان، چــوارەم کەلێنــە کۆمەلایەتییــەکان کــە ژێرخــانی حیــزب دروســت دەکــەن و پێنجەم، پتەوی و بەردەوامیی شێوەکانی دەنگدان.

فرەیـی حیزبـەکان هاسانتـــرین پێوانەیـە بـۆ پـولین کردنـی جۆرەکـانی سیسـتەمی حیزبـی. لە نێـوان فرەیـی حیزبـەکان و زۆر تایبەتـــمەندیی سیسـتەمی حیزبیـدا پەیوەنـدی هەیـە. لـەم بـارەوە سیســتمگەلی حیزبـی بـە یـەك حیزبـی، دوو حیزبـی و فرەحیزبـی دابـەش دەبـن. وەك ئامــاژەی پێکـرا، سیسـتمگەلی یـەك حیزبـی, بـە هـۆی جیاوازییــەك کـە لـە بـاری بناغـەی ئایـدیۆلۆژیای و بونیــادی دەســەلاتەوە لەگــەڵ دیـــموکراسیدا هەیــەتی، لەگــەڵ سیســـتەمی دووحیزبی و فرەحیزبی پێوانە ناکرێت.

لە سیستەمی یـەك حیزبیـدا رەنگـە بەشـداریی سیاسـی زۆر بـەر چـاو بـێ بـەلام پێوانـەی دیـموکراسیی رکەبـەری لـە ئـارادا نییـە، لـە هەنـدێ سیسـتەمی یـەك حیزبیـدا، تـەنیا یـەك حیزب لە چاوی یاسـاوە مافـــی تێکۆشـانی هەیـە و رەقیبـان لادەبـرێن یـان سـەرکوت دەکـرێن. لە هەندێکی تردا، حیزبـی رەقیـب لـە بـاری یاسـاییەوە مۆڵـەتی تێکۆشـانی هەیـە، بـەلام بـە کردەوە ئەم کارەی بۆ جێبەجێ نـاکرێ لـە بـەر ئـەوەی حیزبێکـی بـە دەسـەلات دەسـتی بـە سـەر هەمـوو کاروبارێکـدا کێشـاوە. دۆخـی دیکـە ئەوەیـە کـە حیزبگـەلی رەقیـب لـە کـردەوە و لـە بـــاری یاســـاییەوە ئیمکـــانی تێکۆشـــان و رکەبـــەریان هەیـــە بـــەلام بـــە کـــردەوە حیزبێکـــی دیاریکراو دەستی بالای هەیە و بەردەوام دەسەلاتی سیاسی لە دەست دایە.

حیزبی کۆنگرە لە هیندوستان و حیزبی سوسیال دیموکراتی سوید، بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ حیزبی بە دەسەلات بوون. سیستەمی حیزبی بە دەسەلاتی لەم رەنگە، ناکرێ بە نادیموکراتیك لە قەڵەم بدرێ.

لەسەریەك سیستمگەلی یەك حیزبی بە مەبەستی یەکیەتی و پێشگیری لە رکەبەری نێوان هێزە سیاسییەکان لە هەل و مەرجی دژواردا چێ دەبن. هەندێ لە لایەنگرانی سیستەمی یەك حیزبی دەلیلیان هێناوەتەوە کە سیستەمی سیاسیی دڵخواز زیادتر لە بنەماڵە دەچێ تا کۆمەڵگای مەدەنی و بۆیە بەم پێیە، سیستەمی یەك حیزبی، سیستەمێکی سروشتییە. لە وڵاتانی ئەنگلۆساکسۆندا سیستەمی دووحیزبی بەهێزە. بە گشتی چوار ئیمتیازی ئەسڵی بۆ ئەم جۆرە سیستمگەلە بە بەراورد لەگەڵ سیستەمی فرەحیزبیدا ناو دەبەن:

میانەڕەوی لە سیاسەت دانان، هەڵبژاردنی روون و بەر چاو و بەر پرسایەتیی روون، میانەڕەوی لە سیاسەت داناندا لێرەوە سەر هەڵ دەدا کە دوو حیزب بە مەبەستی سەرکەوتن لە هەڵبژاردندا چاو دەبڕنە دەنگدەرانی میانەڕەو، یان نێوەنجی، لە بەر ئەوەی لە سیستمگەلی دووحیزبیی پارلەمانیدا، بەردەوام حیزبێك زۆرینەی پارلەمانی لە دەست دایە، حکومەت لە دەستی حیزبی زۆرینە دایە. ئەم دەوڵەتانە لە راستیدا لە دەوڵەتگەلی کەمینە و هاوپەیمان پتەوترن. هەر وەها هەڵبژاردن بۆ دەنگدەران لە نێو دوو حیزبدا ئاسانتر دەبێ، بەر پرسایەتیش بە روونی دەکەوێتە ئەستۆی حیزبی زۆرینەوە. وەك دواتر لە بەشی سیستمگەلی هەڵبژاردندا دەیبینین، ماهیەتی سیستەمی هەڵبژاردن لە سەر فرەحیزبی کاریگەرە. لە نێوان سیستەمی دووحیزبی و سیستەمی هەڵبژاردنی زۆرینەدا، پەیوەندییەکی مانادار دۆزراوەتەوە. لە بەر ئەوەی ژمارەی ئەو پالێوراوانەی کە لە حەوزەیێکی هەڵبژاردنەوە دیاری دەکرێن لەم بارەوە کاریگەرە، لە سیستەمی هەڵبژاردنی زۆرینەیی کە سەر بە حەوزەی یەك نوێنەرە، زۆر جار دوو حیزبی گەورە دێنە سەر، لە بەر ئەوەی وەدەست هێنانی سەرکەوتن بۆ حیزبە گچکەکان زۆر ئەستەمە. لە ئاکامدا بە گشتی دوو حیزب دەچنە مەجلیسەوە و حیزبەکانی تر بە رادەی هێزی خۆیان نوێنەریان نابێ. لە لایێکی ترەوە گەر هەموو وڵات یەك بازنەی هەڵبژارن

بێ، بچکۆلەترین حیزبیش دەتوانی نوێنەر وەدەست بێنێ و لە ئاکامی ئەمەدا ژمارەی حیزبەکان دەڕواتە سەر. زۆر سیستەمی هەڵبژاردن لە سەر حەوزەی چەند نوێنەری دامەزراوە. بۆ دابەش کردنی کورسی هەر بازنەیەك لە نێوان حیزبەکان، لە رەوشی نوێنەرایەتیی رێژەیی کەڵك وەردەگیرێ، لە لایێکی ترەوە سیستەمی دووحیزبی زۆر جار لە وڵاتیکدا پەیدا دەبێ کە لە باری بونیادی کەلێنی کۆمەڵایەتییەوە ساکارتر بێ، واتە خاوەنی یەك کەلێنی گەورە و بەکارن و کەلێنە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە خامۆش و ساردن. بە پێچەوانەوە هەر چی کەلێنگەلی کۆمەڵایەتی جۆراوجۆرتر و ئاڵۆزتر بێ، ژمارەی حیزبەکانی زۆرتر دەبێ. کەوتنە سەر یەکی کەلێنەکانی چینایەتی، ئایینی، ئەتنیکی و... هتد، ژمارەی بوارەکانی لایەنگری سیاسی زیاد دەکات کە ئەمەش بۆ خۆی ژمارەی حیزبەکان دەباتە سەر. لە نێوان سیستمە فرەحیزبییەکانیشدا جیاوازی هەیە، هەندێ لە نووسەران ناوی دوو جۆر سیستەمی فرەحیزبی دەهێنن، یەکێك سیستەمی فرەحیزبیی مام ناوەندییە کە لەودا ژماری حیزبە بە کارەکان لە بەینی سێ تا پێنج دایە و ئەوی تر فرەحیزبی زێدەڕۆیە کە لەوێدا زیاتر لە پێنج حیزبی گەورە و بەکار هەن. لە سیستمگەلی مام ناوەندیدا بڕستی ئایدیۆلۆژیای کورتترە و مەیلی دەنگدەران بۆ حیزبە میانەڕەوەکان زۆرترە. لەم سیستمگەلەدا حکومەت لە هاوپەیمانیی دوو یان چەند حیزب دورست دەبێ و بە گشتی وەك دوو بلۆکی دژ بە یەك, هەمبەری یەکتری دەوەستێن. سیستەمی فرەحیزبیی مام ناوەندی لە وەڵاتانی وەك ئاڵمان، ئیسکاندینافی، بلژیك، سوویسدا جێگیرە.

تایبەتمەندیی سیستمگەلی فرەحیزبیی زێدەڕۆ، هەبوونی حیزبی دژی سیستم، بواری ئیدئۆڵۆژی بەربلاوتر لە راستی زێدەڕۆ تا چەپی زێدەڕۆ، هەبوونی ئۆپۆزیسیۆنی «بێ وەفا» و نا پتەوی سیاسییە. گرینگترین تایبەتمەندیی «جەمسەر بوون»٤ یەعنی مەودای بەرچاوی ئیدئۆڵۆژی نێوان حیزبەکانە. وێنەی زەقی ئەم سیستمە ئیتالیایە.

پێوانەی دووهەم: قورسایی و گرینگی حیزبەکان لە باری پشتیوانیی هەڵبژاردن، لە حکومەت و پارلەمان ئەندام بوون، توانایی دروست کردنی حکوومەتی هاوپەیمان و

---

1-Polarizasion.

لەم شتانەیە. کەوا بوو ژمارەی تەنیا و دەوری زۆرینە، ناکرێت هەموو حیزبەکان هاوسەنگ بن، بەڵکو ئەبێ حیزبە تێکۆشەر و گرینگ و گەورەکان کە لە باری سیاسییەوە دەوری دیاریکراویان هەیە، لە بەرچاو بگیرێ. هەندێ لێکۆڵینەوەی سەرەتایی وەدەست هێنانی ٥ تا ١٠ لە سەدەی دەنگان بۆ حیزبەکان، وەك پێوانە و گرنگی حیزبەکان دەزانێ. ئەم پێوانە کەوتووەتە بەر ڕەخنەی هەندێ لە خاوەنڕایان، لە بەر ئەوەی هەندێ حیزبی گچکە بەڵام خاوەن دەور لە دروست کردنی هاوپەیمانیدا پشت گوێ دەخرێن. لەم ڕووەوە توانایی ئامادەگی لە حکومەتی هاوپەیمان, یان توانایی «باجخوازی» وەك پێوانەی قورسایی و گرینگی حیزبەکان هاتووەتە ئاراوە. بە لانی کەمەوە بەشداری لە وتووێژان، بۆ دروست کردنی حکوومەت وەك پێوانەی گرینگی حیزبەکان چاوی لێ دەکرێ. هەر چۆنێکی بێ ئەم پێوانەیە نیشانەی ئەوەیە کە حیزبگەلی ناوبراو بۆچوونی سیاسیی گونجاو, یان گرینگیان بۆ دروست کردنی حکوومەت یان هاوپەیمانیی حیزبی هەیە. مەبەست لە «باجخوازی» ئەوەیە کە حیزبێك بتوانێ لە سەر ڕەوەندی دروست کردنی هاوپەیمانی, یان ئیستراتژی حیزبەکانی دیکە شوێن دابنێ، بە بێ ئەوەی خۆی لە وتوبێژی سەبارەت بە هاوپەیمانی بەشداری بکات. بۆ وێنە حیزبە کمۆنیستەکانی دژ لە ڕابردوودا لە هەندێ وڵاتی ئەورووپایی گرینگی و قورساییان هەبوو.

تەوەرەکانی ڕکەبەری نێوان حیزبەکان لە سەر شێوەی سیستەمی حیزبی کاریگەر دەبن. ئەو هەڵوێستانەی کە حیزبە سیاسییەکان لە بەرنامەی هەڵبژاردنی خۆیاندا ەەردەگرن، لە هەندێ لە وڵاتان بە شێوەی بەر چاو پەیوەندیی بە مەسەلەی دەستتێوەردان یان نەدانی دەوڵەت لە ئابووری، هەڵئاوسان,ماڵیات و... هتدە کە دەبێتە هۆی دروست بوونی حیزبگەلی ڕاست و چەپ بە شێوەی کۆنینە. لەو وڵاتانەی کە پەیوەندیی نێوان دەوڵەت و ئایین گرینگە، دیارە گرسانی سیستمگەلی حیزبی جیاواز دەبێ. سەرهەڵدانی دۆزگەلی نوێی وەك، پشتیوانی لە مافی ژنان و کەمینەکان، شلوێ بوونی ژینگە، کۆچبەری نێونەتەوەیی و... هتد لە سەر گرسانی سیستمگەلی حیزبی کاریگەر دەبێ. لە سەرەتادا بزاڤی کۆمەڵایەتی نوێ وەك بزاڤی ژینگە، چەك کردن و... هتد لە دەرەوەی

حیزبە سیاسییە جێگیرەکان دەرکەوتن و دەستیان بە تێکۆشان کرد. دواتر زۆر حیزبی سیاسی بە مەبەستی ئەوەی کە لە قافڵەی گۆڕانگاری نوێ دوانەکەون، هەڵوێستی پێویستیان سەبارەت بەم بزاڤانە وەرگرت و کەوتنە هاوکاری لەگەڵیاندا.

لە هەڵوێستی حیزبی تاکگەلدا، هەم هۆی بونیادی و مێژوویی وەك ئەتنیك، ئایین و هەستی چینایەتی کاریگەرن و هەم حەز و دۆزی نوێ کە لەگەڵ گۆڕانکاری فەننی و ئابووری سەر هەڵدەدەن. کەلێنگەلی کۆنینەی ناوەند، کەنار، شار، دێ، دەوڵەت، کلیسا و چینی بالاو خوار، هەر وەها لە سەر هەڵوێستی هەڵبژاردنی تاکگەل کاریگەرە و بەو پێیە چۆن تێکەڵ دەبن و چۆن دەگیرسێن، کار لە سیستەمی حیزبی دەکەن. لە وڵاتانی ئەنگلۆساکسۆن گرینگترین کەلێنی بەرچاو، کەلێنی چینایەتییە. لە حاڵێکدا لە دیموکراسیگەلی تردا کەلێنی دین و دەوڵەت، ناوەند و کەنار هەر وەها بەکارن و لە سەر شێوەی سیستمگەلی حیزبی زۆر کاریگەرن. بەم حاڵەیشەوە لە دیموکراسیی رۆژئاوا, کەلێنی چینایەتی، بەرچاوترین کەلێنی کاریگەرە لە سەر هەڵوێستی هەڵبژاردن و گیرسانی سیستمگەلی حیزبی، بۆیە دەتوانین بڵێین کە گۆڕانگاری بنەڕەتی لە شێوەی دەنگدان لە دیموکراسیی رۆژئاوادا رووی نەداوە. سەرەڕای ئەم شتانە وادیارە دەوری تەمەن و رەگەز بەرچاوتر بوو.

حیزبگەلی تازەتر وەك سەوزەکان، پشتیوانی فرە لە خۆیان لە چاوی نەسڵی نوێ و لاوەوە دەبینن، لە کاتێکدا حیزبگەلی جێگیر زیاتر لە لایان تاقمگەلی بە تەمەنەوە پشتیوانیان لێ دەکرێ. هەر وەها وەخۆکەوتنی سیاسیی ژنان، گۆڕانکاری گەورەی لە شێوەی دەنگداندا دروست کردووە. بە پێچەوانەی رابردوو، وادیارە کە ژنان زیاتر بۆ لای حیزبە چەپەکان ئاژواون. لە شێوە دەنگدانی بەشەکانی نێوخۆی چینی کرێکاریش ئاڵوگۆڕ پێکهاتووە. کرێکارانی بەشی دەوڵەتی کە کەمتر لە کرێکارانی بەشی تایبەتی دەکەونە بەر تەوژمی رکەبەری بازاڕەوە، زیاتر دەنگ بە حیزبە میانەڕەو و راستەکان دەدەن. بڵاو بوونەوەی پابەند نەبوونی هاووڵاتیان بە حیزبێکی سیاسی تایبەت، بە شێوەی بەردەوام و گۆڕانی دەنگیان لە حیزبێکەوە بۆ یەکێکی دیکە لە هەڵبژارنی جیاوازدا، یەکێك لە شتە خاوەن سەرنجە نوێکانە.

## ٥-٥. سیستمگەلی هەڵبژاردن

سیستەمی هەڵبژاردن، سیستەمێکە کە دەنگدان بۆ پلە و پایەی سیاسی دەگۆڕێ. گرینگترین باسەکانی سیستمگەلی هەڵبژاردن، بریتین لە: فرمۆڵی هەڵبژاردن «سیستەمی زۆرینەی ساکار، زۆرینەی موتڵەق و نوێنەرایەتی ڕێژەیی»، قورسایی ژمارەی حەوزەکانی هەڵبژاردن (ژمارەی نوێنەرایەتی پێویستی هەر بازنەیەك ڕادەی پێگەیشتنی هەڵبژاردن «لانی کەمی ئەو پشتیوانیەی کە هەر حیزبێك بۆ وەدەست هێنانی نوێنەرایەتی پێویستی پێی هەیە» و بونیادی دەنگدان «ئیمکانی دەنگدان بە زیاتر لە حیزبێك لە هەڵبژاردن.» دۆزی دیکە وەك مەرجەکانی وەدەست هێنانی مافی دەنگدان، بۆچوونە بەرچاوەکانی پاڵێوراوی، دەستووری زاڵ بە سەر بەهای کێبەرکێی هەڵبژاردن، ماوەی وەرگرتنی پلە و... هتد، لە ڕاستیدا لە باسەکانی سیستمگەلی هەڵبژاردن نین. وەك وتمان سیستمگەلی هەڵبژاردن لەگەڵ شێوەی گۆڕانی دەنگ، بۆ کورسی پەیوەندی هەیە. لە دیموکراسیدا سیستەمی هەڵبژاردنی گرینگیی زۆر هەیە، لە بەر ئەوەی لە دیاری کردنی ئاکامەکانی هەڵبژاردندا: ماهیەتی سیستەمی حیزبی، ژمارەی حیزبە گەورەکان، یەك حیزبی, یان هاوپەیمانیی بوونی کابینە و یەکگرتوویی نێوخۆی حیزبە سیاسییەکاندا زۆر کاریگەرە، بە جۆرێك کە بە گۆڕانی سیستەمی هەڵبژاردن دەکرێ ماهیەتی دیموکراسی دەستکاری بکرێت.

گرینگترین شێوەکانی هەڵبژاردن، شێوەی لانی زۆر، شێوەی نوێنەرایەتی ڕێژەیی و شێوەی نوێنەرایەتی نیوەرێژەییە. سیستەمی لانی زۆر دەکرێ بۆ هەڵبژاردنی سەرۆك کۆمار و نوێنەرانی پارلەمان کەڵکی لێ وەرگیرێ. لە هەڵبژاردنی پارلەمانیدا لەوانەیە بازنەی نوێنەرایەتی یەك نوێنەری, یان یەك کورسی بێ یان چەند نوێنەری و فرەکورسیی بێ.

ساکارترین شێوە، هەڵبژاردنی یەك نوێنەرە لە بازنەیەکی هەڵبژاردنی یەك نوێنەری دایە. لە نێوان شێوەکانی زۆرینەی جیاوازدا، سیستەمی زۆرینەی ساکار یان زۆرینەی ڕێژەیی زۆر باوە. لەم سیستەمەدا پاڵێوراوێك کە زۆرترین دەنگ وەدەس بێنێ، سەر

دەکەوێ. بۆیە لانی زۆرینەی رەها یان نیوە بە ئیزافەی یەك بۆ سەرکەوتن پێویست نییە.

ئەم سیستمە لە روانگەی زۆر لایەنگری دیموکراسیەوە دڵخواز نییە: لە بەر ئەوەی بە پێچەوانەی «یاسای تەلایی زۆرینە» لە دیموکراسی دایە و رەنگە بەم بۆنەوە کەسێك سەرکەوێ کە لانی زۆر بەو کەسە دەنگیان نەدابێ. لەم روانگەیەدا گەر سەرۆك کۆمارێك کەمتر لە ٣٠ لە سەدی دەنگانی وەدەست هێنا بێ, بە خاوەنی مەشروعیەت ناناسرێ.

بە مەبەستی دەستەبەر کردنی زۆرینەی موتڵەقی دەنگان، بۆ سەرکەوتن لە هەڵبژاردندا، فۆرمۆڵی جۆراوجۆر پێشنیاز کراوە. ساناترینی ئەم شێوەیە، کە هەڵبژاردن ئەوەندە دووپات کەینەوە تا یەك لە پاڵێوراوان زۆرینەی دەنگان وەدەست دێنێ. بەڵام ئەم شێوەیە بۆ هەڵبژاردنی گشتی پڕ خەرج و نابەجێیە. لەم رووەوە ژمارەی هەڵبژاردن لە فرمووڵێکی دیکەدا بۆ دوو دەور کورت کراوەتەوە کە دوو شێوەی جیاوازی هەیە: یەك شێوەی تێکەڵ لە زۆرینەی نسبی و زۆینەی موتڵەق و ئەوی تر شێوەی زۆرینە موتڵەق لە خولی دووەمدا. لە شێوەی یەکەمدا لە خولی یەکەمدا دەبێ زۆرینەی موتڵەق وەدەست بێت، گەر ئەم زۆرینەیە بەر کەس نەکەوێ، لە خولی دووەمی هەڵبژاردندا ئەو پاڵێوراوەی کە زۆرینەی نسبی وەدەست بێنی، سەردەکەوێ, لە ئاکامدا، ئەو دەنگدەرانەی کە نایانەوێ دەنگیان بە خۆڕایی لە کیس بچێ، دەنگ بە پاڵێوراوانی بەهێز دەدەن. هەر وەها پاڵێوراوانی لاوازی خولی یەکەم، زۆر جار بۆ خولی دووەم ناونووسی ناکەن, یان ئەگەر پێوانەیێك بۆ دەنگ لە خولی یەکەمدا دیاری کرابێت، لە بەشداریان بۆ خولی دووەم پێشگیری دەکرێ.

لە شێوەی دووەمدا: تەنیا ئەو دوو پاڵێوراوەی کە لە خوولی یەکەم زۆرترین دەنگیان وەدەست هێناوە، دەمێننەوە و ئەوانی تر لادەبرێن. خوولی دووەم لە حاڵێکدا بەرێوە دەچێ کە لە خوولی یەکەمدا هیچکام لە پاڵێوراوان زۆرینەی موتڵەقیان وەدەست نەهێنا بێ. دیارە لەم شێوەدا لەوانەیە پاڵێوراوی زۆر بەهێز بە هاسانی لاببرێ.

شێوەکی تری زۆرینەیی، شێوەی جێنشینی دەنگان لە هەڵبژاردنی یەك خوولی دایە. لەم شێوەدا دەنگدەران پاڵێوراوی خۆیان بە پێی حەز ریز دەکەن. گەر پاڵێوراوێك، زۆرینەی موتڵەقی ریزی یەکەمی وەدەست هێنا، سەر دەکەوێ. جگە لەمە پاڵێوراوێك

لانی کەمی ریزەکـانی یەکـەمی وەدەسـت هێنـا، لادەبـرێ و دەنگـەکانی ئـەو وەك ریـزی یەکـەم بە سەر پالێوراوانی دیکە بە پێـی ریـزی دووەم دابـەش دەکـرێ. ئـەم کێشـەیە درێـژەی دەبـێ تـا پالێوواوێـك زۆرینـەی دەنگـان وەدەسـت بـێنی. وەك نـموونە چـوار پـالێوراوی ئـەلف، ب، ج، د بـەرێز ۱۰، ۲۰، ۳۰، ٤۰ لـە سـەدی ریزەکـانی یەکـەمیان وەدەسـت هێنـاوە. لـە رەوەنـدی جێنشـینیدا، پـالێوراوی «د» لادەبـرێ و دەنگـەکانی بـە پێـی ریـزی دووەم دابـەش دەکـرێ. بـۆ وێنە گەر نیوەی ریـزی دووەم بـدرێ بـە «ب» و «ج» لـەم حاڵـەدا، الـف و ب و ج بـە ریـز ٤۰، ۳۵، ۲۵ لـە سـەدی دەنگـان وەدەسـت دێـنن. لـە پلـەی دواتـر «ج» لادەبـرێ و دەنگـەکانی بـە ریز لە نێـوان پالێوراوانـدا دابـەش دەکـرێ تـا لـە کۆتاییـدا پـالێوراوی خـاوەن زۆرینـە دیـاری دەکـرێ. شـێوەیەکی تـری زۆرینـەیی، تێکـەڵ کردنـی رێگـای زۆرینـەی سـاکار لەگـەڵ هەڵبـژارنی سـەرەتایی لـە ئـەمریکا دایـە. رێگـای بـە رۆژی هەڵبـژاردنی مەجلیسـی نوێنـەران لـە ئـەمریکا، بەشـداریی پـالێوراوان لـە هەڵبـژاردنی سـەرەتاییدایە کـە لێـرەدا بـە پێـی زۆرینـەی سـاکار پـالێوراوانی حیـزب هەڵدەبـژیرێن. بـەڵام پـالێوراوانی دوو حیزبـی سـەرەکی لـە هەڵبژاردنی گشـتیدا بـە شـێوەی زۆرینـەی سـاکار هەڵدەبـژیردرێ. بـەم جـۆرە هەڵبـژاردنی ئـەوتۆی دووپلەیی، رەنگە وەدەست هێنانی زۆرینەی موتڵەقی لە لایان پالێوراوانەوە بباتە سەر.

ئوسـوڵی زۆرینـەی سـاکار لـە هەڵبـژاردنی گشـتیدا کۆمـەك بـە کـردەوەی بـەردەوامبوونی سیسـتەمی دوو حیزبـی دەکـات و سیسـتەمی هەڵبـژاردنی سـەرەتایی، پـالێوراوان هـان دەدا لـە بـاتی پەیوەسـت بـوون بـە حیزبـی گچـکەوە، لـە هەڵبـژاردنی سـەرەتایی دوو حیزبـی سەرەکیدا بەشداری بکـەن. رەوشـێکی دیکـە کـە لـە هەنـدێ وڵاتـی ئـەمریکای لاتینـدا بـاوە، رەوشـی «دەنگـدانی دووجـۆری هاوکاتـە» کـە لـەودا پـالێوراوی سـەرکەوتوو، واتـە پـالێوراوی حیزبـی سـەرکەوتوو، واتـە ئـەو حیزبـەی کـە پالێوراوەکـانی لەسـەریەك زۆرتـرین دەنگیـان وەدەست هێناوە و ئەو پـالێوراوەی حیـزب کـە لـەوانی تـر دەنگـی زیـاتری وەدەسـت هێنـاوە. بـۆ وێنـە ئەگـەر پالێوراوگـەلی ئـەلف و ب لـە حیزبـی یەکـەم بـە ریـز ۳۰ و ۲۵ لـە سـەدەی دەنگـانی وەدەسـت هێنابـێ و ج و د لـە حیزبـی دووەم بـەرێز ۳۵ و ۱۰ لـە سـەدی دەنگـانی وەدەسـت هێنابـێ، لـە بـەر ئـەوەی حیزبـی یەکـەم لـە سـەر یـەك ٥٥ لـە سـەدی دەنگـەکانی وەدەسـت هێنـاوە، سـەرکەوتووە و پـالێوراوی ئـەلف وەك بـە توانـاترین پـالێوراوی ئـەو حیزبـە

سەر دەکەوێ، هەر چەندە ژمارەی دەنگەکانی ئەو کەمتر بێ لە دەنگەکانی پالێوراوی (ج)ی حیزبی دووەم. بە گشتی رەوشی زۆرینەیی بە سوودی حیزبە گەورەکان تەواو دەبێ و هەر وەها جێگیر بوونی سیستەمی دوو حیزبی هان دەدا، لە بەر ئەوەی پالێوراوانی حیزبە چکۆلەکان لە بازنەی هەڵبژاردنی یەك نوێنەری، شانسی سەرکەوتنیان زۆر کەمە. بەم پێیە هەڵبژاردن بە رەوشی زۆرینەیی دەبێتە هۆی ناهاوسەنگیی لە نێوان ژمارەی ئەو کورسیانەی وەدەست هاتووە. بۆ وێنە لە چوار هەڵبژاردنی پارلەمانی ئینگلستان لە ساڵی ١٩٧٩ تا ١٩٩٢ حیزبی پاریزگار، نێوەنجی ٤٢/٦ لە سەدی دەنگەکانی وەدەست هێناوە، بەڵام ٥٦ لە سەدی کورسیەکانی پارلەمانی بەرکەوتووە. حیزبی کرێکار ٣٢/٤ لە سەدی دەنگەکانی لەگەڵ ٣٧/٨ لە سەدی کورسیەکانی وەدەست هێناوە. بەڵام حیزبی سێیەم یەعنی لیبرال دیموکرات ١٩/٩ لە سەدی دەنگان وەدەست هێناوە کەچی تەنیا ٢/٩ لە سەدی کورسیەکانی وەدەست هێناوە.

یەکێك لە بەڵگەکانی هەڵبژاردنی شێوەی نوێنەرایەتی رێژەیی لە لایان زۆر لە ولاتانەوە پێشگیری لە ناهاوسەنگیی ئەوتۆیە. هەر چۆنێکی بێ ئەم شێوەیە تەنیا سەبارەت بە هەڵبژاردنی نەهادگەلی فرەئەندام وەك پارلەمان کارایی هەیە و خۆی بە دوو شێوە بەرێوە دەچێ: یەکێك رەوشی هەڵبژاردن لە نێو پێرستگەلی حیزبی و ئەوی تر هەڵبژاردن لە نێو پالێوراوان لە رێگای دیاری کردنی ئەوانەی کە لە پێشتر و سەرترن.

سیستەمی نوێنەرایەتیی رێژەیی لە سەدەی ١٩ دا پێکهات و لە دەیەکانی سەرەتایی سەدەی بیستەم لە لایان زۆر ولاتی ئەورووپی کە رەوشی زۆرینەیان بەکار دەهێنا، وەرگیرا و ئەمرۆکە باوترین رەوشی هەڵبژاردنە لە پارلەمانەکاندا.

رەوشی زۆرینەیی بە شێوەی سەرەکیی لە ئینگلستان و ئەو ولاتانەی کە ژێردەستیە ئەو بوونە، باوە «واتە ئەمریکا، کانادا، ئوسترالیا، نیوزلەند، هیند، مالیزیا و... هتد». لە نێوان ئەو ولاتانەدا کە پەیرەوی لە سوننەتی ئەنگلۆساکسۆن دەکەن، لە هەر جێ و هەر هەڵبژاردنێکی تایبەتی، نوێنەرایەتیی رێژەیی بە رۆژە، شێوەی دووەم بە کار دێت. سیستمگەلی هەڵبژاردنی باو لە دیموکراسییەکانی دیکە، نوێنەرایەتیی رێژەیی لە شێوەی یەکەم باوە «پێرستی پالێوراوان». لە سیستەمی نوێنەرایەتیی رێژەیی هەرچی

پاڵێوراوانی حەوزەگەلی هەڵبـژاردن زیـاتر بـێ، ئیمکـانی وەدەسـت هێنـانی کورسـی لـە لایـەن حیزبە گچـکەکانەوە زیـاتر دەبـێ، بـە پێچـەوانە ئـەو حەوزەگـەلی هۆیـان بـۆ نوێنـەر کـەمترە، لەمپەری ڕێگای حیزبـە گچـکەکانە، لـە بـەر ئـەوەی دروسـت کردنـی هاوسـەنگی لـە نێـوان دەنگـان و کورسـییەکان، ئامانـجی سـەرەکی بـەکارهێنانی نوێنەرایـەتیی ڕێژەیـە، وڵاتـانی ناوبراو کورسیی حەوزەکانی هەڵبژاردنیان زیاد بکات.

## ٥-٦. هەڵبژاردنی ناڕاستەوخۆ

لـە هەنـدێ وڵات هێـزی بەڕێوەبـەر, یـان بەشـێك لـە هێـزی یاسـادانەر «ئەنجومـەنی دووەم» لـە لایـەن نوێنـەرانی بـژاردەی خـەڵك لـە پارلـەمان, یـان کالیجگـەلی هەڵبـژاردن، دیـاری دەکـرێن و دادەنـرێن. واتـە راسـتەوخۆ لـە لایـەن خەڵکـەوە دیـاری نـاکرێن. لـە سیسـتمگەلی پارلەمانیـدا دیـارە هێـزی بەڕێوەبـەر ناڕاسـتەوخۆ دیـاری دەکـرێ. خـەڵك نوێنـەرانی خۆیـان بـۆ پارلـەمان هەڵدەبـژێرن و پارلـەمان سـەرۆك وەزیـر دیـاری دەکـات و دەتـوانێ بـە دەنگـی بـێ بڕوایـی لـە سـەر کـار لایبـەن. لـە هەنـدێ وڵات وەك سـوویس، پارلەمان سەرۆك وەزیر هەڵدەبـژێرێ بـەڵام لـە ڕێگـای دەنگـی بـێ بڕواییـەوە نـاتوانێ لـە سـەر کـاری لاببـات. لـە هەنـدێ دیـموکراسیی پارلـەمانی، سـەرۆك کۆمـار (سـەرۆکی دەوڵـەت) لـە لایـەن پارلەمانـەوە بـۆ مـاوەیێکی دیـاری کـراو هەڵدەبـژێردرێت. هێـزی سـەرۆك کۆمـار بەسـراوەیە بـە وت و وێـژ لەگـەڵ ڕێبـەرانی حیزبـەکان بـۆ هەڵبـژاردنی سـەرۆك وەزیـر و هـەر وەهـا تەختـەکردنی پارلـەمان ئەگـەر چـێ بـوونی حکومـەتی نـوێ جێبـەجێ نـەبێت. لـە سیسـتمگەلی سـەرۆکایەتیدا زۆر جـار سـەرۆك کۆمـار کـە سـەرۆکی حکومەتیشـە، راسـتەوخۆ لـە لایـەن خەڵکـەوە هەڵدەبـژێردرێ. جـاری وایـە سـەرۆکی وڵات بـۆ وێنـە لـە ئەمریکا لە لایـەن کـالیجی هەڵبژاردنـەوە دیـاری دەکـرێ. ئـەم دەسـتەیە تـەنیا بـە مەبەسـتی هەڵبژاردنی سـەرۆك کۆمـار چـێ دەبـێ و دوای هەڵبـژاردن لـە نـاو دەچـێ. ئەنـدامانی دەسـتە کـە نوێنـەری مەجلیسـی یاسـادانەر نیـن، بـەڵکو تـەنیا بـە مەبەسـتی نـاوبراو لـە لایـەن خەڵکەوە دیاری دەکـرێن. لـە راسـتیدا هـیچ کـات ئـەم دەسـتە بـۆ هاوبیـریی دروسـت نابـێ،

بەڵكو نوێنەرایەتی ئەیالەتەكان لەو ناوەندەدا دەنگی خۆیان دەردەبڕن. لە هەندێ وڵات ئەندامانی مەجلیسی یاسادانانی دووەم لە لایەن ئەندامانی مەجلیسی یەكەمەوە ناڕاستەوخۆ هەڵدەبژێرێن. لە فەڕەنسە و هۆڵەند، ئەندامانی مەجلیسی سەنا لە لایەن مەجلیسگەلی یاسادانانی ناوچەییەوە هەڵدەبژێردرێن.

لە ئاڵمان سەرۆك وەزیرانی ئەیالەتەكان، نوێنەرایەتی خۆیان بۆ مەجلیسی دووەم (بوند سرات) دیاری دەكەن. (لە ئەیالەتەكانی ئاڵمان سیستەمی پارلەمانی لە سەر كاردایە و سەرۆك وەزیران لە لایەن پارلەمانەوە دیاری دەكرێت).

## ٥-٧. خەباتی هەڵبژاردن

خەباتی هەڵبژاردن، كۆمەڵێك تێكۆشانی هاندەرانەیە لە ماوەی پێش دەنگ وەرگرتن و هەڵبژاردن كە لە لایەن بەربژاران (كاندیدەكان)ی هەڵبژاردنەوە بەڕێوە دەچێ و شێوەی جۆراوجۆر بە خۆیەوە دەگرێ، كە ئەمەش پێتڤێ و هەر وەها یاسای چاوەڕوانكراوی خۆی هەیە. هەر خەباتێكی هەڵبژاردن سێ لایەنی هەیە. یەكەم: بەربژاران دووەم: میدیای راگەیێنەری پەیامی هەڵبژاردن و سێیەم: دەنگدەران. ماوەی خەباتی هەڵبژاردنی یاسایی لە مەودای نێوان نەمانی پارلەمانی كۆن و دەست پێكردنی پارلەمان دواترە كە نێوەنجیەكەی نزیكەی مانگێك دەخایێنێ. لە زۆر وڵاتان خەباتی دژواری هەڵبژاردن لە دوو حەوتووی دواتردا كۆ دەبێتەوە.

تێكۆشانی هەڵبژاردن لە باری جۆری پرۆپاگەندە «هەلاڵەكردن» و رادەی نرخگەل، بە گشتی لە چوارچێوەی یاسا و رێگای تایبەتدا جێبەجێ دەكرێ. خەباتی هەڵبژاردن لە باری هاندانی خەڵك بۆ بەشداری لە هەڵبژاردندا دەوری دیاریكراوی هەیە. بەڵام لە وڵاتانی وەك ئیتالیا، بلژیك و ئوسترالیا كە دەنگدان لێرەدا بە زۆرییە و بە گشتی نزیكەی ٩٠ لە سەدی كەسانی خاوەن دەنگ، دەنگ دەدن، رادەی كارتێكردنی خەباتی هەڵبژاردن لە هاندانی خەڵك بۆ بەشداری لە هەڵبژاردندا، دیارە بەرچاو نییە. لە خەباتی هەڵبژاردنی زۆر وڵاتان، زۆر جار ترس و بەرتیل و پوولێ بە ئاوادان هەیە. بەڵام دەنگدانی

نهێنی و دانانی ڕێگای چاوەدێری لە وڵاتانی پێشکەوتوو هەلی بۆ کاری ئەوتۆ کەم کردووەتەوە. لە زۆر وڵات بۆ پوول خەرج کردن لەمپەر گەلێك لە بەرچاو گیراوە. ڕێگەگەلی چالاکی هەڵبژاردن لەگەڵ پێشکەوتنی کەرەستەکانی پێشکەوتن دیارە گۆڕاوە. پێشتر لایەنگران و پاڵێوراوان بە شێوەی ڕاستەوخۆ و بۆ هاندانی خەڵکی لە دەرکی ماڵانیان دەدا یان لە شوێنە گشتییەکاندا هەڵاڵەیان بۆ بەرنامەکانیان دەکرد. ئەمڕۆکە تەلەفزیۆن دەورێکی گرینگ لە چالاکی هەڵبژاردندا دەبینێ. سەرهەڵدانی ئاڵۆزی لە چالاکی هەڵبژاردندا شتێکی ئاساییە, گەرچی ڕادەی لە وڵاتانی پێشکەوتوو دابەزیوە. لە هەڵبژاردنی وڵاتانی وەك هێند و ئامریکای لاتین بە گشتی ژمارەیەك دەکوژرێن و بریندار دەبن. کاری چاوەدێریی نەتەوەیی, یان نێونەتەوەیی بۆ دەستەبەر کردنی ڕاست و دروستی هەڵبژاردن و پێشگیری لە ئاڵۆزی ڕوو دەدا. لە هەڵبژاردنی ڕووسیا دوای ڕووخانی یەکیەتی سۆڤیەت و لە ئەفریقای باشوور دوای ئاپارتاید، سازمانی نەتەوە یەکگرتووەکان و وڵاتانی ئەورووپا هەر بەم مەبەستە کاری چاوەدێریان بەڕێوە برد. دەربارەی خەرج کردنی پووڵ و پارەی قورس لە چالاکی هەڵبژاردندا, بەکار هێنانی چاوەدێری و کۆنترۆڵ کارێکی ئاسان نییە. پووڵ و پارەی فراوان و دەست پێ ڕاگەیشتن بە ڕاگەیینە گشتییەکان، زۆر جار دەبێتە هۆی نابەرابەری حیزب و پاڵێوراوەکان لە چالاکی هەڵبژاردندا, چالاکی هەڵبژاردن لە ئاستی گەلیدا، هەڵاڵە کردن لە ڕاگەیێنەرەکان، داکوتانی پۆستر و سەفری هەڵبژاردن، پووڵ و پارەی زۆر دەبات. هەوڵدان بۆ کۆنترۆڵی خەرجی هەڵبژاردن لە وڵاتانی وەك ئەمریکا و ئینگلستاندا کارێکی بێهوودەیە. لە دەیەی ١٩٥٠ بە دواوە دەوڵەت هەوڵی داوە بۆ دابین کردنی پووڵ و پارەی هەڵبژاردن کار بکات. ئەم شێوەیە ئێستاکە لە هەڵبژاردنی سەرۆك کۆماریدا لە ئەمریکا و کانادا بەڕێوە دەچێت.

لە چالاکی هەڵبژاردندا زۆر جار پەیام و دروشمەکان لە بەر هاندانی خەڵك زۆر سادە و ساکار دەنووسرێن. هەرچی دروشمەکان کورتتر و ڕوونتر بن، ڕەنگە تێگەیشتنیان لە لایەن خەڵکی ڕەشۆکییەوە زیاتر بێ. سەرەڕای ئەمانەش ڕاگەیەندراوی هەڵبژاردنی ڕێك و پێك و ڕاڤەکراو لە لایەن پاڵێوراوانەوە بڵاو دەبێتەوە. کەڵك وەرگرتن

لـــه وتاربیـــژی زۆر بـــاوه. بـــەم تازەگیانـــه وت و وێـــژی راگەیـــەنراو و هـــەر وەهـــا شـــەڕە قســـەی تەلـــەفزیۆنی بـــرەوی پەیـــدا کـــردووه. لـــه دیـــموکراسیگەلی ئـــەمڕۆدا، دروشـــمی ئـــابووری وەك سـەرهەڵدانی نرخـی زیـاد کـردن، دابـەزینی نرخـی ئاوسـان، پاراسـتنی کـار بـه تـەواوی و... هتـد لـه چـالاکی هەڵبژاردنـدا زۆر گـەوره کراونەتـەوه. لـه هەنـدێ ولاتـان ماوەیـەکی دیـاریکراو بـۆ هەڵاڵـەکردن بـه پـاڵێوراوان لـه رادیـۆ و تەلـەفزیۆن دراوه. لـه هەنـدێ ولات پاڵێوراوان دەتـوانن بـه پێـی وەزعـی مـاڵی و پـووڵی خۆیـان، کـاتی بلاوکردنـەوەی پروپاگەنـده بـۆ خۆیـان بکـڕن. هاوبیـری لـه چـالاکی هەڵبژاردنـدا بـه تایبـەت لـه ئـەمریکا زۆر بـاوه، «خەباتی سەلبی»یش هـەر وەهـا لـه چـالاکی هەڵبـژاردن زۆر لـه بەرچـاو دەگیـرێ. مەبەسـت له خەباتی مەنفـی، زەق کردنـەوەی لایەنـه خراپـەکانی رکابـەره لـه بـاتی پێـداگرتن لـه سـەر لایەنـه چـاکەکانیەنی. هـەر وەهـا کـەلك وەرگـرتن لـه ئاکـامی بیـروڕا وەرگرتنـەکان لـه چـالاکی هەڵبژاردنـدا زۆر بـاو بـووه. بـه رای زۆر خـاوەنڕا، چـالاکی هەڵبـژاردن لـه زۆر ولاتـان «دە ئەمریکێ» واتا ئامریکایی دەکرێ.

## ٥-٨. چاوەدێریی هەڵبژاردن

چـاوەدێریی سـەر هەڵبـژاردن بـه مەبەسـتی دەسـتەبەر کردنـی راسـت و دروسـتی هەڵبـژاردن، لـه هـەموو دیـموکراسییەکاندا مـاوه. چـاوەدێری بـه گشـتی لـه لایـەن کاربەدەسـتانی نێوخـۆوە بـەڕێوه دەچـێ، بـەڵام بـەم دواییانـه چـاوەدێریی نێونەتـەوەیی پـەرەی گرتـووه. لـه پێشـدا رێکخـراوەی نادەوڵـەتی لـه کاروبـاری چـاوەدێریی نێونەتـەوەیی کاریـان کـرد، بـەڵام لـه دەیـەی ١٩٩٠وه رێکخـراوەی ولاتـانی ئـەمریکی، نەتـەوه یـەکگرتووەکان لـەم سـۆرخەوه دەسـتیان بـه چـالاکی کـردووه. چـاوەدێریی نێونەتـەوەیی بـه تایبـەت سـەبارەت بـەو هەڵبژاردنانـه بـەڕێوه چـوو کـه سـەبارەت بـه چارەنووسـی نەتـەوەیی ولاتـانی نـاوبراو کاریگـەر بـووه. سـازمانگەلی نێونەتـەوەیی نادەوڵـەتی وەك: یەکیـەتی نێـوان پارلـەمانان، گروپـی مـافـی مرۆڤـی نەتـەوەیی، حیزبـه سوسیالیسـتەکان، رێکخـراوەی نێونەتـەوەیی حیزبـه دیـموکرات مەسـیحیەکان و... هتـد لـه شـوێنی جـۆراو جـۆر کـاری چـاوەدێریان کـردووه. ئـەم

جۆره ڕێكخراوانانـه لـه فـێر كردنـی چـۆنیەتی چـاوەدێریی هەڵبژاردنـه ناوچـەییەكان, هـەر وەها فـێركردنی شـتی سیاسـی و مـەدەنی بـەوان دەوریـان بینیـوه. بـوونی ڕێكخـراوه نێونەتەوەییـەكان بە گشتی ڕەوایی بە هەڵبژاردن دەبەخشێ و تا ڕادەیێك ڕاستی و دروستی دەپارێزێ.

ڕێكخراوگـەلی نـاوبراو بـە گشـتی لـە سـەر دەورەی هەڵبـژاردن چـاوەدێری دەكـەن. یـەكێك لەمانە چاوەدێری بە سەر چـالاكی هەڵبژارنـدا لـەم بابەتـەوه دەكـا كـە ئایـا هـەموو حیزبـەكان لـە ئیمكانـاتی مـادی وەك یـەك بەهرەمەنـدن. دووەم: چـاوەدێری بـە سـەر وەرگـرتنی دەنـگ و ژماردنی بـە مەبەسـتی كۆنتـرۆڵی ڕاسـتیی هەڵبـژاردن، سـێیەم: چـاوەدێری لـە سـەر شـێوەی كردار و بـەڕێوەبردنی ئاكـامی هەڵبـژاردن لـە سـووڕی دەسـەڵاتی نێـوان حیزبـەكان. لـە دەیـەی ١٩٨٠وە چـاوەدێری نێونەتـەوەیی لـە سـەر هەڵبـژاردنی فـیلیپیـن ١٩٨٦, پانامـا سـاڵی ١٩٨٩، نیكـاراگوا ١٩٩٠ و كامبۆدیـا لـە سـاڵی ١٩٩٣دا لـە گرینگتـریان بـوون. نەتـەوه یـەكگرتوەكان لـە دسامبـری ١٩٩١ دا بەشـێكی بـە نـاوی بەشـی یارمـەتی هەڵبـژاردن كـردەوه كـە لـە سـاڵی یەكـەمی تێكۆشـانیدا بـە ٢٠ داواكـاری بـۆ چـاوەدێریی هەڵبـژاردن وەڵامی ئەرێنی دایەوه.

## ٥-٩. ناساندن و هەڵبژاردنی پاڵێوراوان

حیزبـە سیاسـییەكان لـە ڕەوەنـدێكی ئـاڵۆزدا دەربـارەی ئـەو كەسـانەی كـە وەك پـاڵێوراوی بەربـژاری ئـەوان دیـاری دەكـرێ، بڕیـار دەدەن. دوای ئەمـە، كاربەدەسـتانی بەڕێوبـەر و بەرپرسـی هەڵبـژاردن كەسـانی نـاوبراو وەك پـاڵێوراوی خـاوەن تایبەتـمەندی بـۆ هەڵبـژاردنی چاوەڕوانكراو تەئید دەكەن.

بە گشـتی ژمـارەی پـاڵێوراوانی هەڵبـژاردن بـە پێـی هەڵبـژاردن زۆره و بـەم پێیـە توانـایی و ئیمكـان و هـۆگری بـە نەناسـیاوی ئـەوان لـە خوێـدا یـەكێك لـە بنـەماكانی فەرهـەنگی سیاسیی دیـموكراتیكه. لـە سیسـتەمی داخـراودا كاربەدەسـتان بـۆ تـاقمێكی بچـوك تەسـك دەكرێنـەوه و خـەڵكیش تـەنیا بـە ناسـینی ژمـارەیێكی كـەم لـە حـەوزەی ژیـانی سیاسـی خۆیانـدا خۆودەكـەن. وەرگـرتنی پـاڵێوراوانی هەڵبـژاردن لـە دیـموكراسیگەلدا بـە دوو شێوەی ئەساسی جێبەجێ دەبێ.

**١- له ولاتانێ كه سیستهمی باوی ههڵبژاردن له گوین مهجلیسی عهوامی ئینگلستانه، واته سیستهمی ههڵبژاردنی یهك ئهندامی بهكار دێت، رهوشی «داخوازی» باوه. له خودی ئینگلستاندا كهسانێك كه گهرهكیانه بهشداربن له ههڵبژاردنی مهجلیسدا، بۆ ئهندامهتی دهبێ له ئیدارهی ههڵبژاردنی ناوچهی دیاریكراوی خۆیانهوه نامهی پشت راستكردنهوهی پالێوراوی رهسمی وهر بگرن و نێو و نیشان و كاری خۆیان لهوێدا بنووسن. دوایه ئهو نامهیه دهبێ له لایهن یهكێك له دهنگدهرانی ئهو بازنهیه به ناوی «پێشنیاز كار» و یهكێكی دیكه به ناوی «پشتیوان» و ههشت دهنگدهری دیكه به ناوی «وهرگر» ئیمزا بكرێ. دوایه نامهی ناوبراو دهدرێته بهرپرسایهتیی ههڵبژاردن و لهگهڵیا برێك پووڵ وهك ((وهدیعه)) دائهنرێ. ئهم پووڵه ئهگهر پالێوراوی ناوبراو كهمتر له ٥ له ١٠٠ دهنگهكانی بازنهی ههڵبژاردن وهدهست بێنی دهخرێنه خهزنهی دهوڵهتهوه. دوای ئهم رێگایانه نێوی پالێوراو له پێرستی ناوهكان و له سهر بهرگهی ههڵبژاردن دهنووسرێ. تا ساڵی ١٩٦٩ یاسای ههڵبژاردنی ئینگلستان نووسینی شتومهكی حیزبی پالێوراوان له بهرگهكانی ههڵبژاردنیدا قهدهغه كردبوو و ههر حیزب دهبوایه بۆ خۆی له حهوزهی ههڵبژاردنی دیاریكراودا پهیوهندیی خۆی لهگهڵ پالێوراوهكه هه‌لاڵه بكات. بهڵام له ساڵی ١٩٦٩ به دواوه لهگهڵ گۆڕینی رێ و شوێنهكانی ههڵبژاردن ههر پالێوراوێك دهتوانێ پهیوهندیهكانی حیزبی خۆی دهربخات بهو شهرتهی له ٦ وشه زیاتر نهبێ.**

**له ئاكامدا پالێوراوانی گهوره حیزبهكان پهیوهندیی حیزبی خۆیان له بهرگهی ههڵبژاردندا چاپ دهكهن. سیستهمی پالێوراوی ئهوتۆ له كانادا و نیوزیلاندا باوه.**

**٢- له زۆربهی دیموكراسییهكاندا رهوشی نۆینهرایهتیی رێژهیی به نووسینی ناوی پالێوراو له سیستهمی حیزبیدا باوه. لهم رهوشهدا ههر بازنهیهكی ههڵبژاردن ژمارهیهك، له ئهندامانی مهجلیسی نوێنهران بهربژار دهكات و لیستهی پالێوراوانی ههر حیزب بۆ ئهو بازنهیه له ههڵبژاردندا بهیان دهكرێت. لهم جۆره سیستمگهلهدا زۆر جار كۆمیتهی بهڕێوهبهری حیزبی ناوبراو، سیستهمی پالێوراوان بۆ بازنهی جیاجیا دروست دهكات و بۆ**

پەسەند کردن، بۆ لای بەرپرسانی هەڵبژاردنی دەنێرێ. ئەم کاربەدەستانە، لە شایستەیی یاسایی پاڵێوراوانی هەڵبژاردن بۆ ئەندامەتی مەجلیسی یاسادانان دەکۆڵنەوە.

شێوەی باو بۆ ناساندنی پاڵێوراوانی هەڵبژاردن لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، تاقانەیە. لەو ولاتەدا لە ڕێگای هەڵبژاردنی سەرەتایی پاڵێوراوان (primary)، پاڵێوراوانی هەڵبژاردن لە لایەن دەنگ دەرانەوە لە هەڵبژاردنێکدا کە لە ژێر چاوەدێری دەوڵەتدایە، وەردەگیرێن. هەر پاڵێوراوێك کە لە باری یاساییەوە خاوەنی دۆخی هەڵبژاردن و پاڵێوراوی حیزبێکی تایبەتی بێ، داخوازییێك بۆ وەرگرتنی پاڵێوراوی خۆی دەداتە دەستی کاربەدەستانی بەرپرسی هەڵبژاردنەوە. ئەم داخوازە بە پێی یاسا دەبێ بە ئیمزای ژمارەییێك لە دەنگدەران بگات. دواتر کاربەدەستانی بەرپرس پاڵێوراوانی هەر حیزب بۆ هەر پلەییێك لە بەرگەی هەڵبژاردندا چاپ دەکەن. دەنگدەران لە ژێر چاوەدێریی دەوڵەتدا حەزی خۆیان بۆ هەر پاڵێوراوێك و هەر پلەییێك دیاری دەکەن.

کاربەدەستانی هەڵبژاردن ئەو کەسانەی کە زیاترین دەنگیان بۆ پلەکان وەدەست هێناوە وەك پاڵێوراوی رەسمیی حیزبی ناوبراو دەست نیشان دەکەن. دواتر ناوی پاڵێوراوان و پەیوەندیی حیزبیی ئەوان لە کاغەزدا بۆ هەڵبژاردنی گشتی دەنووسن. لە هەڵبژاردنی گشتیدا، دەنگدەران لە نێوان پاڵێوراوە بەربژارەکاندا یەکیان بۆ پلەی دیاریکراو، هەڵدەبژێرن. بەم جۆرە بە گشتی دیاری کردنی پاڵێوراوی هەڵبژاردن خۆی لە ڕێگای هەڵبژادنێکی بەراییەوە جێبەجێ دەکرێ کە لە ژێر چاوەدێریی کاربەدەستانی دەوڵەتی دایە.

لە دیموکراسیگەلی تردا، حیزبە سیاسییەکان پاڵێوراوی خۆیان بە شێوەی نایاسایی , واتە بێ پرس و دەست تێوەردانی رەسمیی حکوومەت دیاری دەکەن. ڕەوەندی دانپێدانانی یاسای پاڵێوراوان لە خوێدا بە پێی ئەم شێوە نایاسایی یا سیاسییەی دەست نیشان کردنی پاڵێوراو لە لایەن حیزبەوەیە. شێوەی هەڵبژاردنی پاڵێوراوان لە وڵات و حیزبی جۆراوجۆردا جیاوازی هەیە. ئەم هەڵبژاردنە لە ئاستی گەلی، یان ناوچەو گەڕەکدا جێبەجێ دەکرێ. بۆیە ڕادەی ناوەندخوازی حیزبی دیاریکراو لە شێوەی هەڵبژاردنی پاڵێوراودا کاریگەرە. بەم حاڵەیشەوە باوترین شێوەی هەڵبژاردنی پاڵێوراوان یەکیان، هەڵبژاردن لە لایەن

کاربەدەستانی حیزبی لە ئاستی بازنەی هەڵبژاردنی ژێر چاوەدێری کاربەدەستان لە ئاستی گەلی یان ناوچەیی دایە و دووەمیان هەڵبژاردن لە لایەن کاربەدەستانی حیزبی دوای هاوبیری لەگەڵ کاربەدەستانی ناوچەیی دایە. لە حیزبگەلی هەندێ وڵاتدا ڕێبەرانی سەرەوەی حیزب دەتوانن پاڵێوراوانی بەربژاری ناوچەیی وەلا نێن. جاری واش هەیە ڕێبەرانی حیزب دەتوانن کەسانێك وەك پاڵێوراو بە کاربەدەستانی باڵای حیزب پێشنیار بکەن. ڕادەی بەشداریی ئەندامانی گشتی حیزب لە هەڵبژاردنی بەربژاردندا دەوری خۆی هەیە. لە هەندێ وڵاتی وەك ئیسرائیلدا ڕێبەرانی حیزب گشت پاڵێوراوان بۆ پلەی لە بەر چاوگیراو دیاری دەکەن و هەر وەها ریزی ناویان لە پێرستی پاڵێوراواندا دیاری دەکەن.

وەك دیتمان لە هەندێ دیموکراسیی وەك ئەمریکا، لە هەڵبژاردنی سەرەتاییدا هەموو ئەو کەسانەی کە بۆ دەنگدان ناویان نووسیوە لە باری یاساییەوە مافی خۆیانە لە نێو پاڵێوراواندا بەربژاری حیزبی خۆیان دیاری بکەن. گەرچی ڕادەی دەنگدەرانی هەڵبژاردنی سەرەتایی بە گشتی نیوەی ئەو ڕادەیەیە کە لە هەڵبژاردنی گشتیدا دەنگ دەدەن، بەم حاڵێشەوە پاڵێوراوانی دوو حیزب نەك لەلایەن ڕێبەری حیزب بەڵکو لە لایەن سەدان هەزار دەنگدەرەوە هەڵدەبژێردرێن. بەشداری لە هەڵبژاردنی سەرەتاییدا هیچ جۆرە بەرپرسایەتییەك بۆ دەنگ دان سەبارەت بە حیزبی دیاریکراو, یان پشتیوانی لە پاڵێوراوەکانی لە هەڵبژاردنی گشتیدا دروست ناکات، لە ئینگلستاندا پاڵێوراوانی هەڵبژاردن لە لایەن کۆمیتەی ناوچەیی لە ناوچەکەدا دیاری دەکرێت. لە ئاڵماندا ئەندامانی ناوچەیی حیزب لە هەر ناوچەدا بە پێی دەنگی پاڵێوراوانی بەربژار هەڵدەبژێرێن.

## ٥-١٠. بیروڕای گشتی

هەڵبژاردن لە دیموکراسی ئەمڕۆییدا، لە ڕاستیدا گرینگترین کەرەسەی دەنگدانەوەی بیروڕای گشتی و داخوازی و بەرژەوەندیی خەڵکە. بۆیە لە کۆتایی ئەم باسەدا بە کورتی دەربارەی بیروڕای گشتی دەدوێم. بیروڕای گشتی بریتییە لە بۆچوون، بایەخگەل و بیروڕای گشتیی خەڵکی. لە دیموکراسیدا ئەم گریمانە لە بەر چاو دەگیرێ کە بیروڕای گشتی بە شێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لەسەر بڕیاری سیاسی

کاریگـــەرە. لـــە زۆر وڵاتـــان لـــە شـــێوەی ناســـینی بیـــــرورای گشـــتی، بـــەڕێوەبردنی رفرانـــدۆم و سەرەنـــجدان بـــە بیـــــروباوەڕی گشـــتی ســـەبارەت بـــە دۆزی جۆراوجـــۆر، لـــە بـــاربردنی منداڵـــەوە بگرە تا خواردنەوەی ئـــارەق کـــەڵکی لـــێ وەردەگیـــرێ. لـــە وڵاتـــانی ئـــەورووپی، خـــەڵك ســـەبارەت بـــە ئەندامـــەتی دەوڵـــەتی خۆیـــان لـــە یەکیـــەتی ئـــەورووپا دەنگیـــان دا و بیـــــروباوەڕی خۆیـــان دەربـــڕی. لـــە ئـــەفریقای باشـــووریدا ســـەرەنجدان بـــە بیـــــروباوەڕی گشـــتی ســـەبارەت بـــە لـــە نێـــوبردنی سیســـتەمی ئاپارتایـــد یـــەکێك لـــە هۆیـــەکانی هـــەنگاونانی بـــەرەو دیـــــموکراسی جێبـــەجێ کـــرد. بـــەم حاڵێشـــەوە تـــەنیا هەنـــدێ مەســـەلەی گـــرینگ دەکـــرێ لـــە رێگـــای سەرەنـــجدان بـــە بیـــــروباوەڕی گشـــتییەوە رێگایـــان بـــۆ بدۆزیتـــەوە. شـــێوەی ناســـیاوی دەنگـــی بیـــروڕای گشـــتی, هـــەمان سیســـتەمی نوێنەرایەتییـــە کـــە یـــەکێك لـــە کۆڵەکـــە بنەڕەتییـــەکانی دیـــــموکراسی پێـــك دێـــنێ. بـــەم حاڵەیشـــەوە دەبـــێ رەهەنـــدی رەســـــمی و نارەســـــمیی جۆربـــەجۆر بۆ زانیاریی بـــەردەوامی نوێنـــەرانی خـــەڵك لـــە بیـــــروڕای گشـــتی لـــە بەردەســـتدا بـــێ، گەرچـــی ناشـــتوانن نـــــموونەیێکی تۆکمـــە لـــە بیـــــروڕای گشـــتی دیـــار بـــخەن. یـــەکێکی دیکـــە لـــە رەهەنـــدەکانی دەنگدانـــەوەی بیـــــروڕای گشـــتی وەك دیتمـــان، دەســـتەکانی خـــاوەن بەشـــە کـــە لـــە زۆربـــەی دیـــــموکراسییەکاندا کاربەدەســـتانی گشـــتی لـــە کەشـــی بیـــــری کۆمـــەڵگا و زۆر دۆزی تایبـــەتی دیکـــە لـــە باجـــەوە تـــا ژینگـــە ئاگاداریـــان دەکـــەن. بـــەم حاڵەیشـــەوە دەســـتە خـــاوەن بەشـــەکان بـــە گشـــتی کاردانـــەوەی بیـــــری بەشـــێکی کۆمـــەڵگان و بـــۆ کاردانـــەوەی بیـــــروڕای گشـــتی تـــەواو نیـــــن. هەرچـــی کـــەل و پـــەلی دەســـتەی رێکخـــراوەی بەرژەوەنـــد بـــۆ توێـــژی جۆربـــەجۆری کۆمـــەڵگا زیـــاتر بـــێ, دەنگدانـــەوەی بیـــــروڕای گشـــتی زیـــاتر کاریگـــەر دەبـــێ. گەرچـــی لەوانەیـــە هیچـــکام لـــەم رەهەندانـــە بـــە تـــەنێ بـــۆ دەرخســـتنی بیـــــروڕای گشـــتی تـــەواو نـــەبن. بـــەڵام هـــەموویان پێکـــەوە دەتـــوانن لـــە ســـۆنگەی جیـــاوازەوە بیـــــروڕای گشـــتی بـــڵاو بکەنەوە. یەکێك لەو دۆزانەی کە لـــە باســـی بیـــــروڕای گشـــتیدا بـــەرز دەبێتـــەوە ئـــەم شـــتەیە کـــە خەڵك بـــە گشـــتی تـــا چ رادەیـــەك ســـەبارەت بـــە مەســـەلە گشـــتییەکان زانیـــاری وەدەســـت دێـــنن. دیارە خـــەڵك بـــە گشـــتی ســـەبارەت بـــە دۆزی گشـــتی چـــون یـــەك زانیـــاری و هـــۆگری لـــە خۆیـــان نیشان نادەن.

کاتێک هەواڵ و زانیاری گشتی سەبارەت بە دۆزیکی تایبەت بەربەست بێت، بیرورای گشتی بۆ ئەم دۆزە نایێتە ئاراوە. چێ بوونی بیری گشتی پێویستی بە پەیوەندی و دان و گرتنی زانیارییەوە هەیە. سەرەڕای ئەمەش بیرورای گشتی سەبارەت بە دۆزێکی تایبەت کاتێک چێ دەبێ کە لەسەریەک، لە جەرگەی خۆیەوە بێ، رێک و پێک بێ و بەردەوام بێ. ئەم بیرانەی کە تاقمە کاربەدەستەکان لە رێگای جۆراوجۆرەوە دەیخەنە لەشی کۆمەڵگاوە و هەر وەها بیری راگوزار و نەپوخت کە بە شێوەی باو یەقەی بەشێک لە کۆمەڵ دەگرێ، حیسابی بیرورای گشتی لە سەر ناکرێ. بە بۆچوونی هەندێ لە خاوەن رایان «ئاڵۆز بوونی» زەینی گشتی پێویستی بە پێگەیشتنی بیرورای گشتییە. جگە لە هەواڵی پێگەیاندن و پەیوەندییەکان، رێکەوتی سیاسی وەک هەڵبژاردن، خەباتی هەڵبژاردن و... هتد، فێرکاری سیاسیی خەڵك دەبەنە سەر و بیرورای گشتی لە دەوری دۆزێکی تایبەت رێك دەخەن. هەر وەها پێك هاتنی بیرورای گشتی بە مانا راستەکەی، تەنیا لە پەنای مەسەلەی گشتی وەك هەستی ناسنامەی نەتەوەیی، شەڕ، ئاشتی و... هتد پێك دێت. هەرچی بەرەی دۆزەکان کورتتر بێ، بیرورای گشتیش بۆ بەشێکی تەسکتری کۆمەڵگا قەتیس ئەمێنێتەوە. بۆ وێنە لە دەوروبەری مەسەلەگەلی خوێندکاری زۆر جار بیرورای گشتی خوێندکاری چێ دەبێ، گەرچی لەوانەیە بەشگەلێکی تر لە کۆمەڵگا لەم بارەوە بیرورای خۆیان دەرببڕن.

هەنووکە رێگا, بۆ دەربڕینی بیرورای گشتی لە زۆر دیموکراسیدا پەرەی گرتووە. پێشینەی بیرورا خواستن بۆ تێکۆشانی جورج گالۆپ لە دەیەی ١٩٣٠ لە وڵاتی ئەمریکا دەگەڕێتەوە و بیرورای گشتی لە ئەمریکا زیاتر لە هەر وڵاتێك باوە. لە ئەمریکا سەبارەت بە هەر دۆزێکی سیاسی، بیروڕاخوازی بەر چاو ئەنجام دەدرێ. رێبەرانی سیاسیی بژاردەی خەڵك و نوێنەرانی پارلەمان گرینگی تایبەت بە بیرورای خەڵکی دەدەن، لە بەر ئەوەی گەر ئاکاریان لەوەی کە خەڵك چاوەڕوانی دەکەن مەودای بەرینتر بێتەوە، لەوانەیە دەرفەتی هەڵبژاردنی دیسانەوەیان کەم بێتەوە. بەم حاڵەیشەوە بۆچوونی جیاواز لە نێوان شارەزایاندا هەیە کە ئایا نوێنەرانی پارلەمان هەر یەکە و نوێنەری بیرورای ناوچەی لێوە هەڵبژێردراوەیە و دەبێ بیرورای گشتی ئەو ناوچەیە لە

بەرچاو بگرێ یان ئەوەی کە نوێنەری هەموو خەڵك و چاکەی گشتییە. ڕێبەرانی سیاسی زۆر جار بۆ پاساوی کارەکانیان، بە ئاکامی بیروڕاخوازی لەبار ئاماژە دەکەن. بیروڕاخوازی گشتی بە تایبەت لە دەورەی خەباتی هەڵبژاردندا گرینگی تایبەتی خۆی هەیە. ئاکامی ئەم جۆرە ڕاوەرگرتنانە لەسەر دەستنیشان کردنی باسەکان لە لایەن پاڵێوراوانەوە وەك هەڵوێست و بەرنامەی هەڵبژاردن کاریگەرە. لەم سۆنگەوە ڕێکخراوەکانی بیروڕاخوازی گشتی لە سەر دەستنیشان کردنی باسەکان کاریگەرن، لە بەر ئەوەی بە بژارکردنی پرسیاری تایبەت لە سەر ئاکامی بیروڕاخوازەکان کاریگەرن.

لە دیموکراسییەکاندا، زۆر جار خەڵك لە هەل و مەرجی ئاساییدا سەبارت بە مەسەلە سیاسییەکان زۆر بە هەستەوە هەڵسوکەوت ناکەن. بەڵام لە هەلومەرجی تایبەتی و قەیراناویدا، مەسەلە و بابەتگەلێ دێنە پێشەوە کە ژمارەیەکی زۆر خەڵك هانی بیرکردنەوە و تێکۆشانی سیاسی دەدەن. هەندێ مەسەلەش سەرنجی تاقمی تایبەت و پەیوەندیدار ڕادەکێشن. دوای ئەمەیە کە بیروڕای گشتی لە ڕێگای جۆرواجۆرەوە دێتە ئاراوە و دەور و گرینگی دەنوێنێ. لە ئەمریکا کاتی سەرۆك کۆمار بە پێی بیروڕای گشتی بەرێزترە، کۆنگرە زۆر جار لە بەرنامە یاساییەکانی زیاتر پشتیوانی دەکات. لە بەر ئەوەی نۆینەران لە ئاکامی نابەدڵی دژایەتی لەگەڵ سەرۆك کۆمار و...هتد دەترسن. بە پێچەوانەوە کاتێك ڕێزی سەرۆك کۆمار لە بیروڕای گشتیدا دادەبەزێ، نوێنەرانی کۆنگرەش زیاتر مەیلی دژایەتیان لەگەڵیدا هەیە, بەم جۆرە بیروڕا وەرگرتنەکان لە سەر پەیوەندیی سەرۆك کۆمارو کۆنگرە، کارتێکردنی بەرچاویان هەیە.

بە گشتی لە دیموکراسییەکاندا، بیروڕای گشتی لە ڕێگای دەنگدان، ڕفراندۆم، پەیوەندیی خەڵك لەگەڵ کاربەدەستان، تاقمگەلی خاوەن بەش، هەواڵنێرەکان، ئەندامەتی لە حیزب و گروپەکان و... هتد ڕەنگ دەداتەوە. بەم حاڵەیشەوە بە سەرنجدان بە ناسنامەی چینایەتیی کۆمەڵگای دیموکراتیك و نایەکرەنگی و جۆرواجۆری کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی تاقمەکان و جیاوازی بیروڕای نێوانیان، بەردەوام تاقمگەلێ پەیدا دەبن کە کاربەدەستان یا سیاسەتەکانی ئەوان بە بیروبۆچوونی خۆیان نازانن. سەرەڕای ئەمەش تەنیا

لــه دیـــموكراسیدایه كــه لانــی زۆری ڕەهەنــدەكان بــۆ دەربــڕینی بیـــروڕای گشــتی لــه ئارادایــه و هۆی هاوئاهەنگی له نێوان بیـروڕای گشتی و سیاسەتی گشتیدا دەگاتە لووتكه.

## ٥-١١. سەرنج دان به بیـروڕای گشتی

وەك پێشتـــر ئامـــاژەی پـــێ كــرا، یــەك لــه كەرەســـتە گرینگــەكانی دەرخســـتنی بیـــروڕای گشتی، رفراندۆمه. به سەرنجدان بــەوەی كــه رفرانــدۆم زۆر جــار گرینگــی تایبــەتی خــۆی هەیــه بــه جیاوازی باسـی دەكـەم. رفرانـدۆم، سـەرنجدان بـه بیـــروڕای گشــتی و هاوبیـــری لەگــەڵ هاوولاتیــان سـەبارەت بــه مەســـەله گشــتییەكانە. زۆر جـــار لـــه رفراندۆمەكانــدا، پرســـیارێك دێتــه گــۆڕێ و خەڵكی وەلامــی ئیجـابی, یــان ســەلبی پــێ دەدەنــەوە، بــەڕێوەبردنی رفرانــدۆم زۆر جــار لــه یاســای گشــتیدا لــه بەرچــاو گیـــراوە. وەك دیتمـــان، لـــه دیـــموكراسییەكانی ئـــەمڕۆدا پەنـــجه لـــه ســـەر نوێنەرایــەتی وەك كەرەســـەی بەرزكردنـــەوەی بیـــروڕای گشـــتی دانـــراوە. بـــەڵام جـــاری وایـــه كـــه وەرگـرتنی ڕەزا و پشــتیوانی ڕوون و راســتەوخۆی هاوولاتیــان لــه ڕێگــای ســەرنجدان بــه بیـــروڕایان بــۆ بڕیارێــك، دڵخـوازی ئــەوانی پێویســتە. لــه هەنــدێ ولات ســەرنجدان بــه بیـــروڕای گشــتی وەك ئامرازێـك بـۆ كۆنتـــرۆڵی فەسـادی نوێنــەران و سیاسەتـــمەدارانی بەربــژاری خــەڵكی لــه بەرچــاو گیـــراوە. یــەكێك لــه پەرەپێــدەرانی ســەرەكی رفرانــدۆم وودرو ویلســـۆن ســـەرۆك كۆمـــاری ئـــەمریكا له كاتی شەڕی جیهانی یەكەمــدا بــوو. دەڵـێن نیــوەی هــەموو ئــەو رفراندۆمانــەی كــه لــه ســەدەی بیستەمدا بــەڕێوە چــوونە و ژمارەیــان ســەری لــه هــەزار داوە، لــه ولاتــی سوویســـدا بــەڕێوە چــووە. بۆیه زۆر كـەس سوویســـیان بــه ولاتــی دیـــموكراسی راســتەوخۆ نــاودێر كــردووە. لــه هەنــدێ ولات لــه ئاســتی نەتەوەییـــدا هیچــكات رفرانــدۆم بــەڕێوە نەچــووە، بــۆ وێنــه لــه ولاتــه یــەكگرتووەكانی ئەمریكا، ژاپـۆن و هێنـد رفرانـدۆم كاتێــك بــەڕێوە دەچـێ كـه دەوڵــەت, یــان پارلـــەمان ســـەبارەت بــه دۆزێكــی تایبــەت، ســـەرنجدان بـــه بیـــروڕای گشـــتی بـــه پێویســـت بزانـــێ. لـــه هەنـــدێ ولاتـــان، چاكســازیی یاســای گشــتی دەبــێ لــه ڕێگــای رفراندۆمــەوە بــه پەســەندی گشــتی خــەڵك بگــات. رفراندۆمــەكان رەنگــه بــه هاوبیـــری یــان بــه پێویســت بــن. لــه جــۆری یەكەمــدا، ســەبارەت بــه مەسەلەیێكی تایبەت دەنــگ و بیـــروڕای گشــتی خــەڵك وەردەگــرن و لــه جــۆری دووەمــدا دەنــگ و بۆچــوونی خــەڵك حــوكمی یاســای هەیــه. رفرانــدۆمێ بــۆ پێویســـتی بــه پێــی برگــه، لەوانەیــه

**پێویستی بە وەدەست هێنانی زۆرینەی یان دوو لە سێی، یا سێ لە چواری دەنگەکان و یان زۆرینەی رەهای هەموو دانیشتوانی خاوەن دەنگ بێت.**

**لە هەندێ وڵاتی فیدراڵی وەك سوویس یان ئوستراليا هەم دەنگی زۆرینەی خەڵك و هەم دەنگی زۆرینە ویلایەتەکان بۆ پەسەندکردنی رفراندۆم پێویستە. بە گشتی کاتێك رفراندۆم وەگەڕ دەخرێ کە دەوڵەت, یان پارلەمان لە وەڵامی «ئەرێ»ی خەڵك بە پرسیاری ئەوان دڵنیا بێ, یان رێگاچارەی ئەو دۆزە لە لایەن کاربەدەستانی باڵاوە ئەستەم، یان هۆی ئاڵۆزیی نێوانیان بێت. «وەك رفراندۆم دەربارەی ئەندامەتی هەندێ وڵات لە یەکیەتی ئەوروپا» بە پێی نێوەرۆك سێ جۆر رفراندۆم لێك جوێ دەکرێتەوە. رفراندۆمێ سەبارەت بە شەرعی بوونی حکومەتان، رفراندۆمێ سەبارەت بە پاوانی حکومەتان و رفراندۆم سەبارەت بە مەسەلە ئەخلاقییەکان. رفراندۆمی جۆری یەکەم گرینگترین و درمترینیانە، زۆر جار دوای گۆڕانی حکوومەت و ئاڵ و گۆڕی شۆڕشگێڕانە، لە دارخستنی رفراندۆم بۆ شەرعیەتی حکوومەتی نوێ پێویستە. هەر وەها ئاڵ و گۆڕ لە یاسای ئەساسیدا، یاسای هەڵبژاردن، هێزی مەجلیسەکان، ماف و دەسەڵاتی پاشا و... هتد دەخرێنە رفراندۆمەوە دووهەم ئەو رفڕاندۆمانە بوون کە دوای شەڕی یەکەم بۆ دیاری کردنی سنوور و پاوانی هەندێ وڵات بەڕێوە چوو. مەسەلەی ئەخلاقی وەك تەڵاق، لە بار بردن و خواردنەوەی ئارەق زۆر جار دەخرێنە رفراندۆمەوە. جاری واش هەیە بۆ مەسەلەی وەك پێگەی هێزە ناڤوکییەکان، ئەندامەتی لە رێکخراوە نێونەتەوەییەکاندا و... سەرەنج دەدەنە بیروڕای خەڵکی. دیارە لە رژێمە نادیموکراتیکەکاندا لە رفراندۆم کەڵکی نابەجێ وەردەگرن و وەك کەرەسەیەك بۆ دابەستنی حکوومەتەکەیان کەڵکی لێ وەردەگرن.**

## جۆرەکانی دیموکراسی

بە پێی پێوانەی جیاواز، جۆرەکانی دیموکراسی دیاری دەکرێن. بەم پێیە کە ئامانجی سەرەکی حکومەتی دیموکراسی دابینکردنی ئازادیی تاك، چاکەی مەدەنی، یان بەرابەریی سیاسییە، بۆچوونی جیاواز لە دیموکراسی بەر دەست دەکەوێ کە لەوانەیە هەر یەکە پاڵ بە جۆرێك دیموکراسییەوە بدات. بۆ وێنە دیموکراسیی لیبراڵ، یان دیموکراسیی هاوبیری «بە مانا رۆسۆییەکەی»، هەروەها بەم پێیە کە ئایا بنەڕەتی دیموکراسی، حکومەتی زۆرینەیە یان حکومەتی یاسا، شێوەی دیموکراسی پێکەوە فەرق دەکا. بەم پێوانەیە کە خەڵك راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ لە حکومەت و سیاسەتدا بەشداری دەکەن باس لە دیموکراسیی راستەوخۆ و دیموکراسیی نوێنەرایەتی دەکرێ. هەر وەها بەم پێیە کە دیموکراسی بە دوای بەرابەریی سیاسیی تاك لە دەسەڵات دایە یان لە سەر بەرابەریی ئابووریش وەك بناغەیێك بۆ بەرابەریی سیاسی پێ داگرە، دیموکراسیی لیبراڵ و دیموکراسیی کۆمەڵایەتی لێك جیا دەکرێتەوە. دیموکراسیی کۆمەڵاتیش خۆی لکی لاوەکی وەك دیموکراسیی پیشەسازی و دیموکراسیی سنفی لێ دەبێتەوە.

بەم پێوانەش کە ئایا بناغەی دیموکراسیی نوێنەرایەتیی خەڵك لە ناوچەی جوغرافیایی جیاوازەوەیە، یان لە هاوپەیمانیی ئەتنیکی و ئایینی، لێرەدا دیموکراسیی ئەسڵی، لە دیموکراسیی فرە ئەتنێکی و ئەنجومەنی لێك جۆی دەکرێتەوە. هەر وەها تێکەڵ بوونی ئایدیۆلۆژیای دیکە وەك سوسیالیزم یان مەسیحی بوون لەگەڵ دیموکراسی، شێوەی تایبەت لە دیموکراسی دەڕسکێنێ.

جۆرەکانی دیموکراسی تا رادەیێك لەو پێش خستنەوە سەرچاوە دەگرێ کە دیموکراسییەکان گرنگی بە ئازادی، یان چاکەی مەدەنی دەدەن. دیموکراسیی لیبراڵ لە سەر پیشخستنی ئەندێشە و نرخی ئازادی بە رێژەی هەموو بایەخە سیاسیەکانی تر بونیات نراوە.

لەم جۆرە دیموکراسییەدا، ئازادی سەرتر لە بەرابەری، چاکەی مەدەنی، ئاسایش و... هتد دادەنرێ. لەم روانگەیەوە, دیموکراسی تا ئەوێ چاکە کە ئازادییەکانی تاك نەزەخسێنێ. بۆیە گەر حکومەتی دیموکراسی یارمەتی زاڵ بوونی بیری زۆرینە بدا, یان بە واتایێکی دیکە بۆ سەرەرۆیی بئاژوێ، دیارە ئازادی لە نێو دەچێ. دیموکراسیی لیبراڵ بەم مانایە، گەورە ئامانجی بیرمەندانی لیبراڵ و لیبراڵەکانە. بە رای ئەوان تەنانەت کەڵك وەرگرتنی خراپ لە ئازادی باشترە لە کەڵك وەرگرتنی خراپی دەسەڵات، هەر چۆنێکی بێ دەبێ ئازادی وەك بنەمایێك وەربگیرێ، گەرچی زەربە لە بایەخی وەك رێك و پێکی، بەرابەری و عەداڵەت بدات.

بیرمەندانی لیبراڵ پێیان وایە کە مرۆڤ تەنیا و خۆخوازە، واتە ناکۆمەڵایەتی و نامەدەنییە. بە پێی هاندەر و نیازی سروشتی دەکەوێتە شەڕ و کێشە لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا. لە بەر ئەوەی بگاتە ئاسایش و هێمینایەتی. بە واتایێکی دیکە دۆخی سروشتی, یان پێش مەدەنی مرۆڤ، دۆخێکی شەڕواییە. کۆمەڵ و دەوڵەت بە مەبەستی پارێزگاری لە دۆخی نابەدڵی ئەوتۆ پێك دێن. لەم راڤەدا کۆمەڵ رەسەن نییە بەڵکو بەرهەمی پەیمانێکە وەك شتێکی دەسکرد کە دابینکەری خێروبەرەکەتێکی جیاواز نییە کە خەڵك بیری لێ بکەنەوە. تەنیا شتێك کە وەك چاکەی گشتی جێگای باسە، ئاشتی و ئاسایشە. لە بەر ئەوەی ئاشتی و ئاسایش پێویستەی دواکەوتنی خێر و بێری تاکە لە لایان خەڵکەوەیە. بەم پێیە ناکرێ لە قازانجی کۆمەڵگا بە چەمکی ئەرێنێ و نەرێنێ, یان چاکەی مەدەنی لە ناسین و وریایی ئەو ئامانجە قسان بکرێ.

کۆمەڵ شتێکی سروشتی و لە پێشدا دارێژراو نییە و نرخ و شکۆی زیاتر لەوەی رەزا و پەیمان پێی بدات نییە. بۆیە باس کردن لە رۆح و زاتی کۆمەڵ وەك راستییێکی سەربەخۆ و بانتر لە تاك، شتێکی فێلاویە و رێگا بۆ سەرهەڵدانی ئایدیۆلۆژیای و سیستمگەلی سەرەڕۆ خۆش دەکات.

بەڵام ئەو بیریارانە کە لە چوارچێوەی سوننەتیی ژان ژاك رۆسۆدا بیر دەکەنەوە, بنەمای ئەسڵیی دیموکراسی لە چاکەی مەدەنی و هاوولاتیی بوون دا دەبینن کە پێویستەی ناسین و بەڕێوەبردنی خێری گشتییە. لەم روانگەی دیموکراسیدا تاك

هاوکـات حـاکم و بەڕێوەبـەرە, بۆیـە پێوسـتە لـە سـەر خێـر و سـەلاحی خـەڵکی ناسـیاوی هەبێ. حکوومـەتی هاووڵاتیـان لـە سـەر کۆمـەڵ لـە راسـتیدا حکوومەتـە بـە سـەر خۆیانـدا, بۆیە خێر و خۆشیی کۆمەڵ هـەمان خێـر و خۆشـی تاکـە. چـاکەی مـەدەنی دەبێتـە هـۆی ئـەوە کـە هاووڵاتیـان قازانـجی خۆیـان لـە قازانـجی کۆمەڵـدا بدۆزنـەوە. هاووڵاتیـانی راسـتەقینە ئەو کەسانەن کە لـە ژیـانی گشـتیدا دەوریـان هەیـە و تەنانـەت بـە زیـانی قازانـجی خۆیـان، خزمەتی خێری گشتی دەکەن. بـەم پێیـە چـاکەی مـەدەنی لەگـەڵ گـەڕان بـە شـوێن قازانـجی تایبەتی و تاقەکەسیدا ناتەبایـە. دەبـێ لـە هـەر شـتێك کـە ئـاڵۆزی دەخاتـە نێـوان قازانـجی خـەڵك و تایبـەتی تاکـەوە دوور کەوینـەوە. دیـارە بارهێنـانی چـاکەی مـەدەنی لـە تاکـدا پێویسـتی بـە فـێرکاریی ئـەخلاقی بـە لەونێکـە کـە رۆسـۆ لـە کتـێبی «ئمیـل»دا باسـی کردووە.

بـەم شـێوەیە هەنـدێ لـە رەخنـەگرانی هاوچـەرخ رەخنـە گـرتن لـە تـاکخوازی, یـان پرەنسـیپی تـاکی لیبـراڵی وەك بنـەمای دیـموکراسی، لـە سـۆنگەی چـاکە و خێـری کۆمـەڵ وەك بنـەماییێکی رەسـەنی بـە راسـتی باسـیان کـردووە. «کەسـانی نێـو بـەدەرەوەی ئـەم تاقمـە السدرمەك ئینتایر و مایکل و التزرن».

بـە بۆچـوونی ئـەم رەخنەگرانـە لیبـرالیزم و پرەنسـیپی تـاکی ئـەو، پرەنسـیپی هـاووڵاتیی دیـموکراتیك و چـاکەی مـەدەنی لـە نێـو دەبـات و لـە بەرانبـەردا ناتوانـێ بنەمایـەکی راسـتەقینە بـۆ کۆمـەڵگای دیـموکراتیك دەسـتەبەر بکـات. بـە واتـاییێکی دیکـە لـە دیـموکراسیگەلی ئیمڕۆژیـدا پێویسـتەی فـێرکاریی چـاکە و ئاکـاری هاووڵاتیـەتی پشـتگوێ خراوە. لە ئاکامـدا ئـەو کەسـانە کـە تـەنیا لـە بیـری ژیـانی تایبـەتی خۆیـان، لـە بەرانبـەر دەسـەڵاتی دەوڵـەتی بۆرۆکراتیـك و سـەرمایەداری هاوچـەرخدا تـەریك و بـێ دەسـەڵات کەوتوونـە و هـەر چەشـنە هەسـتێکی جـەماوەرییان لـە دەسـت داوە. بـەم جـۆرە ئـازادیی لیبـراڵی بـۆ خۆپەرەسـتی و لـە کۆتاییـدا بـۆ ملکەچـی ئـاژاوە. تاکگـەلی ئـازاد بـەم مانایـە کۆیلـەی شـادمانن کـە تەریکانـە خزمەتـەکانی دەوڵـەتی ئاسـایش وەردەگـرن. لـە ئاکامـدا هەسـتی هاوبەشـی و ئـازادیی ئـەرێنی و دەسـەڵات لـە سـەرخۆ و هاووڵاتیگـەری بـە تـەواوی ئاسـەواری نـەماوە. لـە بـەر ئـەوەی کـەس لـە بیـری خێـر و خۆشـی گشـتیدا نییـە و هـەموو

تەنیا لە بیری ئامانجی تایبەتی خۆیاندان. بەم شێوەیە لە باری ئەخلاقییەوە ژیانی لیبرالێخوازانە هلۆڵ بووە و لە نێوان شوێن کەوتنی ژیانی تایبەتی و راگرتن و پاراستنی ئەخلاقی گشتیدا کێشەی بۆ پێك هاتووە. بۆیە لیبرالیزم لە دواپلەدا تاك و تەریك و تەنیا و داماو دەکات. تەنیا رێگای نەجاتی لەم قرگەیە، زیندوکردنەوەی دەسەڵاتی ئەخلاقیی کۆمەڵگایە وەکو زاتێکی جیاواز لە تاك.

## ٦-١. دیموکراسیی راستەوخۆ

دیموکراسی بەمانای حکوومەتی خەڵك، لە بەرانبەر دیموکراسی بە مانای حکوومەتی نوێنەرانیی خەڵك، دیموکراسیی راستەوخۆ, یان بە هێزی پێ دەڵێن. هەندێ لە نووسەران دیموکراسیی راستەوخۆ، نەك بە شتێك لە جۆرەکانی دیموکراسی، بەڵکو بە جەوهەری دیموکراسی لە قەڵەم دەدەن و جۆرەکانی تری لادەرانە هەڵدەسەنگێنن. بە واتایەکی دیکە دیموکراسیی راستەوخۆ بە دیموکراسی بە مانای تەواوی وشە دەناسن، لە حاڵێکدا دیموکراسی بە چەمکی حکوومەتی نوێنەرانی خەڵك, یان تاقمگەلی بژاردە وەك دیموکراسیی مەجازی و رووکەش ناودەبەن. دیموکراسیی بە مانای حکوومەتی نوێنەرایەتیی خەڵك، سەروەر بوونی خەڵك لە یاسای ئەساسیدا بە نوێنەرانی هەڵبژاردەی خەڵك سپێردراوە کە بە کردەوە حکوومەت و بەڕێوەبردنی کاروباری کۆمەڵگا بە دەستەوە دەگرن و لە بەرانبەر خەڵکدا وەك بەرپرس دەناسرێن. کە وابوو خەڵك تەنیا بە چەمکێکی تەریکانە خاوەنی حوکمن، واتە بەسەر کاری کاربەدەستانی هەڵبژاردەدا تەنیا چاوەدێری دەکەن و بە هەڵبژاردن, یان هەڵنەبژاردنیان سەبارەت بە کارامەیی ئەوان داوەری دەکەن. بە بۆچوونی لایەنگرانی دیموکراسیی راستەوخۆ یان هاوبیری، دیموکراسی بە مانای نوێنەرایەتی دیموکراسیی لاواز یان لانی کەمە. لە ئەتینا لە سەدەی پێنجەمی پێش زایین هەموو هاوولاتیان هەر حەفت یان دە رۆژ لە مەجلیسدا کۆ دەبوونەوە و سەبارەت بە کاروباری جۆراوجۆر تەگبیریان دەکرد. ئەو دیموکراسیی

راستەوخۆیە کە دەڕزا و دەبوو بە حکوومەتی بێ هەوسار، ڕێکخراوەی ئوکلۆکراسی٥, یان حکوومەتی بەڕەڵایان پێ دەوت.

هەر وەها کە جۆری ڕزاوی مۆنارشی و ئارسیتوکراسی بە ریز تیرانی و ئۆلیگارشی پێ دەوترا. دیارە لە ئەتینادا تەنیا هاووڵاتیان, واتە پیاوانی ئازاد کە سەر بە تیرەی ئەتینا بوون، خاوەنی مافی حکوومەت بوون و ئەمانەش نزیکەی یەك لە پێنجی دانیشتوانی شاریان پێك دێنا. ژنان و کۆیلەکان لە ژمارەی هاووڵاتیان بەدەر بوون. وەك دیتمان شێوەی جۆربەجۆری ئەم جۆرە دیموکراسییە لە سەدەکانی دواتردا لە وڵاتانی ئیتالیا، ئاڵمان، سویس و هۆڵەندا سەریان هەڵدا. زۆر لە بیرمەندانی سەدەی هەژدە پێیان وابوو کە دیموکراسیی راستەوخۆ تەنیا لە دەوڵەت شاری گچکەدا دروست دەکرێ و وڵاتی بەرین و پڕ حەشیمەت بە شێوەی دیموکراسیی راستەوخۆ بەڕێوە ناچێ. هەر بەم پێیە چەمکی نوێنەرایەتی بە مەبەستی پاراستنی بیری دیموکراسی لە کۆمەڵگای گەورەدا هاتە ئاوارە کە بە شێوەی دیموکراسیی راستەوخۆ بەڕێوە نەدەبران. بە بۆچوونی بیرمەندانی سەدەی نوێ دیموکراسیی راستەوخۆ نەك ناموەکین، بەڵکو نادڵخوازیش بوو، لە بەر ئەوەی بە رای وان بۆ لای زێدەرۆیی و ملهوڕی دەئاژوا. هەندێ لە دامەزرێنەرانی کۆماری ئەمریکا, دیموکراسیی راستەوخۆ بە شێوەی ئەتینایییان بە هۆکاری ناهێمنی و کێشە و کێبەرکێ لە قەڵەم دەدا و نوێنەرایەتیان وەك ئامرازێکی پاڵافتنی دیموکراسی لە کەسانی فریودەر و زێدەرۆ بە پێویست دەزانی. بە رای ئەوان لە ڕێگای ڕێکخراوەی نوێنەرایەتیان ئەوانەی خاوەنی چاکەی مەدەنی لە نێو خەڵکی دان لە پلە و پایە حکوومەتییەکان دادەنرێن. لە دیموکراسیی هاوچەرخدا گەرچی شێوە دیموکراسیی راستەوخۆ وەکو رفراندۆم و سەرنج دان بە بیری گشتی ئاسەواری هەر ماوە و تەنانەت زەمینەی بۆ «تیلە دیموکراسی٦» واتە بەشداریی راستەوخۆ لە باس و

---

5-ochlocracy
6-Oqel,cracy

6- Teledemocraey بەشداری راستەوخۆی خەڵك لە تەویر کردندا لە ڕێگای ئەو کەلوپەلانەوە کە تکنۆلۆژی پەیوەندی هێناویەتە ئاراوە، تیلەدیموکراسی پێ دەڵێن. دەنگ دان لەماڵەوە لە ڕێگای کۆمپیوترەوە، کەڵك وەرگرتن لە بانکە زانیارییەکان لە زەمینەی سیاسەتدا، بەرنامەکانی هەڵبژاردن و هەر وەها تێکەڵ بوون لە باسە راستەوخۆکان لە ڕێگای پۆستی ئیلکترۆنیەوە و ئاڵوگۆڕی بیروار لە تیلە کۆنفرانسەوە، هەلومەرجی ئەم و دیموکراسیەی پێکهێناوە. بەم جۆرە لە وانەیە دیموکراسی راستەوخۆ لە سێبەری تکنۆلۆژی نۆژەندا واژووڕ کاتەوە.

ڕەوەندەکانی تەویر کردن لە ڕێگای تکنۆڵۆژیی کۆمپیوتەر و پەیوەندی لە ڕێگای دوورەوە پێک هاتووە. بەڵام هێما زۆر کەس لە خاوەنرایانی هاوچەرخ پێیان وایە دیموکراسیی ڕاستەوخۆ دەبێتە هۆی خەڵک فریوی و حکوومەتی کەسانی نابەجێ. سەمۆئل هانتینگتۆن زانای سیاسی ئەمریکایی پێی وایە گەر خەڵک زیاتر لە پێویست هەڵسووڕ و خوازیازی هاوکاریی ڕاستەوخۆ لە سیاسەتدا بن، باری دیموکراسی هێندە قورس دەکات کە پێی پێ دێنیتەوە. لە بەرانبەردا لایەنگرانی دیموکراسیی ڕاستەوخۆ دەڵێن کە ئەم جۆرە دیموکراسییە تەنیا لە ڕێگای بەشدارییەوە چێ نابێ، بەڵکو پێویستی بە بارهێنان و فێرکردنی سیاسیی هاووڵاتی بە مەبەستی چێ کردنی چاکەی مەدەنی لەواندایە. کەوا بوو تەنیا بە پەروەدەی مەدەنی و ئەخلاقیی هاووڵاتیگەل، دیموکراسیی ڕاستەوخۆ پێک دێ. مەبەست لە هاووڵاتیگەل لەم ڕاڤەیەدا تەنیا کەسانی هەڵسوور لە سنووری ژیاندا نییە، بەڵکو کەسانی زانا و هەڵسووڕی سنووری گشتییە، کە خاوەنی زانیاری و ئیرادەی سەر بە چاکەی گشتین.

بەناوبانگترین فەیلەسووفی سیاسیی مۆدێرن کە پارێزگاری لە دیموکراسیی ڕاستەوخۆ کرد، ژان ژاک ڕۆسۆ بوو. وەك دیتمان بە ڕای ڕۆسۆ تەنیا دەسەڵاتێك شەرعیەتی هەیە کە هاووڵاتیان ئازاد بهێڵێتەوە و هیچ کۆت و زنجیرێکیان بەسەردا نەسەپێنێت. لە دیموکراسیی ڕاستەوخۆدا, هاووڵاتیان لە دانانی ئەو یاسایەدا کە خۆیان دواتر پەیڕەوی دەکەن بەشداریی ڕاستەوخۆیان هەیە، واتە پەیڕەو کردنی ئیرادەی خۆیان و بەم جۆرە ئازادی و ئیلتزام و پەیڕەو کردن یەکسان دەبن. ئازادیی ڕاستەقینە لای ڕۆسۆ پەیڕەوی کردن لە یاسایەکە کە ئێمە خۆمان پەسەندمان کردووە. بە بۆچوونی زانایانی دیکە دیموکراسیی ڕاستەوخۆ دامەزراو لەسەر ئازادیی ئەرێنی، واتە ئازادی لە کردەوە و هەڵبژاردنایە. لە کاتێکدا دیموکراسیی دامەزراو لە سەر نوێنەرایەتی، ئازادی لە دەست تێوەردانی ئیرادەی خۆتێکوتانی خەڵکانی دیکە پەروەردە دەبێ تا ئازادیی ئەرێنی. تۆماس جفرسون وەك دیتمان ئەویش لە پارێزەرانی دیموکراسیی ڕاستەوخۆ و بەشدارانە بوو و دەیگوت ئەگەر بە مرۆڤ باوەڕ نەکرێ کە بە سەر خۆیاندا حکوومەت بکەن، چۆن دەکرێ باوەڕیان پێ بکەن کە بەسەر خەڵکانی تردا حکوومەت بکەن. بە ڕای

ئەو تەنیا دیموکراسیی راستەوخۆ لەمپەری سەرهەڵدانی حکوومەتی ستەمکار و زۆرەملییە. هەندێ نووسەری هاوچەرخ باس لە سەر هەڵدانی «دیموکراسیی بەشداری» دەکەن کە توخمی دیموکراسیی راستەوخۆ لەوێدا زۆرترە. دیموکراسیی بەشداری جۆرێك دیموکراسییە کە هاوولاتیان، بە بەراورد لەگەڵ جۆرەکانی تری دیموکراسیدا لە رەوەندەکانی بریاداندا دەوری زیاتر دەبینن. دیموکراسیی بەشداری لە راستیدا تێکەڵاوێکە لە دیموکراسی دامەزراو لە سەر نوێنەرایەتی و دیموکراسیی راستەوخۆ بە مانا کۆنەکەی. بەم پێیە لە دیموکراسیی بەشداریدا ژمارەی هەڵبژاردن و ژمارەی پلەکانی هەڵبژاردن زیاترە. هەندێ لە سەر ئەم رایەن کە دیموکراسیی ئەمریکی زۆرتر بەشدارییە تاکو دیموکراسیی ئەورووپایی. هەر وەها لە دیموکراسیی بەشداریدا، تێکۆشانی خەڵك لە کاروباری ناوچەییدا بەرچاوترە. لەم دیموکراسیەدا لە رفراندۆم زیاتر کەڵك وەردەگیرێ و هەروەها پووچ کردنەی نوێنەرایەتی، نوێنەرانی خەڵك زیاترە.

### ٦-٢. دیموکراسیی کۆمەڵایەتی

دیموکراسیی کۆمەڵایەتی جۆرێك دیموکراسییە کە لە سەر دابین کردنی کەل و پەلی ئاسایشی کۆمەڵایەتی و دروست کردنی دەوڵەتی ئاسایش و دابەش کردنی سامان لە کۆمەڵگا لە لایان دەوڵەتەوە پێ دادەگرێ. لایەنگرانی دیموکراسیی کۆمەڵایەتی شوێن ئەم هێڵە کەوتوونە تاکو پرەنسیپەکانی لیبرالیزم و حکوومەتی دامەزراو لە سەر پرەنسیپی نوێنەرایەتی و سەروەر بوونی خەڵك لەگەڵ پرەنسیپەکانی چاکسازیی کۆمەڵایەتی و عەدالەتی دابەش کردن تێکەڵ بکەن. بە واتایەکی دیکە دیموکراسیی کۆمەڵایەتی جۆرێك دیموکراسییە کە تا رادەیێك رۆحی سۆسیالیزمی تێدایە و بۆیە لە باری سیاسەتی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە لە ناوەڕاستی لیبرالیزم و سوسیالیزمدا جێگیر دەبێ. کەوا بوو دیموکراسیی کۆمەڵایەتی جەخت لە سەر بەرپرسایەتیی کۆمەڵایەتیی دەوڵەت دەکا گەرچی لە هەمان کاتدا پاراستنی سیستەمی سەرمایەداری بە جۆرێك هێمن دەکرێتەوە. هەندێ لە نووسەران ریشەی سەرەتایی دیموکراسیی

کۆمەڵایەتی لە بیروڕای ئیدوارد برنشتاین، مارکسیستی ئاوەڕدەرەوەی سەرەتای سەدەی بیست دەبیننەوە کە هەوڵی بۆ جێبەجێ کردنی ئامانجی سوسیالیستی دەدا، دیارە نە لە ڕێگای شۆڕشەوە، بەڵکو بە شێوەی پارلەمانی و چاکسازییەوە. ریشەیێکی تری بنەڕەتی دیموکراسیی کۆمەڵایەتی بۆ بیرۆکەکانی بزاڤی سۆسیالیستی فابیین لە «ئینگلستان» بە تایبەت کەسانێکی وەك اچ، جی وڵز، برناردشۆ و سیدنی وب دەگەڕێتەوە. دەوڵەتە ئاسایشخوازەکانی سەدەی بیست لە رۆژئاوا لە راستیدا لە سەر بناغەی ئەم بیر و ئامانجگەلە چێ کران. لە دوا نوێنەرانی دیموکراسیی کۆمەڵایەتی لە ئەمریکا بە تایبەت دەبێ ناوی جانراڵز و رونالددورکین، بێنین کە لایەنگری عەداڵەتی کۆمەڵایەتیی دابەشکار و بڵاوکردنەوەی عادڵانەی سامانن. ئەم لێکدانەوە نوێیە بۆ دیموکراسیی کۆمەڵایەتی لە کۆتایی سەدەی بیستدا لە بەرانبەر لێکدانەوەی نوێی لیبراڵ دیموکراسی لای کەسانی وەك فریدریك فون هایك فەیلەسووفی نەمسایی باو بووە کە دەست تێوەردانی دەوڵەتی لە ئابووری بۆ عەداڵەتی دابەشکاری بە پێچەوانەی بناغەکانی لیبراڵیزم زانیوە و بە شتێکی بێ ئاکامی داناوە. دیارە وەك ئاماژەی پێکرا، سوسیال دیموکراسی لە ئەساسدا سوننەتێکی ئەورووپی بووە و لێکدانەوەی ئامریکایی بۆ ئەمە, زیاتر لە تاکخوازی و لیبراڵیزمی ئەمریکاییدا کاریگەر بووە تا لە سوسیالیزمدا. لایەنگرانی دیموکراسیی کۆمەڵایەتی هەر چۆنێکی بێ دیفاع لە مافی کۆمەڵایەتیی دەکەن و پێیان وایە کە ئەم مافە لە سەدەی بیستدا بە سەرنج کەوتووە: لە سەدەی نۆزدە لە سەر مافی سیاسی، لە سەدەی هەژدە لە سەر مافی مەدەنی و لە سەدەی هەڤدە لە سەر مافی سروشتی پێداگیرا بوو. ئەمەش لە خۆیدا لێکدانەوەیەکی لیبراڵییە بۆ دیموکراسیی کۆمەڵایەتی، لە بەر ئەوەی لە باتی پێداگرتن لە سەر چەمکی سوسیالیستی بەرپرسایەتیی دەوڵەت، لە سەر چەمکی مافی تاك پێداگرە. هەندێ نووسەر لەمەش زیاتر چوونەتە پێش و کەڵك وەرگرتن لە مافی کۆمەڵایەتییان بە شەرتی هاووڵاتی بوون بە مانای دروستی وشە لە دیموکراسیی ئەمڕۆییدا لە قەڵەم داوە. لە دواییدا ئەو شتەی کە ئەمڕۆ لە دیموکراسیی کۆمەڵایەتی وە چنگ دەکەوێ، شتێك زێدەتر لە دیفاع لە دەوڵەتی

خێرومەنـد نییـە. دابیـــن کردنـی کـاری تـەواو، پـێ راگەیشتـــن، کەمکردنـەوەی کـەلێنی چـینایەتی لـە ڕێگـای سیاسـەتی ماڵییـەوە، زیـادکردنی خـەرجی گشـتی و... هتـد، گرینگتـــرین کارەکـانی دەوڵـەتی خێـــرومەند بـووە. دیـــموکراسیی کۆمەڵایـەتی شـتێك زیاتر لە دیـموکراسیی لیبـراڵ و بەم حاڵەش شتێك کەمتـر لە سۆسیالیزمە.

### ٦-٣. دیـموکراسیی پیشەسازی

مەبەست لـە دیـــموکراسیی پیشەسـازی، بـە کارهێنـانی بناغـەکانی دیـــموکراسی بـۆ کاروژیانی چینی کرێکارە. لـەم ڕوانگەیـەوە دیـــموکراسی تـەنیا بـۆ ژیـانی سیاسـی تەسـك ناکرێتەوە، بەڵکو دەکرێ لە ژیانی ئابووریشـدا بـەکار بێـت و بـە تایبـەت دەبـێ لـە ژیـانی کۆمەڵایـەتی و ئـابووریی کرێکارانـدا کـە زۆرینـەی خـەڵك دروسـت دەکـەن بـەکار بێـت. هەنـدێ لـە نووسـەران مەبەسـت لـە دیـــموکراسیی پیشەسـازی تـەنیا بەشـداریی کرێکـاران لـە تەویرگـەلی نابنەڕەتیـدا دەزانـن، لـە بۆچـوونی ئـەوتۆدا دواکونتـــڕۆڵی بونیادەکان لە بەردەسـتی چـینی بەڕێوبـەر، یـان سـەرمایەداردا دەمێنێتـەوە. هەنـدێکی تـر دیـــموکراسیی پێشەسـازی تـەنیا بـە شـێوە هاوکـاریی کرێکـاران لـە کونتـــڕۆڵی ئیـدارەی بونیـادە ئابووریەکانـدا مسـۆگەر دەبیـنن. لـە ڕوانگەیـەکی دیکـەوە دیـــموکراسیی پیشەسـازی بـە مانـای بەشـداری کریکـاران لـە دارایـی بەشـێك لـە سـامانی شیـرکەتەکاندایە، بە جۆرێك لانی کەم بـە قـەد خـاوەن بەشـانی گچـکە دەسـتیان بـە سـەر بەڕیوبەرایەتیـدا بـڕوات. هـەر وەهـا هەنـدێکی تـر لـە لایـەنگرانی دیـــموکراسیی پیشەسـازی، خوازیـاری بەڕێوەبـەری هاوبەشـی دەسـتەی بەڕێوەبـەر و نوێنـەرانی کریکـارانن. لـە دواییـدا هەنـدێك تـا ئـەو جێگایـە دێنـە پێشـێ کـە دیـــموکراسیی پیشەسازی لەگەڵ کونتـــڕۆڵی چـینی کرێکـار بـە سـەر هـەموو سیسـتەمی ئابووریـدا بـە یەکێك دەزانن.

لەسەریەك هەموو قوتابخانەكانی دیموكراسیی پیشەسازی خوازیاری جۆرێك شێوە كۆنترۆلی كرێكاران بە سەر كارگا و كارخانەكاندان. هەندێ نووسەر لە باتی «دیموكراسیی پیشەسازی» واتای دیموكراسیی ئابووری، بەڕێوبەری كرێكاری و خودموختاریی ئەوانیان بەرزكردووەتەوە.

دیموكراسیی پیشەسازی لە ئەدەبیاتی سیاسیدا بە گشتی پەیوەندی بە ئانارشیزم و سەندیكالیزمەوە بووە. گەرچی هەموو قوتابخانەكانی سوسیالیستیش بە جۆرێك خوازیاری دیموكراسیی پیشەسازی بوونە. بۆیە نووسەران ریشەی هزری دیموكراسیی پیشەسازی چوون یەك بۆ پرودۆن، بیرمەندی ئانارشیت و كارل ماركس دەگێڕنەوە. بەشێك لە ئامانجە سەرەكییەكانی دیموكراسیی پیشەسازی، لە دیموكراسییەكانی ئەمڕۆدا مسۆگەر بوونە. لە نێوان ولاَتە سوسیالیستەكانی پێشوودا، تەنیا یۆگسلاڤیا، دیموكراسیی پیشەسازی بە رێك و پێكی بەرێوە دەبرد. جۆرێك لە دیموكراسیی پیشەسازی ئەمڕۆكە لە ولاَتانی ئەڵمان، ئسپانیا و ئیتالیادا باوە. زۆر لە خاوەنرایان دیموكراسیی پیشەسازی وەك كەرەستەیێك بۆ هێدی كردنەوەی دیموكراسیی سیاسی لە سیستمگەلی سەرمایەداریدا دەزانن و ئەوەش بە رێگای ئاشتبوونەوەی نێوان دیموكراسی و سوسیالیزم دەزانن.

### ٦-٤. دیموكراسیی مەسیحی

حیزبە دیموكرات مەسیحییەكان, فەلسەفەی سیاسی و بنەمای فیكری خۆیان لەمەڕ دیموكراسی لە سەرچاوەكانی مەسیحییەتەوە هەڵدەگۆزن. بزاڤی دیموكراسیی مەسیحی بریتی لە حیزب، رێكخراوە سازیی، گروپی سیاسیی رەنگاوڕەنگ بە تایبەت لە ولاَتانی كاتۆلێك مەزهەبی ئەورووپی، سەرچاوەی دیموكراسیی مەسیحی بۆ دژكردەوەی كلێسەی كاتۆلیك بۆ دۆزی دنیای نوێ و بۆچوونی لیبرالیزم، ناسیونالیزم و سوسیالیزم دەگەڕێتەوە. لیبرالگەل،

سوسیالیستەکان و ریفۆرمخوازانی ئەورووپا لە سەرەتای سەدەی نۆزدەوە کڵێسەی کاتولیکیان بە لەمپەری گەشەی کۆمەڵایەتی و یەکیەتیی نیشتمانی لە قەڵەم دەدا, لە ئاکامدا کڵێسەی کاتولیك لە دۆخی دژ کردەوە لە سەر بۆچوونی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەستی بە تیۆری دارشتن لەم بارەوە کرد. فاتیکان پێشتر لە سەدەی نۆزدەدا بە شێوەی رەسمی بنەماکانی لیبرالیزم و دیموکراسی مەحکووم کردبوو. هەندێ لە قەشەکانی کاتولیك کە لە هەل و مەرجی کۆمەڵایەتیی نوێدا خوازیاری مافی مەدەنی، ئازادیی سیاسی و جیایی دین لە سیاست بوون لە لایەن کڵێسیەی کاتۆلیکەوە مەحکووم کران و هەندێ دامەزراوەی دیموکراتیکیی کاتولیکی هەڵوەشێنرانەوە. لە فەرەنسە تەنیا لە دەیەی ١٩٣٠دا بوو کە بە دامەزرانی «حیزبی دیموکراتیکی خەڵکی» دیموکراسیی مەسیحی شێوەییێکی رێکخراوەیی نوێی بە خۆیەوە گرت. ئەم حیزبە دوای شەری دووەمی جیهانی وەك «بزاڤی کۆمارخوازی خەڵکی» هاتە ناسین و تا ١٩٦٩ لە تێکۆشان بوو. لە ئەڵمان، کاتولیکەکان بە دژ کردەوە لەگەڵ چاکسازیی فەرهەنگی ئوتوفۆنی بیسمارك «حیزبی ناوەند»یان پێکهێنا کە ئەم حیزبە رەخنەی لە بۆچوونی لیبرالیزم و سوسیالیزم پێکەوە دەگرت و داخوازی ئەوە بوو بە شێوەی مەسیحی لەگەڵ دۆزی چینی خوارەوە بجوولێنەوە. لە ئیتالیا لەگەڵ ئەوەی دەستیان بە سەر مڵك و ماڵی کلێسە لە ساڵی ١٨٧١دا گرت, پاپ بۆ نێو فاتیکان پاشەکشێی کرد و بەشداری کاتولیکگەلی لە سیاسەتدا قەدەغە کرد. دواتر فاتیکان دیموکراسی وەك جۆرێك حکوومەتی شەرعی وەرگرت، بەڵام لە سەر بە رەسمی ناسینی دینی کاتولیك بۆ وڵات پێداگر بوو. فاتیکان, هاوکات رەخنەی لە لیبرالیزم و سوسیالیزم دەگرت و لە مافی کرێکاران بۆ دروست کردنی سەندیکای مەسیحی پارێزگاری دەکرد. کڵێسەی کاتولیك لە ساڵی ١٩١٨ قەدەغە بوونی بەشداریی کاتولیك لە سیاسەتدا هەڵوەشاندەوە و دوای ئەمە «حیزبی خەڵکی»یان دامەزراند.

**هەر ئەم حیزبە سەرەتای گیرسانی حیزبی دیموکرات مەسیحیی ئیتالیا لە پاش شەڕی جیهانی دووەم بوو و تا ساڵی ١٩٩٤ حیزبی دەستڕۆیشتوو بە حیساب ئەهات. لەو ساڵەدا ڕێبەرایەتیی حیزب بە هۆی تێوەگلان لە فەسادی ماڵیی بەربڵاودا، حیزبیان هەڵوەشاندەوە و لە باتی، «حیزبی خەڵکی»یان دامەزراند.**

**گرینگترین تیوریسیەنی دیموکراسیی مەسیحی ژاك مارتین (١٨٨٢-١٩٧٣) فەیلەسووفی کاتۆلیکی فەڕانسەوی بوو. ئەو لە کتێبی جۆربەجۆری خۆیدا وەك مەسیحییەت و دیموکراسی (١٩٤٢) ئیستدلالی دەکرد کە فرەخوازی ئازادی و «کەسایەتیی» مرۆڤ لە سەر بنەماکانی مەسیحی بوون بونیادنراوە. چەمکی «کەسایەتیی» مرۆڤ لە مەسیحییەتدا بە لای ژاك مارتینەوە لە چەمکی «تاك بوونی» لیبرالیستەکان هێژاترە. بە رای مارتین, دیموکراسی بۆ دابین کردنی کەسایەتی و ئازادیی مرۆڤ گونجاوترین سیستمە. لە دیموکراسیدا, فرەخوازیی دینی پارێزراو دەمێنێ و دەوڵەت سەبارەت بە ئایین و دینە جۆربەجۆرکان نەرمی دەنوێنێ. بە رای مارتین گەرچی دارایی تایبەتی، مافێکی سروشتییە، بەڵام ئەمە بەرپرسایەتی کۆمەڵایەتیشی دورست کردووە. لەسەریەك دیموکراسیی مەسیحی و حیزبەکانی دیموکراتیك مەسیحی لە فەڕەنسە، ئاڵمان، ئیتالیا، ئوتریش، بلژیك، هۆڵەند و وڵاتانی دیکە بە مەبەستی پشتیوانی لە بۆچوونی کۆمەڵایەتیی کلێسەی کاتولیك سەریان هەڵدا و بە تین وەرگرتن لە بنەماکانی مەسیحییەت کەوتنە پارێزگاری لە دیموکراسی، مافی مرۆڤ، ئاسایشی کۆمەڵایەتی ئابووریی تێکەڵ لە سەر بناغەی سەرمایەداری و یەکیەتی ئەورووپا. دوای ساڵی ١٩٨٩ حیزبی دیموکرات مەسیحی لە روسیا و وڵاتانی تری ئەورووپای رۆژهەڵات پێیان گرت و دامەزران. حیزبە دیموکرات مەسیحییەکان خاوەنی ڕێکخراوەیەکی نێونەتەوەییشن و گەورەترین گروپی یەکگرتووی حیزبی پارلەمانی ئەورووپا لە ئیسترازبورگ پێك دێنن. حیزبی دیموکرات مەسیحییەکان لەسەریەك هێور و میانەڕەو بە حیساب دێن و بەگژی گروپی پەڕگیری راست و چەپدا، دەچنەوە.**

## ٦-٥. دیـموکراسی لە سەر بنەمای نوێنەرایەتیی بەرژەوەندی و گروپگەل

هەنـدێ لـە لایـەنگرانی دیـموکراسی لـە بـاتی هەڵبـژاردنی نوێنـەران لـە ناوچـەی جوغرافـیی دیـاریکراو، پاریزگـاری لـە هەڵبـژاردنی نوێنـەریی گـروپ و رێکخـراوی کۆمەڵایەتی, دەکەن. بـە رای ئـەوان گرینگتـرین بەرژەوەنـدی, هـەر وەهـا گروپگـەل دەبـێ لـە رەوەنـدی تـەویر کردنـی برِیـاردانی گشـتیدا لـە بەرچـاو بگـرێن. سوسیالیسـتە سـەندیکاییەکان خوازیـاری نوێنەرایەتیـەکی ئـەوتۆ بـوون و لـە دەیـەکانی سـەرەتای سەدەی بیستدا دەیانویست چاکسـازی لـە دیـموکراسیدا پێـك بێـنن. بـە رای ئـەوان دەبـێ لـە پـەنای پارلـەمانێکی پێکهـاتوو لـە نوێنـەرانی ناوچـە جوغرافـییە جیاوازەکـان، پارلـەمانێکی تـری پێکهـاتوو لـە نوێنـەری سـەندیکاکان، گروپـەکان، سـازمانەکان، پیشەسـازی و... هتـد پێـك بێـت. پارلـەمانی یەکـەم پێویسـتە تـەنیا بپەرژێتـە سـەر دۆزە هاوبەشـەکانی هـەموو تـاقم و سـازیەکان، بـەڵام پارلـەمانی سـەندیکایی دەبـێ دەربـارەی بەرژەوەنـدی هـەر یـەك لـەوان و باشتـرین رێگـای دابیـن کردنـی ئـەو بەرژەوەندیانـە هاوبیـری بکـات. پرەنسـیپی نوێنەرایـەتی بەشـە جۆراوجۆرەکـانی کۆمـەڵ لـە دیـموکراسیی چەند نەتەوەیی ، سەندیکایی و ئەنـجومەنیدا باڵا دەستە.

### ٦-٥-١. دیـموکراسیی چەند نەتەوەیی

دیـموکراسیی چـەند نەتـەوەیی، جۆرێـك سیسـتەمی سیاسـییە کـە تیایـدا چـەند گروپی نەتـەوەیی - ئـایینی - فەرهـەنگی لـە دەسـەڵاتی سیاسـیدا بەشـدارن و لـە برِیـاری سیاسیدا دەوریان هەیە. چوار تایبەتـمەندیی ئەم دیـموکراسیانە بریتیـن لە:

١- بەشداریی نوێنەرانی نەتەوە سەرەکییەکان لە رەوەندی برِیار وەرگرتندا.

٢- ئەو قەومانە دەبێ خاوەنی خودموختارییێکی بەربڵاوی ناوخۆیی بن

٣- دابەش بوونی دەسەڵات بە پێی گرینگی ئەو گروپانە.

٤- هێزی ((ڤیتۆ)) بۆ گروپە کەمینەکان

بەشداریی نوێنەرانی نەتەوەکان لە ئیدارەی حکوومەت, بە تایبەت لە بەشی بڕیار وەرگرتن و بەڕێوەبردندا لەوانەیە شکڵی سازمانیی جۆراوجۆر بە خۆیەوە بگرێ، یەکێك لەم دەوڵەتە یەکگرتووانە لە دیموکراسیی پارلەمانیدا کە زۆر ناسراوە بلژیکە. شکڵی نوێنەرایەتیی گروپگەلی قەومی و ئایینی بەهێز لە کابینەی حکومەتدا وەك ئەو شێوەیە لە کابینەی حکومەتی حەوت کەسی سوویسدا بەرچاو دەکەوێ. لە سیستەمی بەڕێوبردنی لوبناندا، پلەکانی بالاّ وەك سەرۆك کۆماری لە نێوان تاقمە نەتەوەیی و مەزهەبییەکاندا دابەش دەکرێت کە تیایدا کۆمار بۆ مەسیحیی مارۆنی، سەرۆك وەزیری بۆ موسڵمانانی سوننی، سەرۆکی پارلەمان بۆ موسڵمانی شیعە لە بەر چاوەگیرێ. سەرەڕای ئەمە دابەش کردنی دەسەلاّت لە نێوان هێزە قەومییەکاندا لە سیستەمی پارلەمانیدا لە سیستەمی سەرۆکایەتی ئاسانترە لە بەر ئەوەی لە سیستەمی سەرۆکایەتیدا هێزی بەڕێوەبەر بە گشتی لە دەستی کەسێك دایە کە سەرۆك کۆمارە.

سەبارەت بە خودموختاریی نێوخۆیی، هێزی بڕیار وەرگرتن سەبارەت بە دۆزەکانی هەر نەتەوەییێ بە هەمان قەوم دەسپێردرێ. ئەگەر ئەو گروپە نەتەوەییانە لە ناوچەی جوغرافیای تایبەتدا جێگیر بووبن، خودموختاریی نێوخۆیی وەك سیستەمی فیدراڵی دێتە بەرچاو، بۆ وێنە زۆربەی فەڕانسەزوانانی کانادا لە پارێزگای «کێبك»دا نیشتەجێن. ئەگەر گروپە نەتەوەییەکان لە باری جوغرافییەوە تێکەڵ بن لەم حاڵەدا خودموختاری تایبەتمەندیی ناجوغرافی بە خۆیەوە دەگرێ. بۆ وێنە بە پێی یاسای گشتی ١٩٦٠ قیبرس، دوو پارلەمانی جیاواز بۆ یۆنانییەکان و تورکەکان، دامەزراوە کە هەرکامیان لە توانایاندا هەیە لە کاروباری فەرهەنگی، ئایینی و فێرکاریدا یاسای تایبەت دەر بکەن.

مەبەست لە دابین کردنی هێز بە ڕێژەی گرینگایەتی گروپە نەتەوەییەکان بە گشتی ئەمەیە کە پلەکانی بەڕێوەبەرایەتیی پارلەمانی و دیوانی و هەر وەها خەرجی گشتی بە پێی حەشیمەت و گرینگی تاقمە نەتەوەییەکان دابەش بکرێت. باشترین

شـێوەی دابـین کردنـی نوێنەرایـەتی ئـەم گروپانـە لـە پارلەمانـدا هـەمان سیسـتەمی نوێنەرایـەتیی ڕێژەییـە. بـەڵام کاتـێ گروپـە نەتەوەییـەکان لـە ناوچـەییێکی جوغرافـی تایبەتـدا بـەکـۆ بـن، سیسـتەمی هەڵبـژاردنی زۆربایـەتی، لەگـەڵ سـنووری هەڵبـژاردنی یـەك ئەندامیـدا نزیـك بـە ئامانـجە. شـێوەییێکی تـر بـەم جۆرەیـە کـە ژمـارەییێکی دیاریکراو لە کورسیەکانی پارلەمان بۆ هەر کام لە نەتەوەکان لەبەر چاو دەگیرێ.

مافـی «ڤیتۆ» لە لایـەن کەمینەکانـەوە بـە گشـتی بـۆ بابـەتی گـرینگ و سـەرومالّی وەك بڕیـاردان سـەبارەت بـە سیسـتەمی هەڵبـژاردن، سیسـتەمی شـارەدارییەکان و یاسـادانان لـە بابـەتی فـێرکاری و فەرهەنگیـدا کـورت دەکرێتـەوە. سـەرەڕای ئەمانـە مافـی ڤیتـۆ لـەم بـارەوە زۆر جـار بەشـێك لـە پێکهـاتنی زارەکـی نێـوان تاقمـە قەومییەکان لە یاسای گشتیدا ڕەنگ ناداتەوە.

### ٦-٥-٢. دیموکراسیی سەندیکایی

دیموکراسیی سەندیکایی, جۆرە دیموکراسییەکە تیایدا ئەنجومەنەکانی نوێنەری بەرژەوەندی و گروپی دیاریکراو کە بە شێوەی ڕەسمی لە لایەن دەوڵەتەوە وەرگیراوە و لە بەشەکانی هاوبیری، سیاسەتدانان و بەڕێوە بردنی سیاسیدا دەوریان هەیە.

دیموکراسیی سەندیکایی (کە دیارە دەبێ لە دەوڵەتی سەندیکالیست کە لایەنی ئابووریی دەوڵەتانی پاوانخواز و فاشیستی سەدەی بیستەمە جیابکرێتەوە) دوای شەڕی جیهانی دووەم لە ئەورووپا پێك هات. لەم دیموکراسییەدا، ئەنجومەنە بنەڕەتییەکان وەك سەندیکای کارمەندان، پیتۆڵی، کرێکاری و... هتد دەورێکی گرینگ لە سیاسەتدانانی دەوڵەتیدا دەبینن و لە بەرانبەردا پشتیوانی ئەندامانی خۆیان لەو سیاسەتانە و بە شێوەی ناڕاستەوخۆ لە دەوڵەت دەستەبەر دەکەن. لەم وڵاتانە لە پەنای پارلەمان بە مانا گشتییەکەیدا، جۆرێك پارلەمانی سەندیکاییش هەیە کە بە تایبەت لە زەمینەی سیاسەتگەلی ئابووریدا بڕیار دەدات. بە هەر حاڵ لەم دیموکراسییانەدا، هەموو ئەنجومەن و سازمانە کۆمەڵایەتییەکان خاوەنی گرینگی و قورسایی چون یەك نین. نموونەی دیموکراسیی سەندیکایی لە نەمسا و سوێد و هۆڵەندا هەن.

# پاساو رەخنەکانی دیموکراسی

داکۆکیکردن لە دیموکراسی بە گشتی لە روانگەی قوتابخانەی وەك لیبرالیزم، پراگماتیزم، پرەنسیپی خێر[7]، نسبیخوازی و ئاوەزخوازیەوە بووە کە لەوێ بە بەڵگەی جۆربەجۆری وەك دابین کردنی ئازدیی تاك، مافی سروشتی، مەسڵەحەتی تاك، بەرژەوەندیی کۆ، دابینکردنی سەقامگیریی سیاسی، دەستەبەر کردنی بەرەو پێش چوونی ئابووری و... هتد لە دیموکراسی دیفاعیان کردووە. لە بەرانبەردا، رەخنە لە دیموکراسی بە گشتی لە لایەن قوتابخانەی وەك، پارێزگارخوازی، هەڵکەوتووخوازی[8]، فاشیزم، بۆچوونی رۆمانتیك و نەزەرییەکانی سیاسیی ئایینییەوە بەکار هاتووە و لەوێ بە بەڵگەی وەك سەرکەوتنی نەفامی بە سەر کۆمەڵ، زۆرەملیی زۆربایەتی، کزبوونی ئاکاری کۆمەڵ، وەشانی پووچخوازی، سەرهەڵدانی کێ لەکێی کۆمەڵایەتی، زاڵبوونی هەست و سەلیقەی عەوامانە، لە نێو چوونی نا بەرابەریی سروشتی، یەکسانسازیی کۆمەڵایەتی، بالآدەستی سەرمایەداری، دیموکراسیان لۆمە کردووە.

## ٧-١. داکۆکیکردن لە دیموکراسی

پاساوی جۆراوجۆر بۆ داکۆکیکردن لە دیموکراسی لە ئارا دایە. خاڵی نەزەری وەرچەرخانی ئەم بەرنگاریانە جۆراوجۆرە و دەکرێ بە پێی ئەو خاڵە بەرجەستانە، ئەم بەرنگاری و پاساوانە پۆلێن بەندی بکرێن، دیارە بەرنگاری و پاساوی ئەوتۆ خاڵی هاوبەشیان هەیە و لە بیری سیاسیی بیرمەنداندا بە شێوەی تێکەڵ و پێکەڵ دەر دەکەوێ.

---

٧- اصالت فایده
٨- نخبه گرایي

### ٧-١-١. پاساوی دیموکراسی لە سەر ئەساسی بێ ئیمکانی و دەستهێنانی مەعریفەی یەقینی و حەتمی

هەندێ لە فەیلەسووفە کۆن و نوێیەکان وەك ئیستوارت میل، برتراند راسل و کارل پوپر لە چاوی مەعریفەتناسانەی پڕ دوودڵییەوە لە دیموکراسی بەرنگاریان کردووە. ئیستوارت میل پێی وا بوو کە زانست و مەعریفەت بە گشتی بەرهەمی کردەوەی کۆمەڵایەتی، هاوبیری و وتووێژە، ئەگینا راستی بە شێوەی بەرچاو٩، رەها و گشتی وەرناگیرێ. لە بەر ئەوەی، شك و نەبوونی یەقین و ناحەتمی بوون، پێشاندەری دۆخی ئینسانە و هەر مەعریفەتێك بەرهەمی تێکەلاوی کۆمەڵە، بۆیە دیموکراسی تەنیا سیستەمی عەقلانیی مومکینە. راسل و پوپر دەلیلیان دەهێنایەوە کە ناکرێت بە تەواوی و یەقینی رەهاوە لە سەر شتەکان مەعریفەت وەدەس خەین و حەتمیترین حوکمێك کە دەتوانین سەبارەت بە ئەسڵە زانستییەکان دەری بکەین ئەمەیە کە بڵێین تا ئێستا باتڵ نەبووەتەوە. بۆیە مەعریفەتی ئێمە سەرچاوەی لە توانایی ئێمە لە باتڵ کردنەوە دایە نەك لە ئاکامی سەلماندنی یەقینی و هەمیشەییدا.

بە رای پوپر «کۆمەڵی کراوە» ئاکامی بێ ئەملا و ئەولای «دنیای کراوە»یە، هەر وەها کە لە سنووری زانست و مەعریفەتدا کەرەسەی پێشکەوتنی ئێمە «باتڵ کردنەوە»یە، ئەم کەرەسەیە لە سنووری سیاسەت و کۆمەڵدا لە ئەستۆی «رەخنە»یە. کۆمەڵی کراوە، کۆمەڵێکی رەخنەوەرگرە، هەندێکی تر وتوویانە لە بەر ئەوەی هیچ پێوانەیەکی تر بۆ ناسینەوەی راستی لە ژیانی سیاسییدا نییە، تەنیا پێوانەی مومکین, ژماردنی دەنگی تاکەکان, یانی ژمارەیە.

### ٧-١-٢. حکوومەت بە سەر خۆدا بە جێترە لە حکوومەت بە سەر ئەوانی تردا

تۆمـــاس جفرســـۆن دەیـــوت گـــەر ئینســـانەکان وەك ئـــەوەی کـــە دژە دیـــموکراسییەکان باوەڕیان پێیـــەتی، نـــاتوانن بـــە ســـەر خۆیانـــدا حکوومـــەت بکـــەن، بـــە شـــێوەی «اولـــی» نـــاتوانن بەســـەر ئـــەوانی تـــردا حکوومـــەت بکـــەن. بۆیـــە حکوومـــەت بـــە ســـەرخۆ بەجێتـــرە و مومکینتـــرە تـــا حکوومـــەت بەســـەر ئـــەوانی تـــردا. وینســـتون چەرچـــیلیش دەیـــوت: دیـــموکراسی دوای حکوومەتـــەکانی تـــر، باشتـــرینە. بـــە واتـــاییێکی تـــر گـــەر پاســـاوێك بـــۆ حکوومەت هەیە لە پێشدا بۆ دیـموکراسییە، دواتر بۆ جۆرەکانی تری حکوومەت.

### ٧-١-٣. پاساوی دیـموکراسی بە پێی وەکیەکی سروشتیی مرۆڤـــ

گـــەر قـــەبوولّی کـــەین کـــە مرۆڤـــەکان بەرابـــەرن لەدایکبوونـــدا و لـــە ئاکامـــدا قـــەبوولّ بکەین کە هـــەمووان مافـــی بەرابـــەریان هەیـــە بـــۆ ئـــەوەی بەشـــداری لـــە حکوومـــەت بـــە ســـەر خۆیاندا بکـــەن. هـــەر وەهـــا بـــەو پێیـــەی کـــە مرۆڤـــەکان بـــە پێـــی حـــوکمی سروشـــت، ئـــازاد لـــە دایـــك بوونـــە، مافـــی خۆیانـــە ســـەبارەت بـــە وەرگـــرتنی دەســـەلاّتی سیاســـی، یـــان پـــەیڕەوی فەرمانـــەکانی، بـــە ئـــازادی دەنگـــی بـــۆ بـــدەن، یـــان لـــە دژی بوەســـتـــن. ئیســـتدلالی جەماعـــەتی پەیـــمانیی کۆمەلاّیـــەتی لـــە ســـەر ئاوەهـــا ژێربێژیەکـــە. بـــە رای ئـــەوان، ئـــازادی و بەرابـــەری دەســـپێکی مافـــە، مـــاف، دەســـپێکی پێکهـــاتن و رازی بـــوون پێویســـتی پەیـــمانیی کۆمەلاّیـــەتی بـــۆ وەرگـــرتنی دەســـەلاّتی حکوومەتـــە و حکوومـــەتێکی ئـــەوتۆ دیـــارە کـــە دیـموکراسییە.

**٧-١-٤. پاسـاوی دیـــموکراسی بـە پێـی بەرفـەرمانیی خـەلّك** لـەو یاسـاگەلەی کـە خۆیان پەسەنیان کـردووە. بـە رای رۆســۆ تـەنیا لـە سیستـەمی دیـــموکراسیدا، مرۆڤـەکان کـە ئـازاد لـە دایـك بوونـە، دەتـوانن لـە هـەمان کاتـدا کـە لـە حکوومـەت بـەرفرمانی دەکـەن، ئازادیی خۆیان بپـارێزن، لـە بـەر ئـەوەی لـە دیـــموکراسیدا مرۆڤـەکان فەرمانبـەری یاسـایێك دەکـــەن کـــە خۆیـــان دایاننـــاوە. کـــە وابـــوو بەرفـــەرمانیی لـــە یاســـاکانی خـــۆ، هـــەمان

٩- عینی

بەرفــەرمانیی لــە خۆیــە و ئەمـــەش مانـــای ئازادییـــە. کـــە وابـــوو لـــە دیـــــموکراسیدا بەرفــەرمانیی لــە یاســا و ئــازادی یــەك شــتە و یەکسانیشــە. لــەم هــەل و مەرجــەدا تەنانــەت ئازادییـــەکانی خـــەڵکی قووڵتـــر دەبنـــەوە و تایبەتـــمەندییەکی مـــەدەنی و ئـــەخلاقی بـــە خۆیــەوە دەگــرێ. لــەم روانگەیــەدا دیـــموکراسی تــەنیا حکوومــەتی شــەرعی و مومکینــە، لــە بەر ئەوەی لێرەدا ئــازادی و یاســا یەکێکــە، بــە واتــایێکی تــر دیـــموکراسی تــەنیا حکوومــەتی خاوەن ماف و شەرعییە کە لەگەڵ ئازادیی ئینسان دەسازێ.

### ٧-١-٥. پاساوی دیـموکراسی بە پێی سوود

جێرمــی بنتهــام, فەیلەسووفـــی گــەورەی ئینگلیســی, ئیســتدلالی دەکــرد ئەگــەر هــەموو مرۆڤــەکان داخــوازی و نیــازی یەکســانیان هەیــە و شــادی و رەنـــجیان وەك یەکــە، کــە وابــوو رازی کردنی نیاز و شادی هیچ کەسێك ناتوانێ باڵاتر بێت لە شادیی خەڵکانی تر.

کــە وابــوو ئــەو شــتەی کــە پێویســتە لــە راوێــژی گشــتی پێوانــە بــێ، ئــەژمارە، یــەعنی ژومـــارەی ئـــەو کەســـانەی کـــە لـــەو راوێـــژە بەهرەمەنـــد دەبـــن. بـــەم شـــێوە دیـــــموکراسی حکوومەتێکە کە تیایدا زیــاترین رادەی شــادی بــۆ زیــاترین خــەڵك لــە بەرچــاو دەگیـــرێ. بــەو پێیە کە کاری ئەساسی حکوومــەت بــە بــڕوای بنتهــام دابیـــن کردنــی ئاســایش و کامــەرانی و خێریی گشــتیە و خــەڵك لــە بــاری شایســتە بــوون بــۆ بەهرەمەنــد بــوون لــەو حکوومەتــە وەك یــەکن، کــە وابــوو هــیچ شــتێکی دیکــە جگــە لــەوەی کــە خــەڵك بــۆ خۆیــان هــەڵی دەبــژێرن، ئامانــجی حکوومــەت بــە حیســاب نایێــت. بــە وتــەی بنتهــام «ئــەو نەزەریــەی کــە پێــی وابــێ ئامانـــجی دەوڵـــەت پـــێش خســـتنی خێـــر و شـــادییە، تـــەنیا ئامانـــجی دەوڵـــەت لەگـــەڵ ئامانــجی ژیانی مرۆڤــ بەیەکسانی لە قەڵەم دەدات».

### ٧-١-٦. پاساوی دیـموکراسی بە پێی مەسڵەحەتـخوازیی ئینسان

گەر دامەزرانی حکوومەت بۆ دابین کردن و راگرتنی مەسڵەحەتی خەڵکە، لەم حاڵەدا خەڵکی بۆ خۆیان باشتر لە هەر کەسێك دەزانن چییان دەوێت و مەسڵەحەتیان لە چیایە و هەر لەم رووەوە لە هەر سەرچاوەیەکی تر شایستەترن تا بە سەر خۆیاندا حکوومەت بکەن. تیۆرییە تازەکانی دیموکراسی هەر بەم پێیە حکوومەتی خەڵك سەروەری پاساو دەدەن. لەم سیستمەدا دەنگی خەڵك، باشترین پێوانە و باشترین کەرەسەی هەڵسەنگاندنی بەر حەق بوونی حکوومەتە، هەر ئیستدلالێك کە سەرچاوەیەکی دیکە جگە لە خودی خەڵکی، لە ناسینی مەسڵەحەتیان بە پێشتر و ساڵحتر بزانێ، بێ گومان بۆلای حکوومەتێکی نادیموکراتیك، زۆرەملێ, یان تۆتالیتار دەئاژوێ.

## ٧-١-٧. پاساوی دیموکراسی بە پێی پەیوەندیی دیموکراسی لەگەڵ ئاشتیخوازیدا

بە پێی ئەم دەلیلە، ئیحتمالی ئەوەی کە وڵاتە خاوەن دیموکراسییەکان لەگەڵ یەك بە شەڕ بێن، کەمترە لە وڵاتانی نادیموکراتیك. لە بەر ئەوەی خەڵك بە گشتی لە شەڕ و هەڵا بێزارن و گەر دەسەڵاتیان لە حکوومەتدا بێ لە شەڕ خۆ دەپارێزن، شەڕی گەورە و گچکە بە گشتی لە لایەن حکوومەتی زۆرەملی، کەللە شەق, یان حکوومەتگەلی ئولیگارشی و داخراوەوە بەرێ خراون.

## ٧-١-٨. پاساوی دیموکراسی بە پێی دەستەبەرکردنی گەشەی ئابووریی سەرمایەداری

بە پێی ئەم ئیستدلالە, دیموکراسی پەیوەندییەکی مێژوویی نزیك و تەنانەت کاریگەری لەگەڵ سەرهەڵدانی کۆمەڵگای پیشەسازی و گەشەی ئابووریدا هەیە. دیموکراسی و سەرمایەداری هەر دوو لە سەر ستوونی ئازادی چەقاون و ئازادی بێ یەکێك لەمانە بەردەوام نابێ. سەرمایەداری جێ خۆشکەری سەرهەڵدانی دیموکراسی و دیموکراسی پێویستیی درێژەدانی سەرمایەداری بووە. لایەنگرانی قوتابخانەی

نیولیبرالیزم، دیموکراسی و سەرمایەداری بەم شێوەیە بە ئاشقە و ماشقەی[10] یەکتری دەزانن. تەنانەت بە بڕوای فردرێك فۆن هایك، فەیلەسووفی بەرەچەڵەك نەمسایی، بازاڕی ئازاد هەر وەك رێك و پێکییەکی هەڵقوڵاو بە پشتیوانی مەعریفەتناسانەی دیموکراسی لە قەڵەم دەدرێ. دیموکراسی و بازاڕی ئازاد هەر دوو سیماییێکن لە رێك و پێکی هەڵقوڵاو سەراسەری جیهان «کاتالاکسی». ئازادی و دارایی بە جەوهەر هاولفن. کەوا بوو هەر جۆرە ئاستەنگێ لە سەر دارایی لە رێگای سوسیالیزم، دەوڵەتی ئاسایش یان بەرنامەی دەوڵەتییەوە دابنرێ، لەگەڵ ئازادی ناخوێنێ و بە پێچەوانەی رێك و پێکی هەڵقوڵاوە.

## ٧-٢. رەخنەگرتن لە دیموکراسی

دیموکراسی لە کۆنەوە بەر هێرش و رەخنە کەوتووە. بە گۆڕانی چەمکی دیموکراسی، دیارە رەخنەکانیشی گۆڕاون. تا پێش شۆڕشی فەڕانسە، دیموکراسی بە گشتی لای زانایانی سیاسی ناحەز و نابەدڵ بوو. تەنیا لەم سەدەیەدا دیفاع لە دیموکراسی گشتی بووە. یەکەم رەخنەکاری لە لایەن بیرمەندانی یۆنان و بە دژی دیموکراسیی راستەوخۆی یۆنانی هاتە ئاراوە. دیموکراسیی یۆنانی کە لە سەر ئەساسی بەشداریی راستەوخۆی هەموو هاوولاتیان، لە مەجلیس و دانیشتنە گشتیەکاندا و جێگۆڕکێی مەقامەکان لە نێویاندا بوو، لەگەڵ دیموکراسیی ئەمڕۆ، کە لە سەر بنەمای نوێنەرایەتی و حیزبی سیاسییە، جیاوازیی بنەڕەتی هەیە. هرۆدۆت مێژوونووسی گەورەی یۆنانی، دیموکراسیی یونانی بە حکوومەتی خەڵکی نەفام و خۆپەرەست و هەژار دەزانێ و پێی وا بوو خەڵك پێویستیان بە پشتیوانی و رێنومایی پادشاکانە. توسیدید مێژوونووسێکی دیکەی یۆنان پێی وابوو کە دیموکراسیی یۆنانی بە سانایی بۆ حکوومەتی لات و لووت دەگۆڕێ کە دەتوانێ خەڵکی عاقڵ بتۆقێنێ و سیاسەتی دەرەکی ناعەقڵانی بگرێتە بەر. ئەفلاتوون, حکوومەتی دیموکراسیی ئەتینای، بە

---

[10]- لە جیاتی لازم و ملزوم دامناوە. گەرچی لازم و ملزوم گەر بە تەنیا بە کار بین، ئاشقە و ماشقە بۆ مانای ئەوان نابن.

بەرپرسی ئیعدامی سوقرات دەزانی و هەر وەها پێی وابوو ئەمە حکوومەتی خەڵکانی نەفامە کە لە ناسینی « مُشل»دا دەستەوەستانن. بە رای ئەفلاتون خەڵکی رەشۆکی، لە ئاکاری عەداڵەت و هێوری بێ بەهرەن و تووشی زەوق و شەهوەتن. بە رای ئەفلاتوونەوە، رێورەسمی هەڵبژاردنی ئەندامانی شورای ٥٠٠ کەسی ئەتینا بە پێی پشك، کارێکی بڵحانەیە. هەر وەها کە ناکرێ دوکتۆر, یان کابان بە پێی پشك هەڵبژێرێ، هەر وەها ئەوانەش کە خاوەنی پیشەی سیاسیین ناکرێ بەم شێوەیە کاریان پێ بسپێرێ.

هەر وەها بە رای ئەفلاتوون دیموکراسی, خەڵك بۆلای فریودان (دیماگۆژی) دەئاژوێ. لە بەر ئەوەی رێبەرانی حکوومەتی دیموکراسی، ئەو شتانە بە خەڵکی دەڵێن کە حەزیان لێیەتی، نەك ئەو شتانەی پێوستیان پێی هەیە. هەر چۆنێکی بێ دواتر ئەفلاتوون رای سەبارەت بە دیموکراسی هێور کردەوە و دیموکراسی و مۆنارشی وەك توخمی ئەسڵی رژیمگەلی تێکەڵ لە قەڵەمدا. بە رای ئەو دیموکراسی باشترین حکوومەتە لە نێوان خراپترین حکوومەتگەل «یەعنی جەباریەت، ئۆلیگارشی و دیموکراسی».

بۆچوونی ئەرەستوو بە رادەی ئەفلاتوون سەبارەت بە دیموکراسی رەخنەیی نەبوو. ئەو تێکەڵەیەك لە دیموکراسی و ئۆلیگارشی لە چوارچێوەی «پۆلیتی»دا بە باشترین شێوەی حکوومەت دائەنا، لە بەر ئەوەی لەم حکوومەتەدا بێ دەسەڵات و خاوەن دەسەڵات لە ترس و زۆرەملی سەبارت بە یەکتری دەپارێزرێن، بەم حاڵەیشەوە باشترین حکوومەت بە لای ئەرەستووەوە، حکوومەتی چینی نێوەنجیە کە خاوەنی هێورین، لە کاتێکدا حکوومەتی خاوەن دەسەڵات و بێ دەسەڵات بۆ لای پەرگیری و بنەگیری دەئاژوێ. هەر بەم جۆرە سیرۆن سیاسەتمەداری بەناوبانگی رۆمی، دیموکراسیی تۆخی بە هۆی داوەشانی ژیانی سیاسی دەزانی و خوازیاری حکوومەتێکی تێکەڵ لە توخمی مۆنارشی و ئارسیتوکراسی و دیموکراسی وەك باشترین حکوومەت بوو.

بیری سیاسیی مەسیحییەت لە سەدەکانی نێوەڕاستدا سەرومڕ بە دژی دیموکراسی بوو، زۆر لە زانایانی ئەو کاتە ئاماژەیان بە رستەیەکی پەیامی «پولس ناردرا بۆ رۆمیان» لە کتێبی پیرۆزدا دەکرد، کە لەوێدا لە مەسیحییەکانی خواستبوو تا لەو دەسەڵاتانەی کە خواوەند لە رووی زەوی داینـاوە پەیڕەوی بکەن. دیارە خەڵك بە رەعیەتی کاربەدەستان و سوڵتانەکان لە قەڵەم دەدران. تۆماس ئاکوئیناس، بیرمەندی گەورەی سەدەی ناوەڕاست, حکوومەتی شاهی تەسك کراوە بە یاسای پێ باشتر بوو، لە دیموکراسی و حکوومەتی شاهی بەرانبەر بە حاکمییەتی خواوەند لە سەر جیهان دادەنا و پێی وابوو دیموکراسی بە پێچەوانەی نەزمی سروشتە. رەخنە لە دیموکراسی لە سەدەکانی نوێدا، لە نێو بیرمەندانی ئەورووپاییدا هەر وەها درێژەی کێشا. ماکیاڤیل زانای سیاسی سەدەی شانزدە گەرچی ئەم پەندی «دەنگی خەڵك، دەنگی خوایە» زۆر بە نابەجێ نەدەزانی، سەرەڕای ئەمەش پێی وابوو کە خەڵك لە پەنای ئەشراف و دەوڵەمەنداندا تەنیا یەکێك لە کۆڵەکەکانی حکوومەت دروست دەکەن. بە رای ئەو دیموکراسی سیستەمیکی ناسەقامگیرە و هێزی دەوڵەت ناپارێزێ، حکوومەتی بە هێز, پێویستی بە رێبەرێکە کە ژیانی سیاسی رێك بخات، هەر بەم شێوەیە تۆماس هابز لە کتێبی لۆیاتان (١٦٥١) لە نێوان جۆرەکانی حکوومەت وەك مۆنارشی، ئارسیتوکراسی و دیموکراسی، مۆنارشی زیاتر لەوانی دی بە پارێزەری ئاسایش و هێمنایەتیی کۆمەڵ دەزانێ. بە رای هابز دیموکراسی بە مانای حکوومەتی راستەوخۆی خەڵك لە رێگای مەجلیسی گشتییەوە بە کردەوە بەڕێوە ناچێ. بە رای ئەو خەڵك بە گشتی لە بیری خواستی تایبەتیی خۆیاندان، زۆرترین دەورێك کە دەتوانێ لە حکوومەتدا بۆ خەڵك لە بەر چاو بگیرێ ئەمەیە کە سەبارەت بە دەسەڵاتی حاکمییەت رەزایەتی خۆی دەرببڕێ. هابز هەر وەها سەندیکا، گروپەکان و نەهادەکانی کۆمەڵی مەدەنی بە «کرمی سکی دەوڵەت» ناو دەبرد.

رەخنە لە دیموکراسی دوای شۆڕشی فەڕانسە گەیشتە چڵەپۆپە. ئیدمۆند برك لە کتێبی چەند تێبینییەك سەبارەت بە شۆڕشی فەڕانسە (١٧٩٠) دیموکراسی بە پڕ

شەرمترین جۆری حکوومەت باس کردووە، لە بەر ئەوەی ئەم حکوومەتە هیچ پێوانەیەکی سەرتر لە دەنگ و رای خەڵکی رەشۆکی ناناسێت. دیموکراسی دوژمنی ئەخلاقە، بەم مانایە کە لە رێگای عەقڵ و حیکمەتەوە وەردەگیرێ و عەقڵ و حیکمەت لای خەڵکی ڕەشۆکی دەس ناکەون. برك لە بەرانبەردا خوازیاری «ئەشرافیەتی سروشتی» بوو. بە رای ئەو گەورەترین کێماسیی نەزەرییەی دیموکراسی لەم خاڵەدا بوو کە یاسای بە هەڵقولاڵو لە ئیرادەی خەڵکی عامەوە دەزانی. بە زەینی ئەو، نەریت و دەمارگرژی بنەمای هێز و راگری کۆمەڵن و دیموکراسیی شۆڕشگێڕانە و ئاوەزمەند بە هێرش بۆ سەر نەریتەکان، بناغەی کۆمەڵ لەق دەکات. برك پێی وابوو کە مافی دەنگدان دەبێ تەنیا بۆ ئەشراف تەسك بکرێتەوە، لە بەر ئەوەی بەردەوام هێز و دەسترۆیشتووی ئەوان زیاتر لە خەڵکی گشتی بێ پرەنسیپە زەبینەکانی بەرابەری، ئازادی و مافی مرۆڤ، نەریتەکانی کۆن و جێ گرتوو سست دەکات. ئازادی و بەرابەری لە مانایەکی زەینیدا، بیرێکی هڵوڵن و ناکرێ مافی مرۆڤ لە «تەبعی مرۆڤە»وە هەڵ هێنجێ، لە بەر ئەوەی مرۆڤ بەردەوام لە ناخی کۆمەڵەیەکی دیاریکراودا دەژی. چینی باڵا شیاویان بۆ حکوومەت زیاترە، لە بەر ئەوەی سەرچاوەی عەقڵ و فەرهەنگیی پێشینیانن و راگری نەریت و بایەخ و هەڵگری شارستانیەتن. ئیمتیازی چینی باڵا بۆ حکوومەت کردن، ئاکامی هۆکاری سروشتی نین، بەڵکو بەرهەمی ئەو هەلە باشانەیە کە لە بەردەستی ئەواندا بووە. چینی باڵا بە بەرەکەتی پێگەی کۆمەڵایەتییان، زیاترین بەشیان لە عەقڵ و فەرهەنگی سەدەکانی پێشوو وەدەست هێناوە.

هیگل، فەیلەسووفی گەورەی سەدەی نۆزدەی ئاڵمان، رەخنەی لە چەمکی ئەساسیی دیموکراسی، واتا حاکمییەتی ئیرادەی خەڵك دەگرت، بە بڕوای ئەو چەمکی لیبراڵی «خەڵك» وەك کۆمەڵێك تاکی جیا و سەربەخۆ، شتێکی شاشە. مانای ئەوتۆ لە خەڵك شتێکی زەینیە و ناتوانێ خاوەنی ئیرادەیێکی سەربەخۆ بێت. فەلسەفەی سیاسیی هیگل سەرتاپا لەگەڵ چەمکی پەیمانی کۆمەڵایەتی وەك

بنەمای دیموکراسی دژایەتی هەیە، ئەو پێی وابوو دەوڵەت یەکێك لە نیشانەکانی پوختە بوونی ئۆرگانیستی روح لە مێژوودایە و ژیانی تاك تەنیا لە دەروونی دەوڵەتدا مانا پەیدا دەکات. کارل مارکس و فریدریك ئینگلس، حکومەتی دیموکراسیی لیبراڵیان بە حکومەتی بورژوازی و سەرمایەداری دەزانی. بە رای ئەوان دیموکراسیی راستەقینە تەنیا بە لە نێوچوونی سیستەمی سەرمایەداری و سوڵتەی چینایەتی, یەعنی لە سوسیالیزمدا مومکین دەبێ. نەهادەکانی دیموکراسیی بورژوازی وەك هەڵبژاردن، مافی دەنگ دانی گشتی، خەباتی حیزبەکان و... هتد تەنیا سەرپۆشێکن بۆ ئەوەی سوڵتەی چینی حاکم بشارێتەوە. بە رای ئەوان سوڵتەی چینایەتی لەگەڵ دیموکراسی کۆ نابێتەوە. بە واتایێکی دیکە دیموکراسیی لیبراڵ و بورژوازی بە رادەی پێویست دیموکراسی نین. چینی حاکم, ئیدئولوژیی دیموکراسی وەك ئایدیۆلۆژیایەکی رووکەش بە سەر چینە بندەستەکاندا دەسەپێنێ. بە بڕوای مارکس «دیموکراسیی راستەقینە» تەنیا پاش وەلانانی لە خۆ نامۆیی11 مرۆڤەکان لە سوسیالیزمدا مسۆگەر دەبێ. رەخنەی مارکس و ئینگلس لەمەڕ دیموکراسی، لە قۆناغی چەپڕەوی و چاکسازیخوازیەوە دەهاتە بەرباس، لە لایێکی ترەوە رەخنەی بیرمەندانی نوخبەخوازی وەك ویلفرد و پارەتۆ، گائتانو موسکا و... هتد لە قۆناغی راستڕەوی و رەش بینیەوە دەهاتە بەر باس، ویلفرد و پارتۆ (١٩٢٣-١٨٤٨) کۆمەڵناسی ئیتاڵی لە قۆناغی نوخبەخوازیەوە هێرشی دەکردە سەر دیموکراسی و لە راستیدا دیموکراسی بە شتێکی نامومکین دەزانی.

بە رای پارەتۆ گەرچی وەخۆخستن و هاندانی خەڵکی لە لایەن نوخبەکانەوە مومکینە، بەلاَم حکومەت هیچ کات بە دەستی خەڵك ناکەوێ، بەڵکو بەردەوام کۆمەڵێك خەڵکانی بژاردە حکومەتیان لە دەستایە. کە وابوو هەموو حکومەتەکان، تەنانەت دیموکراسیش حکومەتی بژاردەکانن. تەنیا جیاوازیی دیموکراسی لەگەڵ حکومەتەکانی تردا لەوە دایە کە ئەو حکومەتانەی دیکە لە

11- از خود بیگانگی elination

کارتل دەچن، یەعنی یەکگرتن و یەکیەتیی نێوان تاقمە بژاردەکان بە حیساب دێت. کاری سیاسەت لە دیموکراسیدا دابەشکردنی ئیمتیازەکانە لە نێوان ئەم تاقمە یەکگرتوانەدا. بە رای پارتۆ سیاسەت پەیڕەوی لە یاسای ئاسنینی «سووڕانی بژاردەکان»[١٢] دەکات، کە وابوو لاوازی و نەتوانینی بژاردەکانی حاکم، دەبێتە هۆی ئەوەی گروپی بژاردەی تازەنەفەس بگەنە دەسەڵات. هەر بەم پێیە «مێژوو گۆڕستانی ئەشرافیەتەکانە». جەوهەری سیاسەت بە لای پارتۆوە زۆر و هێزە. بۆیە ئەو شتەی کە لایەنگرانی دیموکراسیی وەك رازی بوون و قانع بوون و هۆگریی خەڵك ناوی دەبەن لە فێڵێك زیاتر نییە. کە وابوو دیموکراسی بە مانا دڵخوازەکەی لەگەڵ راستی ژیانی سیاسی ناخوێنێ. بە بڕوای گائێتانوموسکا (١٩٤١-١٨٥٨) هەموو حکوومەتەکان بە بێ لە بەرچاو گرتنی ئەوەی کە بە خۆیان دەڵێن, دیموکراسی، ئەشرافی, یان مونارشی لە هەر حاڵدا حکوومەتی تاقمێکی کەمی بژاردە، بە سەر زۆرینە دایە. هەر کۆمەڵێك لە دوو بەش، چینی حاکم (کەمینە) و چینی فەرمانبەر «زۆرینە» پێکهاتووە. لە دیموکراسییە رووکەشەکانیشدا «نوێنەرایەتی» خەڵکی لە راستیدا لە لایەن کەمینەیێکی رێکخراوەوە دیاری دەکرێن کە سەر بە چینی کاربەدەستن. بە بڕوای موسکا هەڵبژاردن لە دیموکراسییەکاندا، رکەبەرییێکی نابەرابەر لە نێوان کەمینەی سازماندراو و زۆرینەی بێ سازماندایە. بەم حاڵەیشەوە موسکا لە ژێر کاریگەریی ئەزموونی وەخۆخستنی فاشیستی لە ئیتالیادا بیری خۆی سەبارەت بە بێ کردەوەیی خەڵکی، کەمێك گۆڕی و هاتە سەر ئەو بڕوایە کە حزووری خەڵکی وەخۆ کەوتوو[١٣] لە ژیانی سیاسیدا بە هۆی دنەدانی گروپی سیاسییەوە نە تەنیا مومکینە بەڵکو شتێکی ئێکجار ترسهێنەرە.

موسکا سەرەڕای بۆچوونی رەخنەئامێزانەی سەبارەت بە لیبرالیزم و دیموکراسی، بە کردەوە داکۆکی لە حکوومەتی پارلەمانی و دیموکراسی، لە بەرانبەر دەست درێژیی مۆسولینیدا، دەکرد. بە رای ئەو باشترین جۆری حکوومەت، حکوومەتێکە کە لە سەر هاوسەنگی هێزەکانی کۆمەڵ لە سنووری سیاسیدا

---

١٢- گردش نخبگان Elite cycle
١٣- بسیج شده

دامەزراوە. هەر چەندە هەبوونی هێزی کۆمەڵایەتی کە خاوەنی سەرچاوەی جۆراوجۆری دەسەڵات وەك، سامان، هێزی لەشکری، ئایین، زانست و... هتد ن، لە حکوومەتدا زێدەتر بن، سەقامگیریی سیاسی زیاترە. بەڵام دیموکراسی لە مانا رۆژانەکەیدا لە روانینی مۆسکاوە، حکوومەتێکی سەقامگیر نییە، لە بەر ئەوەی تەنیا نوێنەرایەتی یەکێك لە هێزەکان قازانجی چەند لایەنە یەعنی خەڵکی رەشۆکی هەژارە.

جورج سانتایانا (١٩٥٢-١٨٦٣) فەیلەسووفی بە رەگەز ئەسپانی ئەمریکی، دیموکراسی بە حکوومەتی خەڵکی نەفام و چەواشە دەزانێ. بە رای ئەو سەڵتەنەت، درێژەی سروشتیی دەسەڵاتی باوك لە سەر بنەماڵەیە و ئەشرافییەتیش دەرمانی نەزانی و ناهێژایی خەڵکی رەشۆکییە. ئەو دیموکراسی بە حکوومەتێکی چۆل و هۆڵ لە گەورەیی و شانازی و هاونشینی کلۆڵی و دارِزیوی دەزانی.

بە نەزەری سانتایانا گرینگترین تایبەتەکاریی دەوڵەت, دابین کردنی نەزم و ئاسایشە و دیموکراسی لەم بارەوە کەمترین دەسەڵاتی هەیە. ئەو وتەیێکی بەناوبانگی لە وەسفی حکوومەتی خەڵکدا هەیە کە بەم جۆرەیە «هێزی فیکریی خەڵکی رەشۆکی بە رادەی فیکری کرمێکە بەڵام هێزی پەنجەکانی بە قەدەر هێزی پەنجەی ئەژدیهاییێکە، هەر کەس ئەم ئەژدیهایە بکوژێ قارەمانێکە». رێگە چارە بۆ حکوومەتی خەڵکی عەوام، حکوومەتی بژاردەکانە کە دەتوانێ هەم بە شێوەی پادشایی و هەم بە شێوەی ئەشرافی بێتە ئاراوە. خۆزە ئورتگای گاست (١٩٥٥-١٨٨٣) فەیلەسووف و ئەدیبی ئەسپانی لە رەخنەگرانی گەورەی دیموکراسی بوو. ئەو بە پێچەوانەی بژاردەخوازان کە حکوومەتی خەڵکی رەشۆکییان بە نامومکین دەزانی پێی وابوو کە دیموکراسیی هاوچەرخ, هەمان حکوومەتی خەڵکی رەشۆکییە. بە رای ئەو دیموکراسی لە سەرەتاوە کە قەرار بوو حکوومەتی یاسا بێت، ئێستا کە بۆ حکوومەتی حەز و مەیل و هەوەسی خەڵکی رەشۆکی گۆڕاوە، خەڵکی رەشۆکیی هاوچەرخ لە هەموو سنوورەکانی ژیان قووت بووەتەوە و چۆنایەتی ژیانی مرۆڤی وێران کردووە. دیموکراسیی خەڵکی رەشۆکی بە بۆچوونی ئورتگا زەخسان و کارەساتێکی فەرهەنگییە. لە دیموکراسیی رەشۆکیدا بژاردەگەل رێنوێنی و فەرمانەدەیی خۆیان لە

دەست داوە و لە ئاکامدا پێوانەکانی ئەخلاق و فەرهەنگ بزر بوونە. بە نەزەری ئورتگا، فاشیزم یەکێك لە دیارەکانی دیموکراسیی رەشۆکی نوێژەنە. لە چاخی نوێژەندا، بڵخەی کاسکەری خەڵکی رەشۆکیی، لە هەموو جێگایێك دەبیستریّ و کۆمەڵگای رەشۆکی بنەمای دیموکراسیی نوێژەن چێ دەکات. دیموکراسی و فەرهەنگی ئەمریکی ئەمرۆکە بووە بە «بەهشتی خەڵکی رەشۆکی».

جیوانی جنتلیە (١٩٤٤-١٨٧٥) فەیلەسووفی فاشیستی ئیتاڵی پێی وابوو کە سەرەڕای بانگەشەی لایەنگرانی دیموکراسی، حکوومەتی زۆرینە مومکین نییە. دیموکراسییەکان تەنیا وەهمی سەروەریی خەڵك دروست دەکەن و لە راستیدا دەسەلات هەمیشە لە دەستی کەمینە دایە. بە بڕوای جنتلیە وشەی دیموکراسی لە سەدەی بیستەمدا وەها شۆرەت و ناوبانگێکی وەدەست هێناوە کە هەموو ئیدئولۆژیاکان تەنانەت فاشیزمیش خۆی بە دیموکرات لە قەڵەم دەدات. ئەویش بەم شەرحەوە کە فاشیزم خۆی بە نوێنەری گەلیّ رێکخراوە لە سەندیکاکاندا دەزانیّ نەك نوێنەری زۆرینەی بیّ قەوارە و بیّ ئیرادەی خەڵکی. مارتین هایدگر (١٩٧٦-١٨٨٩) فەیلەسووفی ئەڵمانی لە پەنای بەرنگاری لە فاشیزم، رەخنەگری دیموکراسی بوو. هایدگر دوای ساڵی ١٩٣٣ چووە نێو حیزبی نازییەوە و چەند سوخەنرانییێکی بۆ پشتیوانیی «شۆڕشی» هیتلەر ئەنجامدا و پێی وابوو کە نازیزم دەتوانیّ ئەورووپا لە دوای هیچ و پووچخوازیی دیموکراسیی بورژوایی رزگار بکات. بە بڕوای ئەو کۆمەڵگای نوێژەن تووشی هێزی تێکدەری و شارنشینی بووە و تایبەتمەندیی رەشۆکی پەیدا کردووە. بەلاّم کۆمەڵگای دڵخواز دەبێت لە سەر بنەمای چەند پلەیی و رێك و پێکی و نەریتی کۆمەلاّیەتی سەر لە نویّ رێك بخرێتەوە. سیستەمی فرەحیزبی، سیستەمێکی فاسدە، تەنیا سیستەمی یەك حیزبی لە ژێر رێبەری پێشەواییێکی تاك و تەنیادا دەتوانیّ یەکیەتی گەل بپارێزیّ. تەنانەت دوای جەنگی دووەمی جیهانیش، هایدگر لە ساڵی ١٩٦٦دا راگەیاند کە دیموکراسی ناتوانیّ رێگا چارەیێك بۆ دنیاو کۆمەڵی بەتکنیککراو بدۆزێنەوە.

لیوشتـــراوس (١٨٩٣-١٩٧٣) لــە روانگــەی فەلســەفەی کلاســیکەوە هێرشــی بــردە ســەر لیبــرالْ دیــموکراسیی مــودێرن. ئــەو پێــی وابــوو کــە دیـــموکراسی و لیبــرالیزم نــاتوانن لــە پلــەی تــاك لــە بەرانبــەر پێلــی بــێ ســنووری توتالیتــاریزم و بزاڤــی خــەڵکی رەشۆکی لە سەدەی بیستەمدا بەرەنگاری بکەن.

لیوشتـــراوس لـــە فەلســـەفەی رەهـــا لـــە بەرانبـــەر نســـبیخوازی، مێـــژووخوازی، زانســتخوازی و زانســتە نوێکــان بــە گشــتی دیفــاعی کــرد. ئــەو پێــی وابــوو لــە نێــوان فەلســەفەی رەهــا و دیـــموکراسیدا، زاتــەن هــیچ پەیوەنــدییێك نییــە. فەیلەســوفان نــاتوانن لەگەڵ دیـموکراسی رێـك بکـەون، لـە بـەر ئـەوەی دیـــموکراسی پـێ لـە سـەر بەرانبـەری گشــتی دەچــەقێنێ و فەیلەسووفان کــە لــە راســتیدا پێیــان وایــە مەعریفــەت لــە پــاوانی ئەوان دایە دانوویان ناکوڵێ.

# هەنگاو بەرەو دیـموکراسی و ئاسۆی داهاتووی

نیـوەی دووەمـی سـەدەی بیسـتەم شـایەتی پێشـکەوتنی بەرچـاوە لـە جێگیـربوونی دیـموکراسیی. هەنـدێ لـە نووسـەران بـاس لـە شـەپۆلێکی نـوێ لـە دیـموکراتیزاسیۆن دەکـەن کـە لـە کۆتـایی ۱۹۷۰وە دەسـتی پێکـردووە و لـە ئاکامـدا زۆر وڵاتـی ئـەمریکای لاتیـن، ئـەورووپای رۆژهـەڵات و ئاسـیا و ئـەفریقای تەنیوەتـەوە. ئـەزموونی سیسـتمگەلی توتالیتـار، تـاك حیزبـی، دەسەڵاتـخوازی راسـت و چـەپ کـە لـە درێـژەی سـەدەی بیسـتدا تووشـی شکسـتی یـەك لـە دوای یـەك هـاتن، سـەرەڕای هـەموو ئەمانـە, دیـموکراسی هـەر وەهـا رووبـەڕووی دوژمـن و مەترسـی و تەنگـژەی جۆراوجـۆرە. هێشـتا فاشـیزم، نیوفاشـیزم، دەسەڵاتـخوازی، سوننەتـخوازی، بنەڕەتـخوازی، پارێزگـاری و عەسـکەرخوازی، دیـموکراسی و شـێوە ژیـانی دیـموکراتیك دەخەنـە مەترسـییەوە. لـە لایێکـی تریشـەوە رەوەندی نـوێی «جیهـانی بـوون» ئاسـتەنگی نـوێی بـۆ دیـموکراسی بـە مانـا وەرگیـراوەکەی دروسـت کـردووە. لـەم بەشـەدا دەکەوینـە لێکدانـەوەی پێشـکەوتنی شـەپۆلەکانی دیـموکراسی و ئەو لەمپەرانەی کە بەر بەو شەپۆلانە دەگرن.

## ۸-۱. شەپۆلەکانی دیـموکراسیی

مەبەسـت لـە شـەپۆلەکانی دیـموکراسی، ئـەو گۆڕانگاریانەیـە کـە لـە ناوچـەیێك, یـان بەشـێك لـە جیهـان بـە سـەمتی بەدیموکراسـی کردنـی زێـتر روویـان داوە و دوای ئـەوەی گەیشـتوونەتە چـڵەپۆپە، لانـی کـەم لـە هەنـدێ وڵاتـدا بووەتـە هـۆی سەقامگیـربوونی دیـموکراسی. رەوەنـدی بـڵاو بوونـەوەی دیـموکراسی خـاوەنی ناوەندگـەلی شـوێن و کـات بـوو. هـەر بـەم پێیـە وەك شـەپۆڵ چـوونەتە پـێش. دیـارە دەربـارەی زەمـان و مـەودا زەمانییـەکان و هاتنەکایـەی شـەپۆلەکانی دیـموکراسییەوە، لـە نێـوان خاوەنراپایانـدا بیـروڕای جۆراوجـۆر هەیـە، بـۆ وێنـە سـامۆئل هـانتینگتون زانـای سیاسـیی ئـەمریکایی بـاس لـە سـێ شـەپۆڵ دیـموکراسی دەکـات: یەکـەم لـە سـاڵی ۱۸۲۸وە تـا ۱۹۲٦، دووەم لـە جـەنگی جیهـانی دووەم تا دەیەکانی ۱۹٦۰ و سێیەم لە کۆتایی دەیەی ۱۹۷۰وە تا دواتر.

فیلیپ ئشمیتر نووسەرێکی دیکەی ئەمریکی، باس لە چوار شەپۆلی دیموکراسی دەکا: یەکەم شەپۆلی «بەهاری ئازادی» لە ئەورووپا کە لە ساڵی ١٨٤٨وە دەستی پێ کرد، بەڵام زۆری نەخایاند و لە ساڵی ١٨٥٢ زۆر وڵات بەر شەپۆلی دیموکراسی کەوتبوون، بۆ دۆخی پێشوویان پاشەکشەیان کرد. شەپۆلی دووەم کە لە دەور و بەری شەڕی یەکەمی جیهانی دوای ئەوە هاتە ئاراوە، هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری رووسیا و نەمسا بووە هۆی سەرهەڵدانی دەوڵەتی نوێ کە لە سەرەتاوە پەیوەستی دیموکراسی بوون. کۆماری وایمار جێگای ئیمپراتۆریای ئاڵمانی گرتەوە و لە زۆر وڵاتی دیموکراتیی باکوور و باشووری ئەورووپا مافی دەنگ دان پەرەی ئەستاند و حیزبی نوێ بەشداری کاروباری سیاسی بوون، شەپۆلی سێیەم دوای جەنگی دووەمی جیهانی دەستی پێ کرد، دیموکراسیی نوێ لە ئاڵمان و ئیتالیا چێ بوون و زۆر وڵاتی ئەورووپای بۆ دۆخی پێشتری خۆیان گەڕانەوە. سەرەڕای ئەمانەش رەوەندی دژی ئیستعمار، شەپۆلی دیموکراسی بۆ دەرەوەی ئەورووپا بڵاو کردەوە. هەر وەها رژێمی دیموکراتیك لە ژاپۆن و کۆریای باشوور هاتنە ئاراوە. لە ئاخردا شەپۆلی چوارەمی دیموکراسی بە کودەتای نیزامییەکانی پورتەغاڵ لە ٢٥ نیسانی ١٩٧٤ بە دژی دەوڵەتی سەرەڕۆی ئەوێ دەستی پێ کرد. لە دوای ئەمەدا، گۆڕانکاری لەو چەشنە لە یۆنان و هەندێ وڵاتی ئامریکای لاتین هاتنە کایەوە. بە رای ئەم نووسەرە شەپۆلی چوارەم هێشتا درێژەی هەیە و شەپۆلی چوارەم بە بەراورد لەگەڵ ئەوانی تردا جیهانگیرتر بووە و وڵاتانی باشووری ئەورووپا، ئامریکای لاتین، ئاسیا و رۆژهەڵاتی ئەورووپای لە ماوەی (١٩٨٩-١٩٧٤) گرتۆتەوە. ئەم شەپۆلە بە شێوەییێکی کەمڕەنگتر هەندێ لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی داگیر کردووە. جگە لەمانە ئەم شەپۆلە لە ئەوانی تر بە تەوژمتر بووە و لە ئاکامدا گەڕانەوەی بۆ دۆخی پێشووتر کەمتر بووە و قووڵترین ئاڵ و گۆڕی لە وڵاتانی کۆمۆنیستی پێشوو پێکهێناوە و زەخت بۆ پەرە پێدانی دیموکراسی لە وڵاتانی دیکەی وەك چین، پیرۆ، تایلەند و ئێران بە جوانی هەست پێ ئەکرێ. بۆ لێکدانەوەی هاتنی شەپۆلەکانی دیموکراسی, زۆربەی نووسەران ئاماژە بە تیۆری «بڵاوبوونەوە»[١٤] دەدەن،

---

١٤- اشاعه

بەم مانایە کە گەیشتنی سەرکەوتووانەی هەر ولاتێك بە دیموکراسی دەبێتە سەرچاوەی چاولێکەری بۆ ولاتانی دیکە. بە تایبەت دراوسێکانی ناوچەییێك لە کارتێکەریی گۆڕانگاریی سیاسی بە سەر یەکتریدا بێ بەش نابن. ئەم گریمانە بە تایبەت سەبارەت بە شەپۆلی چوارەم راستتر دێتە بەرچاو، لە بەر ئەوەی هیچ رووداوێکی جیهانی هاوبەش وەك شەڕ و... هتد, ولاتانی باسکراوی تووشی ئاڵ و گۆڕ نەکردووە. بلاو بوونەوەی پەیوەندییە نێونەتەوەییەکانیش رەوەندی (بلاوبوونەوە)ی زیاتر تین داوە.

ئایدیۆلۆژیایەکی دیکە کە بۆ لێکدانەوەی دیموکراسی باسی لێوە دەکەن، ئایدیۆلۆژیای هێزی پاڵ پێوەنەرە. بە پێی ئەمە، لەگەڵ پەرە سەندنی دیموکراسی لە هەر ولاتێکدا، فشاری رووداوە نێونەتەوەییەکان لە هەمان ئاراستەدا زیاتر هێز دەگرێ. ئەو ولاتانەی کە دێرتر پەیوەستی دیموکراسی دەبن، بەر زەختێکی زیاتر دەکەون و لە لایێکی تریشەوە نرخێکی کەمتر بۆ «تاقیکاری و خەتا کردن١٥» دەدەن و ئەمەش بۆ خۆی هاندەرێکە. یەکێك لە دەلیلەکانی سەلمێنەری ئەم تیورییە ئەمەیە کە لەگەڵ سەرکەوتنی شەپۆلی دیموکراسی لە هەر ولاتێکدا، رێکخراو و تاقمگەلێك بۆ پشتیوانی لە مافی مرۆڤ، مافی کەمینەکان، پشتیوانی لە بزاڤە دیموکراتیکەکانی ولاتانی دیکە و... هتد پەیدا دەبن کە هێزێکی پاڵ پێوەنەری زیاتر بە شەپۆلی دیموکراسی دەبەخشن. بە پەرەگرتنی شەپۆلی چوارەمی دیموکراسی لە دەیەکانی ١٩٩٠دا، بنەماگەلێکی بەربلاو لە دامەزراوە، ئەنجومەن، بزاڤ و رێکخراو لە ئاستی نێونەتەوەییدا بۆ پشتیوانی لە شەپۆلە نوێیەکانی دیموکراسی سەریان هەڵدا. بە واتایێکی دیکە زەمینەی نێونەتەوەیی بزاڤی دیموکراسی بەم شێوەیە تینی سەندووە. کە وابوو ئەو شتەی کە لە پەرە سەندنی تیۆریی دیموکراسیدا گرینگ و کاریگەرە، چەمکی خەیاڵیی «بلاو بوونەوە»نییە، بەڵکو خەباتی بە کردەوەی گروپ و سازی نادەوڵەتی لە ئاستی نێونەتەوەیی دایە. لەم روانگەوە گریمانەی بلاوبوونەوە ناتوانێ پەرە گرتنی شەپۆلی دیموکراسی لە ناوچە جیاجیاکانی جیهان، بۆ وێنە لە باشووری ئەورووپاوە تا رۆژهەلاتی ئاسیا لێك بداتەوە.

---

١٥- آزمون و خطا

بەم حاڵەیشەوە گریمانەی بڵاوبوونەوە لەو ناوچەگەلە کە لە باری چاندیەوە یەك ڕەنگن مانادارە. بۆ وێنە گۆڕانکارییەکانی کۆتایی دەیەی ١٩٨٠ بەرەو دیموکراسی لە ئامریکای لاتین کەم تا زۆر لە ژێر کار تێکەریی یەکتردا هاتنە ئاراوە. سەرەڕای ئەمە سیستەمی دیکتاتۆریی شیلی ژێر دەسەڵاتی پینۆشە لە بەرانبەر گۆڕانکارییەکاندا سەرسەختی لە خۆی نیشاندا. ڕێکردنی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئەورووپا بۆ لای دیموکراسی لە دەیەی ١٩٨٥ یەك بە دوای یەك سەلمێنەری گریمانەی بڵاو بوونەوە و چاولێکەرییە. هەر چەندە هۆکاری سەرەکی ئەم شەپۆلە لە ناوچەکەدا، گۆڕینی سیاسەتی دەرەکی و نیزامیی یەکیەتی سۆڤیەتی دەورانی گورباچۆڤ بوو. هەر وەها دەتوانین بڵێین کاریگەریی سازمانە نێونەتەوەییەکان لە چوارچێوەی ناوچە جوغرافی و فەرهەنگیەکاندا زیاترە.

ئەو شتە کە بە جیهانیبوون، یەعنی ڕەوەندی پەرە سەندنی بازاڕی جیهانی، نێونەتەوەیی بوونی سەرمایە، لاواز بوونی دەسەڵاتی دەوڵەت، میللەتان و پەرە سەندنی پەیوەندی فەرهەنگی لە ئاستی جیهانیدا، پێی دەوترێ، لە خۆیدا تینی بە شەپۆلەکانی دیموکراسی داوە. هەرای وڵاتان سەبارەت بە دەست تێوەدرانی دەرەوەیی لە نێو کاروباری نێوخۆیان بە شێوەیێکی بەرچاو کەمڕەنگ بووە و جیا کردنەوەی سنووری نێوان سیاسەتی میللی و نێونەتەوەیی تووشی ئاڵۆزێکی گەورە هاتووە.

هەر لەم ئاسۆیەدا پەیوەندیی سازمانگەلی ئابووریی نێونەتەوەیی وەك سندووقی نێونەتەوەیی پوڵ و بانکی جیهانی، بەخشینی ئیعتبارات و ئیمتیازات و ئەندامەتی بە هەندێ تایبەتمەندییەوە کۆڵەوەس١٦ کردووە وەك پاراستنی مافی

---

١٦- مشروط

مرۆڤ، چاکسازیی لە نەهادە سیاسییەکاندا و بەڕێوە بردنی هەڵبژاردنی دیموکراتیك.

بۆ وێنە یەکیەتی ئەورووپا دەورێکی گەروەی لە بنەجێ کردنی دیموکراسی لە ئەورووپای باشوور و رۆژهەڵاتیدا بینیوە و وەرگرتنی ئەندامی نوێی وەك کەرەسەییێکی گرنگ لەم بوارەدا بەکار هێناوە.

تیۆریی بژاردەی عەقڵانی, لێکدانەوەییێکی دیکە سەبارەت بە رەوەندی دیموکراتیزاسیون دەخاتە بەردەست. لەم روانگەیەوە دیموکراسی لە هەل و مەرجێکی مێژوویی تایبەت و دەگمەندا دێتە ئاراوە کە لەوێدا دوو مەرج هاتبێتە ئاراوە: یەکەم حاکمێکی خۆپەرەست و دەسەڵاتخواز سەرنخوون بوو بێ، دووەم ئەو دژبەرانە١٧ی کە هێز دەگرنە دەست لە کۆمەڵێك تاقمی رەنگاورەنگ پێك هاتبن و لە نێوەیاندا تاقم, یا رێبەرێکی کارامە نەبێ. ئەگەر هیچکام لە گروپەکان بەسەر ئەوانی تردا سەر نەکەون رەنگە دوو دۆخ بێتە ئاراوە: یەکەم تەنگەژەی بێ کۆتایی لە نێوان گروپە هاوسەنگەکاندا و دووەم، پێك هاتن لە سەر پێکەوە ژیان. رێگای دووەم زەمینەی چەکەرەکردنی دیموکراسییە, کە وابوو دیموکراسی کاتێك مسۆگەرە کە گروپە پرش و بڵاوەکانی یاریی سیاسی بە سەرچاوەی هێزی چوون یەکەوە، ئامادە بن پێکەوە کار بکەن و پێکەوە بژین، رێگای پێشگیری لە دیسان سەقامگیربوونی حکوومەتی نادیموکراتیك, یا دەسەڵاتخواز، ئامادە کردنی هەل و مەرجێکە بۆ ئەوەی هیچ گروپێ، زاڵ نەبێ بە سەر ئەوانی تردا و پێشگیری بکات لە پاوانخوازیی ئەو گروپە بە سەر سەرچاوەکانی دەسەڵاتدا. لە هەل و مەرجی گۆڕینی حکوومەتی دەسەڵاتخواز بۆ دیموکراتیك زۆر جار کۆمەڵێ گروپ و هێزی سیاسیی تێکۆشەر و رەنگە لە نێوانیاندا پێکهاتن و ناکۆکیش ببێت. پێکهاتن لە سەر بواری گەیشتن بە دیموکراسی بەو هاوپەیمانیەتییەوە

---

١٧- مخالف

پەیوەستە کە کۆمەڵەی جۆراوجۆر بەشداری تێدا دەکەن. هەوڵدان بۆ سەقامگیریی دیموکراسی لەم دۆخەدا دەستەبەری ئاژاوە لە نێوان حکوومەت «تاقمی حاکم» و دژبەرانی ئەوان لە لایێك و کۆمەڵی ناکار بە دەست، هاوپەیمانیی «گروپی دژبەر۱۸» لە لایێکی ترەوەیە کە پارێزگاری لە دیموکراسی دەکەن. دژبەرانی حکوومەتی دەسەڵاتخواز و لەسەرکار ئەبنە دوو دەستەوە: میانەڕەو و توندڕەو.

لە لاییکی ترەوە پارێزەرانی حکوومەتی دەسەڵاتخواز و کاربەدەست دوو دەستەن، توندڕەوان و چاکسازیخوازان. بوار بۆ دیموکراسی بە چۆنیەتی هاوپەیمانیی نێوان ئەم بەش و تاقمگەلەوە بەندە. بۆ وێنە ئەگەر لە بەشی دژبەر، میانەڕەوەکان و لە بەشی پارێزەرانی دەوڵەت چاکسازیخوازان، مەیلی هاوکاری پێکەوە پەیدا بکەن, زەمینە بۆ هاوکاری خۆشتر دەبێ.

## ٨-٢. هەڵسەندگاندنی نیشانەکانی دیموکراسی

خوێندنەوەی رەوەندی دیموکراتیزاسیون پێویستی بە هەڵسەنگاندنی دیموکراسی, یان هەڵسەنگاندنی نیشانەکانی پێشکەوتنی دیموکراسی هەیە. نیشانەکانی دیموکراسی، ئاماژە بە دیموکراتیك بوونی حکوومەت و جێکەوتنی ماف و ئازادییە دیموکراتیکەکان دەکەن. رادەی دیموکراتیك بوونی حکوومەت، بە رادەی بەرپرسایەتیی کاربەدەستان و ئیمکانی بەشداری و کێبەرکێ لە ژیانی سیاسیدا بەندە. دیارە پێویستیی دیموکراتیك بوونی حکوومەت, بەم مانایە دابین کردنی ئازادییە مەدەنی و سیاسی و بە تایبەت ئازادیی ئەندیشە و بەیان و کۆبوونەوە دەگرێتەوە. دیاری کردنی رادەی پەرە سەندووی دیموکراسی بە پێی ئەم نیشانەگەلە، لە بەرژەوەندیی جیاوازەوە بۆیان روانیوە. لە هەندێ لە توێژینەوە

---

۱۸- گروه مخالف

سەرەتاییەکاندا وڵاتان یا بە تەواوی دیموکرات بوون یان نادیموکرات و نێوەنجییان نەبووە. لە خوێندنەوەکانی دواتردا لە سەر پلەکانی دیموکراتیزەبوون پێیان داگرت. ئیمتیازی ئەم خوێندنەوانە لەوە دایە کە کێشی سیستەمی سیاسی و رەوەندی دیموکراتیزە بوون لە بەرچاو دەگیرێ. دیموکراسیی سیاسی بە مانای سەرەوە رەنگە بە پلەی جۆراوجۆر و بگۆڕ لە سیستمگەلی سیاسیدا ببێت. رژێمێکی سیاسیی تایبەت، رەنگە هاوکات خاوەنی توخمگەلێك لە دەسەڵاتخوازی، ئۆلیگارشی و دیموکراتیك بێت. کە وابوو سەبارەت بە زۆر وڵات ناتوانین بڵێین سەد لە سەد دیموکراتیك یا نادیموکراتیکە، بەڵکو تێکەڵێیك لە توخمی رەنگاوڕەنگی تێدایە و بەردەوام پێویستە ئیمکانی گۆڕینی لە بەرچاو بگیرێ.

کە وابوو دەبێ شەبەنگێك لە بەرچاو بگیرێ کە سەرێکی لانی زۆری دیموکراسی و ئەو سەرەکەی لانی کەمی پیشان بدات و دواتر ئەزموونی وڵاتان بە پێی ئەو مەودایە پێوانە بکرێت. بەکار هێنانی ئەم رێگایە, خۆیندنەوەی بەراوردکاری لە نێوان سیستمە سیاسییەکاندا بە کەڵك وەرگرتن لە سیاهە و زانیاریی عەدەدی مسۆگەر دەکات. لە لایێکی ترەوە بۆ هەڵسەنگاندنی دیموکراسی پێوانەی عەینی و زەینی بە کار دێت. لە سەرەتای پەرەسەندنی زانستی نوێی سیاسی زیاتر پێوانەی زەینی بە کار دەهات, بەم مانایە کە نووسەران هەندێ تایبەتمەندیی گشتی «وەك ئازادیی چاپەمەنی، گرینگی راستەقینەی پارلەمان، پەیوەندیی هێزەکان و... هتد» یان وەك پێوانەکانی دیموکراسی لە بەر چاودەگرت و جەرهەری دیموکراتیکی وڵاتانیان بەو پێیە نیشانە دەکرد. لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەوە پێیان لە سەر پێوانە عەینیەکان وەك رادەی بەشداریی خەڵك لە هەڵبژاردن، رادەی کێبەرکێی ئیدئولۆژیك، چۆنیەتی پێکهاتەی پارلەمان، رادەی هەڵبژاردنی کاربەدەستانی سیاسی و... هتد دادەگرت.

کەڵك وەرگرتن لە نیشانە عەینییەکان، خوێندنەوەی مەودای دیموکراسی، یا هەڵسەنگاندنی دیموکراسی سانا کردەوە. بەم حاڵەیشەوە ڕەنگە نیشانە عەینییەکان سواو بن و ئیمکانی هەڵسەنگاندنی ڕاستەقینە بە دەستەوە نەدەن. حکومەت لەوانەیە ئامار و ڕەقەمەکانی هەڵبژاردن دەسکاری بکات. هەر وەها ئامار و سیاهەی تۆخ، ناتوانێ دەستێوەردانی ئیحتمالی پشتی هەڵبژاردن دەر بخات، هەندێ وڵات بۆ شەرعیەت بەخشین بە خۆیان لە ڕێگای جۆراوجۆرەوە خەڵکی بۆ نێوگۆڕەپانی هەڵبژاردن ڕاپێچ دەکەن. هەر وەها شێوەی بەر بژار بوونی تاکەکان بۆ هەڵبژاردن و ئاستەنگی ئیحتمالی, تەنیا لە ڕووی ئامارەوە هەستی پێ ناکرێت. کە وابوو ئامار و نیشانە عەینییەکان بە تەواوی ناتوانن پیشاندەری تەواوی جەوهەری سیستەمی سیاسی بن و بۆیە لە نیشانەکانی زەینی کە بە پێی داوەری و زانیاریی گشتییەوە وەچنگ دەکەوێت، بۆ وێنە وەك ڕادەی ئازادیی ڕاستەقینەی چاپەمەنی, یان ڕادەی سەرکوتی سیاسی، بۆ تەواو کردنی زانیاریی ئاماری کەڵکی لێ وەرگیرێ. بە گشتی پێوانەی وردتری دیموکراسی پێویستی بە کەڵك وەرگرتن لە هەر دوو نیشانەی عەینی و زەینی هەیە.

### ٨-٣. چاوەڕوانی داهاتوو

ئەمڕۆکە سیستەمی دیموکراسی زیاتر لە هەر کاتێکی تر لە ئاستی جیهانیدا پەرەی گرتووە. بەم حاڵەیشەوە دیموکراسی بەر هەڕەشە و مەترسیش کەوتووە کە جێگیر بوون و سەقامگیریی دەسکەوتەکانی دوا شەپۆلی دیموکراسی لەگەڵ ئاستەنگ ڕووبەڕوو کردووە. بە پێچەوانەی بۆچوونی هەندێ لە نووسەران، دیموکراسی تەنیا لە ڕێگای کەشاوی١٩ شەپۆلە دیموکراسییەکانی نێونەتەوەیی و دەور و کارتێکەریی نەهاد و دامەزراوە نێونەتەوەییەکانەوە جێگیر

---

١٩- سرایت

نابێ بەڵکو پێویستیی بە پێگەیشتنی هەل و مەرجی نێوخۆش هەیە. هزر و هێزە دژە دیموکراتییەکان لە نێوخۆدا زۆر جار لە بەرانبەر شەپۆلە جیهانییەکانی دیموکراسیدا رادەوەستن، دیارە دیموکراسی پێویستی بە هەل و مەرجی لە باری کۆمەڵایەتی و ئابووری و چاندی نێوخۆیی هەیە و سەرهەڵدانی ئەم هەل و مەرجەش تا رادەییێك بە هۆی تێکۆشانی دیموکراتییەوە دەست دەکەوێت. «جێگیر بوونی دیموکراسی پێویستی تایبەتی بە گۆڕانگاری بنەڕەتی و پەیوەندییەکانی دەسەڵاتی سوننەتی هەیە و روونە کە هێز و بایەخە کۆنەکان لە بەرانبەر ئەم گۆڕانەدا دەوەستن. کە وابوو بەرژەوەندی دیموکراسی لە هەموو جێگاییێکدا بە کردەوە و بژاری هێزەکانی کاربەدەست و تاقمەکانی بندەست پەیوەندی هەیە.»

شەرتی یەکەمی درێژەی دیموکراسی لێرە دایە کە هیچ تاقمێك جگە لە نوێنەرانی بەربژاری خەڵکی, مافی حکوومەت کردن و راوێژی نەبێت. کە وابوو سوڵتەی گشتی, یان رێژەیی، هەر یاریکەرێکی سیاسیی نابژاردە بۆ دیموکراسی, ئاستەنگی ئەساسی دروست دەکات. بۆیە دەسەڵات و دەسرۆیشتوویی سوپا لە سیاسەتدا و هەر وەها دەسرۆیشتوویی یاریکارانی دەرەوە لە حکوومەتە دیموکراتیکەکاندا, یان گروپی زەخت و رێکخراوەی نهێنی و رووشاڵ دیموکراسی دەزەخسێنێ. لە لاییێکی ترەوە جیهانیبوون، پەرەسەندنی پەیوەندییەکان، بە نێونەتەوەیی بوونی بازاڕ و سەرمایە، بزۆزی بەرچاوی سەرمایەی ماڵی و هەر هۆکارێکی دیکە کە هێزی راوێژی کاربەدەستانی سیاسیی بژاردە لە ئاستی وڵاتدا کەم بکاتەوە، کارامەیی دیموکراسی تەسك دەکاتەوە، بەم مانایە کە پەرەگرتنی وابەستەیی سیاسیی نێو نەتەوەیی بەمەترسی لە سەر دیموکراسی حیساب دەکرێ و سەربەخۆیی سیاسیی وڵاتان کەم دەکاتەوە. زۆر لە نووسەران بەهێزبوونەوەی رەوەندی بە جیهانیبوونیان، وەك پەیا بوون و پەرەگرتنی نەهادە سیاسییەکانی

جیهانی، زۆر بوونی گرینگایەتی مافی نێونەتەوەیی و سازمانی نێونەتەوەیی و پەرەگرتن و هێز و دەسرۆیشتنی دامەزراوە بان نەتەوەیی مالّی و پیشەسازی، بە مەترسی لە سەر دیموکراسیی دەولّەتی نەتەوەیی دادەنێن. کارتێکردنی رەوەندە جیهانییەکان لە سەرکز بوونی دەسەلاّت و خودموختاریی دەولّەتی نەتەوەیی لە لایێك بە مانای لاوازبوونی هێزی دەولّەت لە کاروباری نێوخۆیی خۆی دایە و لە لایێکی ترەوە سپاردنی دەسەلاّتی راوێژ لە زۆر بواردا بە بازارِ مالّی و پولّی و کۆمپانی و بانکە جیهانییەکانە. کە ئەمەش لە روانگەی دیموکراسییەوە, هێزی نوێنەرایەتیی خەلّك لە راوێژ کردندا تووشی ئاستەنگی بەرچاو دەکات. مەبەست لە جیهانیبوون کۆمەلّێك رەوەندی تکنیکی، ئابووری، سیاسی و چاندیە کە لە کۆتایی دەیەکانی بیستەوە تا ئێستە درێژەی هەیە. گۆرِانگاریی تکنیکی, بریتی لە گۆرِانگاری لە تکنیکی زانیاری و پەیوەندییەکان، پەرەسەندنی تۆرِی کامپیۆتری، پەرەگرتنی تکنۆلۆژیی پەیوەندییە بازرگانی و مالییەکان، گۆرِانکاری لە تکنۆلۆژیی مانگە دەستکردەکان، دەرکەوتنی راگەیێنەری نویّ و... هتد کە هەموویان پێکەوە بوونەتە هۆی کەمبوونەوەی مەوداکان و چکۆلە بوونەوەی جیهان. هەر بەم پێیە هەندێ لە نووسەران باسیان لە «دێی جیهانی» کردووە. ئەم گۆرِانگارییە تکنیکانە ئالّ و گۆرِی بەرچاویان لە ئابووری، بازرگانی و مالّیەی نێونەتەوەییدا پێکهێناوە و نوێنەرایەتییەکانی ئابووریی نێونەتەوەیی لە بازارِی جیهانی, هێزێکی بەرچاویان وەدەست هێناوە. بووجەی زۆر لەم نوێنەرایەتیانە [20] لە هەر دەولّەتێکی نەتەوەیی زیاترە. ئەم نوێنەرایەتییانە «بێ دەولّەتن»، واتە بە هیچ دەولّەت و نەتەوەیێکی دیاریکراو بەسراوەیی یاسایی و سیاسییان نییە و هەموو جیهان وەك بازارِی خۆیان دەبینن. سەر هەلّدانی ئەم سازیانە دەبێتە هۆی نەبینین و کەمرِەنگ بوونەوەی سنووری نێوان ولاّتان. هەر وەها دامەزراوەی

---

٢٠- بنگاه

ئابووری و سیاسیی نێونەتەوەیی کە لە سەر دەوڵەتان راوێژ دەکەن، پەرەیان سەندووە. سندووقی نێونەتەوەیی پوول، لێبووردنی نێونەتەوەیی، بانکی جیهانی و نەتەوە یەکگرتووەکان وەك یاریچی سەربەخۆی سیاسی لە ئاستی جیهاندا دەرکەوتوونە.

سەرهەڵدانی هەندێ دۆزی جیهانگیری وەك ژینگە، حەشیمەت، لەشساخی کە تەنیا لە ئاستی جیهانیدا بۆ لێ وردبوونەوە دەبن، یارمەتی بە سەرهەڵدانی ئەو سازمانە جیهانییانە کردووە.

وەك ئاماژەمان پێکرد، کارتێکەریی رەوەندی جیهانی بوون لە سەر دەسەڵاتی دەوڵەتان لە بەر دیموکراسی خرایە بەر باسەوە. لەم روانگەیەوە دەوڵەتە نەتەوەییەکان زۆر لایەنی دەسەڵاتی خۆیان لەراوێژ لە سەر دۆزە گرینگەکانی وڵاتی خۆیان لە کیس ئەدەن، بەم حاڵەیشەوە ئەم کارتێکردنە لە ناوچەی جۆربەجۆری جیهاندا چوون یەك نەبووە. لاواز بوونی دەسەڵاتی نەتەوەیی لە رەوەندی جیهانی بووندا تەنیا لایەنی یاسایی و رواڵەتی نییە، بەڵکو بە کردەوە توانایی دەوڵەتە نەتەوەییەکان کەم دەکاتەوە. تەنانەت لە نێوان دەسەڵاتی رەسمی و رواڵەتی دەوڵەت و راستی کەمکردنەوەی دەسەڵاتی دەوڵەت لە لایەن هێزی جیهانیبوونەوە، ناتەبایی هەیە. بۆ وێنە بە نێونەتەوەیی بوونی رەوەندی ئابووری بە کردەوە لەگەڵ توانایی دەوڵەت لە کاروباری ئابووریدا ناتەبایە. دەسەڵات و خودموختاریی زۆر وڵات کە خەریکی گەشەسەندن لە ژێر کارتێکەریی بەرنامەگەلی هاوسەنگی بنەڕەتی سندووقی نێونەتەوەیی پوول لەم ساڵانەدا تووشی کزی بووە و لە کورتی داوە، یەکیەتی ئەورووپا, دەسەڵاتی دەوڵەتانی ئەندامی خۆیشی هەم لە باری یاسادانانی نێوخۆیی و هەم لە باری پەیوەندیی دەرەوە تەسك کردوەتەوە. هەنووکە راوێژی قورسی ئابووری لە کمیسیۆنی ئەورووپادا دەگیرێ، هەر وەها دەوری بلۆکگەلی هێزی ناوچەیی وەك رێکخراوی پەیمانی ئەتلانتیکی باکووری دوای

شـەڕی سـارد، پڕڕەنگتـر بوەتـەوە. سـپاردنی کـەم تـا زۆری تایبـەتکاریی دەوڵـەتی نەتـەوەیی بـۆ بەشـی تایبـەتی, یـان بـۆ ڕێکخـراو و دامـەزراوەی ناوچـەیی، سـنووری دەسـەڵات و حاکمیـەتی دەوڵـەتانی تەسـك کردوەتـەوە. هـەوڵی هەنـدێ وڵات بـۆ پەرەپێدانی هاوکـاری ناوچـەیی، لـە خۆیـدا دژ کردەوەیـە بـە ڕەوەنـدی جیهـانیی بـوون و لاواز بـوونی دەسـەڵاتی دەوڵـەتی نەتـەوەیی کـە ئەمـەش بـە هـۆی کارتێکـەریی بـە جیهانیبوونـەوە رووی داوە. لەگـەڵ پەرەسـەندنی ئـەم جـۆرە کارتێکردنانـە مەسـەلەی بنـەڕەتی دیـموکراسی، یـەعنی وەرگـرتنی ڕەزامەنـدی خـەڵك لـە لایـان راوێـژیی حکوومەتـەوە تووشـی ئـاڵۆزی دەبـێ. چـونکە دەوڵـەتی نەتـەوەیی ناچـارە تێبـینی سیسـتەمی نێونەتـەوەیی و جیهـانی لـە سـنوورە جۆراوجۆرەکانـدا لـە بەرچـاو بگـرێ. هاووڵاتی بـە مانـا کۆنەکـەی ناوەنـدی «حاکمییـەت» نییـە. لـە چـاخی جیهانیبوونـدا, دەوڵـەتی نەتـەوەیی زیـاتر لـەوەی لـە ژێـر دەنـگ و بۆچـوونی خەڵکـدا بـێ, لـە ژێـر کارتێکـەریی هۆکـارە جیهانیـەکان دایـە. سیاسـەتی هاوسـەنگی سـاختاری وەك ئاژەمـان پێـی دا، نـمونەیێکی زەق لـەم بـوارە دا بـوو. هـەل و مـەرج و چوارچـێوەی ئابووریی جیهانی بەم جـۆرە توانـایی دەوڵـەتی نەتـەوەیی لـە هەڵوێسـتی جیـاوازدا کـەم دەکاتـەوە. لـە لاییێکـی تـرەوە لەگـەڵ پەرەسـەندنی پەیوەندییـە فەرهـەنگی و نێونەتەوەییەکان بەشێکی زۆر لـە ژیـانی خـەڵك لـە چاوەدێریی حکوومـەتی نەتـەوەیی وەدەرهـاتووە. هـەر وەهـا شـەڕ و قـەیرانی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی مەترسـی بـۆ دیـموکراسی دروسـت دەکـەن. هەسـتی نـەتوانینی دەوڵـەت لـە بەرانبـەر قـەیران و کۆنتـرۆڵی ئاوسـان و بێکـاری, یـان کۆتـایی هێنـان بـە شـەڕی نێوخـۆیی و دەرەوەیـی، پێویسـتەی ئـەوە نییـە کـە هـەلی باشـتر بـۆ بەشـدرایی ئـەحزاب و گروپـەکانی دژی دەوڵەت دەڕەخسـێنێ. لـە هـەل و مـەرجێکی ئـەوتۆدا، هـیچ هێزیکـی سیاسـی توانـایی ئەوەی نییـە کـە قەیرانـەکان یـەك لایـی بکاتـەوە و لـە ئاکامـدا کەرەسـەی بەشـداری و رکەبـەریی دیـموکراتیك کـەم دەبێتـەوە. بـە پێچـەوانەوە لـە دۆخـی قەیرانـدا زۆر جـارە

زەمینــە بــۆ ســەر هەڵــدانی گروپــی پەڕگیــری توودەخــواز لــە بــار دەبــێ. ئەگــەر دیــموكراسییەكان نــەتوانن قەیرانــەكان حــەل بكــەن زۆر جــار خــەڵكی سەرەنــجیان بــۆ لای گروپی پەڕگیـر رادەكێشرێ.

حكوومەتگــەلی نادیــــموكراتیك بــریتی لــە ســەربازی، فاشیســتی، توتالیتــــار و... هتــد بــە گشــتی لــە هــەل و مــەرجی قــەیرانی ئــابووری، كۆمەڵایــەتی و فەرهــەنگی كەرەســەی ســەركەوتن وەدەســت دەهێــنن. یــەكێك لــەو مەترســییە گەورانــەی كــە لــە سەدەی بیســتەمدا رووبــەڕووی دیــموكراسی بــوەوە، هەســتی ئــایین بــۆ دەسـت تێــوەردان لە ژیانی سیاسـی دابـوو. زاڵ بـوونی كۆمەڵایـەتی و سیاسـیی ئایيــن لـەو شـێوەی كـە رۆحیــەی ناساناگیــــریی٢١ پــەرە پــێ دەدا، ســەرهەڵدانی بایەخــە دیــــموكراتیكەكان كــەمرەنگ دەكاتــەوە. بــە گشــتی دەســت تێــوەردانی بــەربڵاوی دیــن لــە سیاســەتدا، لەمپــەرێكی گــەورە لــە بەرانبــەر دیــــموكراسی و بایەخەكانیــدا دروســت ئــەكات. دیـموكراسی بە جەوهـەر، پێویسـتی بـە جیابوونـەوەی دەسـەڵاتی سیاسـی لـە ئـایینی و سنووری عورفــی لــە ســنووری ئایینیــە. لــە حاڵەتێكــدا ئەگــەر قــانوونی خــوایی لــە هــەموو ســنوورەكاندا حــاكم بــێ، ئیتــر جێگاییــك بــۆ یاســادانان و هاوبیــــری و كێبــەركێ نامێنێتــەوە. حكوومــەتی دیــنی لــە ئەساســدا ناســاناخوازە و دەنــگ و بیــری گشتیی خەڵك بە مەترسی لـە سـەر سـنووری پـیرۆزی دیـن حیسـاب دەكـات. سـەرەڕای ئەمانە لە حكوومـەتی دینیـدا، لـە سـەر جیـاوازی نێـوان ئیمانـدار و نائیمانـدار پێـدا دەگیرێ، لـە حاڵێكـدا كـە دیــموكراسی نـاتوانێ جیـاوازی ئـەوتۆ قـەبووڵ بكـات. هـەر ئـەم جیاوازییـە دەبێتـە هـۆی ئـەوەی كـە مـافـی یەكسـان بـۆ هـەموو هاووڵاتیـان لـە بەرچـاو نەگیــرێ و ئاكــامی ئەمــە شــتگەلێكی وەك نــامۆ، خۆمانــە و هــاووڵاتی پلــە دوو، كـە ئەمـەش نـاتوانێ بـە بەشـێك لـە كۆمـەڵی هاووڵاتیـان بـە حیسـاب بێـت. یــەكێك لــەو مەترســییە گەورانــەی كــە لــە ســەدەی بیســتەمدا لــە دیــــموكراسی

---

٢١- عدم تساهل

وەدەرکەوت، بونیادخوازیی ئایینی بوو. بونیادخوازی، بە سیاسی کردنی ئایینە، وەك ئایدیۆلۆژیایی حکوومەتی ئایینی لە بەرانبەر حکوومەتی دنیایی و نائایینیدا. بونیادخوازی لە ئایینی جۆراوجۆردا بە تایبەت لە مەسیحییەت، یەهودییەت، ئیسلام و ئایینی هندوودا سەری هەڵداوە. بونیادخوازی (الاصولیە — Fundamentalism) لە هەموو جێگاییێکدا بایەخگەل و ئیعتباری گشتیی پرەنسیپەکانی دیموکراسی و لیبرالیزمی رۆژئاوایی بە پووچ داناوە و دژی فرەخوازی ئەرزشی و ساناخوازیی بیروباوەڕە. بونیاخوازان نەك تەنیا لەگەڵ دیموکراسیدا بەڵکو لەگەڵ نوێخوازیی رۆژئاوایی بە گشتی دوژمنن و لە سۆرخی ئەوەدان کە شێوەژیانێکی نوێ لە جێی ژیانی دیموکراتیك دابنێ.

ئەوان لە باتی ئازادی، تاکخوازی، بەرابەری، ماف و حاکمیەتی خەڵك لە دەسەڵاتی دامەزراوەی سوونەتی و ئایینی، سەرتری ئیمانداران بە سەر نائیمانداراندا و حاکمییەتی خواوەند و یاساگەلی ئیلاهی و ئەرکەکانی خەڵك لە بەرانبەریاندا، دیفاع دەکات.

بە بۆچوونی بونیادخوازان, بنیادی دەوڵەتی نەتەوەییش کەرەسەییێکە بۆ جێگیرکردنی دیموکراسی و دەسەڵاتی خەڵك لە بەرانبەر دەسەڵاتی خواوەند و هەر بۆیە پێویستە لە ناو بچێت. بەم شێوە بونیادخوازی, دوژمنی دیموکراسی و خۆی بە تێپەڕبوو لە دیموکراسی دەزانێ. بونیادخوازی, ئایدیۆلۆژیای سیاسیی تئوکراسیە و لەم بارەیشەوە دیارە لەگەڵ ئایدیۆلۆژیایی دیموکراسی, یەعنی لیبرالیزم بە شەڕ دێ.

لە کۆتاییدا ئەمەش کە ئاڵۆز بوونی ساختاری دەوڵەت، لە دیموکراسییەکاندا خۆی مەترسییەکە بۆ سەر دیموکراسی. زیاد بوونی تایبەتکارییەکانی رێکخراوە حکوومەتییەکان هۆی ئاڵۆزیی زۆری حکوومەتگەلی دیموکراتیك بووە و لە ئاکامدا ئەم پرسیارە سەری هەڵداوە کە ئایا ئیمکانی

بەشداریی راستەقینەی هاوولاتیان لە رەوەندی سیاسەتدانانەدا لەم هەل و مەرجەدا هێشتا جێگای هەیە. ئایا خەڵکی عادی لە دۆزە زانستی و تکنیکە ئالۆزەکان کە لە رەوەندی راوێژ کردندا دێنە بەر باس، شتێکیان لێ حاڵییە؟ لێرەدا ئالۆزیی دەوڵەت هەم لە باری رێکخراوەیی و هەم لە باری کردەوەوە مەبەستمانە, لەگەڵ پەرەگرتن و زۆر بوونی تایبەتکارییەکان، دیارە رێکخراوەو نەهادی بەسراوە بە حکوومەتیش زیاد ئەبن. ئیتر دەوڵەتگەل کاریان تەنیا بەسراوە بە دابین کردنی رێك و پێکی و ئاسایش و چاوەدێریی کاروباری شەڕ و ئاشتی نییە. بەڵکو کاری خۆش گوزەرانی، زانستی، توێژینەوە و گەشەسەندن، بەرنامە داڕشتن، لەشساخی و... هتد. یەکێك لەو دۆزانە کە پەیوەستە بە زیاد بوونی ئالۆزیی دەوڵەتەوە، ناسینەوەی سنووری دەوڵەتە لە سنووری تایبەتی. زۆر رێکخراوەی دەوڵەتی تایبەتکاری, بەشی تایبەتی ئەنجام ئەدەن. لەگەڵ تێکەڵ بوونی سنووری گشتی و تایبەتی، بەرپرسایەتیی هێزی بەڕێوەبەر لە بەرانبەر هێزی یاسادانانەدا ئەکەوێتە بەرپرسیارەوە. ئاکامێکی ئەم دۆخە پەرەسەندنی پەیوەندیی نارەسمی نێوان کۆمیتە و نەهادە یاسایی و بەڕێوەبەرییەکان لەگەڵ گروپگەلی دەست رۆیشتوو[٢٢] خاوەن بەرژەوەندی. پەیوەندیی ئەوتۆ زۆر جار لە بەرچاوی بیروڕای گشتی بزرە و ئەمەش بەرپرسایەتیی دەوڵەت کەم دەکاتەوە. زۆر سیاسەتی گشتیی دیموکراسییەکانی ئەمڕۆ لەم پەیوەندیانەوە سەرچاوە ئەگرن، بەم شێوەیە دەوڵەت لە پەنای لایەنی دیموکراتیك و گشتی، لایەنی تایبەتی و شاراوەش بە خۆوە دەگرێ. یەکێك لە ئاکامەکانی ئەم جۆرە پەیوەندیگەلە لاواز بوونی هێزی یاسادانانە. لەگەڵ زۆربوونی ئالۆزیی دۆزەکان، دەوری دەستەی حکومەت لە راوێژ کردندا زیاتر رواڵەتی دەبێت. هەر بەم ئاراستەیەش خەڵکی عادی و ناپسپۆڕ کەمتر دەتوانن رای خۆیان بەرانبەر راوێژەکان دەرببڕن.

---

٢٢- گروە ذینفوذ

**لەگەڵ زۆر بوونی ئاڵۆزی، ڕێکخراوە دەوڵەتییەکان بە شێوەیێکی کۆنترۆڵ نەکراو زیاد ئەکەن و زۆر ئەبن، بە بێ ئەوەی کارمەیی ئەوان زیاد بکات. لە سەر یەك زۆر بوونی ئاڵۆزی لەمپەرگەلێك بۆ بەشداریی گشتی و بەرپرسایەتیی حکوومەت دروست دەکات.**

**تەواو**

## ئیندێکسی ناوەکان